وەرگێڕاوی کوردی

# گولستانی سەعدی

لەگەڵ دەقی نوسخە فارسیەکەیدا

دانراوی: شیخ مصلح الدین سعدی شیرازی

وەرگێڕاوی

ماموستا مەلا موستەفا رەسوول (سەفوەت)

وەرگێڕاوی کوردی

# گولستانی سەعدی

## لەگەڵ دەقی نوسخە فارسیەکەیدا


دانراوی: شێخ مصلح‌الدین سعدی شیرازی

وەرگێڕاوی: مصطفی رسول (صفوت)



بلاوکردنەوی کوردستان

سنه ـ ١٣٨٤

# گولستانی سەعدی


| | |
|---|---|
| ✔ ناوی کتێب (نام کتاب): | گولستانی سەعدی |
| ✔ دانراوی (تألیف): | شیخ مصلح‌الدین سعدی شیرازی |
| ✔ وەرگێڕاوی (ترجمە): | مصطفی رسول (صفوت) |
| ✔ پیاچوونەوەو شیعری ژێر نووس: | عمر صالحی صاحب |
| ✔ پیاچوونەوەو بەرامبەری لەگەڵ دەقی نوسخە فارسیەکاندا: | عبدالستار نقشبندی |
| ✔ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول): ۱۳۸۴ |
| ✔ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۵۰۰۰ دانە (جلد) |
| ✔ ژمارەی لاپەڕەو قوارە (تعداد صفحە و قطع): | ۴۰۸ صفحەی وزیری |
| ✔ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |



**انتشارات کردستان**

سنندج، پاساژ عزتی ☎ ۲۲۶۵۳۸۲



| شابک: ۹۶۴ـ۷۶۳۸ـ۳۷ـX<br>ISBN: 964 - 7638 - 37 - x | نرخی:<br>۳۶۰۰ تمەنە |
|---|---|

**نامەی پرۆفیسۆر عیزەدین موستەفا کوڕی خوا لێ خۆش بوو، مامۆستا سەفوەت کە ئیجازەی بە بڵاوکردنەوەی کوردستان داوە کە کتێبەکەی باوکی لە چاپ بدەن**

برایانی بەڕێز لە ئینیشاراتی کوردستان سنە

برامان جەنابی مەلا ڕەحیمی مەحموودی؛

زۆر شادمانم کە برایان ڕەئووف غەفوور مەحموود و جەنابتان دەتانەوێ ئەو وەرگێڕانی «گولستان»ە چاپ بکەنەوە کە خوا لێ خۆشبووی باوکم «مەلا مستەفای سەفوەت»ی حاجی مەلا ڕەسووڵ وەری گێڕاوە. کاتی خۆی کاک ناجی ئەحمەدی داوای ڕێگە پێدانی چاپ کردنەوەی کرد. ڕێگەم پێدا، بەڵام داوام کرد کە نیشانەی ( ٧ ) لە سەر تیپەکوردیەکان دانێت، چونکە لە چاپی یەکەمدا بە هۆی نەبوونی ئەو ئیشارەتەوە بێ ( ٧ ) لە سەر تیپی وەک «ل، و،» یا ژێر « ر » وە چاپ کرا.

تکام وایە ئەم چاپە بەو جۆرە ببینم.

سڵاوی گرمم و سوپاستان دەکەم

٢٠٠٤/١١/٢٠

براتان عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

# سەرەتای وەرگێڕ

سوپاس و ستایش بۆ ئەو پەروەردگارەی کە سەرداری پێغەمبەرانی بە بەرزترین پایەی ئەدەب بەهێز کرد، بە هۆی ئەو قورائانەوە کە ئەگەر هەموو کۆمەڵی ئادەمیزاد و جنۆکە کۆببنەوە ناتوانن قورائانێکی لەو جۆرە بەو شێوەیە بخەنە ڕوو

﴿قُلْ لَوِ اجْتَمَعَتِ الْجِنُّ وَ الْاِنْسُ عَلَى أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هٰذَا الْقُرآنِ لاٰ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَ لَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً﴾

ئەو ئەدەبەی کە تەنیا لە وتاری کردگارا خۆی نیشان ئەداو، هەموو بوێژان و نووسەرانی ڕووی زەمین بە شانازیەوە،گەردن کەچ، پڕتەوی وێڵ و شێوەی نووسینی لێوە فێر ئەبن.

دروودو سەلامی بێ‌پایان بۆ گیانی پاکی خاوێنی بێ گەردی هەموو پێشەوایانی ئایین، بە تایبەتی سەروەری ئەدیبان (محمد)ی کوڕی (عبدالله) کە فەرموویەتی: «**أَدَّبَنِي رَبِّي فَأَحْسَنَ تَأْدِيبِي**» وە بۆ یارانی و هەموو ئەوانەی پەیڕەوی ئەکەن تا ئەم گومەزەی شینە بە سەر ئەم زەمینە سەوزو ڕەنگینەوەیەو مانگ و ڕۆژ ئەتریفێتەوە.

ئەنجا ئەی ئەدیبانی کورد لە بوێژو نووسەران، وە ئەی خوێندەوارانی هاوزمانم! لە منالیمەوە کە لە قوتابخانە، پاش خوێندنی **قورئانو ئیسماعیل‌نامە** دەستم بە خوێندنی «گوڵستان» کرد، وە بۆ جاری دووەم بە مەعناخوێندم، لە دەروونمەوە هەستم ئەکرد کە زیاد لە هەموو خوێندنێك هەواخواهیم لە گەڵیا هەیە، تاڕادەیەك ئەتوانم بڵێم چیم لێ خوێندبوو، شیعرەکانم هەموو لە بەر بوو. دێتە یادم کاتی شەڕی یەکەمی جیهانی بوو

نزیکەی ٤٣ ساڵ پێش ئەمڕۆ[١]، مەلاکانی ئەو دەمە -ڕەحمەتی خوایان لێ بێ- چووبوون بۆ سەیران بۆ «کارێزی حاجی مەلا عەلی» ئەوانەیان لە یادمن «شێخ بابە عەلی»و «مەلا حسەینی پیسکەندی»و «مەلا عبدالعزیزی مفتی»و «حاجی مەلا ڕەسوڵ»ی باوکمن. «مەلا حەمدون»ی حافزی کوێری بلیمەتیش لەوێ بوو، بە باوکمی وت: «ئا مستەفام بۆ بانگکە هەرباسی ئەکەیت». باوکم بانگی کردم. حەمدوون وتی: «شەڕە شیعر ناکەی؟» وتم: «با». نەم ئەزانی حەمدوون کێیەو شەڕە شیعر چییە. (شەڕە شیعر ئەوەیە کەسێك شیعرێك ئەخوێنێتەوە، دوا تیپی شیعرە کە چی بێ، ئەو کەسەکەی‌تر شیعرێك ئەخوێنێتەوە تیپی یەکەمی ئەو تیپە بێ شیعرەکەی ئەوی پێشووی پێ دوایی هاتووە). دەس پێ کردنی شەڕە شیعر بەم جۆرەیە: یەکێك ئەڵێ: بێ وەنەستەعین «بە نستعین» ئەوی‌تر ئەڵێ: نەستەعین بە فلانە تیپ. با بڵێین (ح). ئەوی‌کەش شیعرێکی وەك ئەم شیعرە ئەڵێ:[٢]

حەتم سزای لە دۆزەخ نییە، بە عەکسی ئەو

بەهەشتە جێم‌و ئەسووتێم لە دووری ئەو لەیلە

دوا پیتی ئەم شیعرە (هـ) یە. لە بەر ئەوەی ئەوی‌تر بە شیعریکی وەك ئەم شیعرەی بنەوە وەرامی ئەداتەوە:

هاتە گوێم دەنگێ بەزاری‌و شیوەن‌و ئەفغانەوە

وابزانم شیوەنە کەوتۆتە کوردستانەوە

بەم جۆرە تا یەکێکیان لە شیعر خوێندنەوە ئەکەوێ‌و بۆڕ ئەخوا.

سێ چارەك سەعات لەگەڵ «حەمدوون» ڕۆیشتم، جا پەکی خستم. مەلا حسەین وتی: «حەمدوون هیچ هونەر نەبوو». وتی: «بۆچ؟» وتی: «تۆ خۆت کوتوو پڕ شیعر ئەڵێیت لە تیپە گرانەکانا وەك (پ)و (ژ)و (ث)و (گ). ئەو مناڵە ناتوانێ شیعر بڵێ، چی لەبەرە ئەوە ئەخوێنێتەوە». حەمدوون وتی: «وایە. حاجی مەلا ئاگاداری ئەم کوڕە بە!». مەبەستم لەم

---

(١) مامۆستا لە ساڵی ١٩٦١ زاینی ئەم قسەی کردووە، -«ك».

(٢) لە ناو مەلا و فەقێکانی ئێرانا ئەیانوت: قولو و رفیق «قل یارفیق»، ئەوی دی ئەیوت: وە بێ تەوفیق «و بە التوفیق» قافم بۆ بێنەوە.

چیرۆکە ئەوەبوو هەر لە منالیمەوە شەیدای **گوڵستانی سەعدی** بووم، لەبەر خۆمەوە شیعرمدا ئەنا، هەرچەند لە بازاڕی شاعیرو بوێژانا نرخی نەبوو. هەر بەو هەستەوە کە وتارێکی ڕێك‌و پێك یا چەند هۆنراوەیەك کە پیشەسازیی هۆنراوەی تیابوایە، لە هۆنراوەی ڕابردوان ئیتر غەزەل، یا قەسیدە، حەز لێ کردن‌و جوانی، یا لە تەسەووفا، ئەخوێنرایەوە، هەموو لەشم ئەهاتە هەڵپەرکێ لە خۆشی‌یانا، ئارەزووم ئەکرد منیش وەك ئەوە بڵێم‌و پێی نەئەگەیشتم. جارێك بیستم کە «سەعدی» لەسەرشیعرێك خەڵاتێکی قورسیان داوەتێ. شیعرە کە ئەمەیە:

برگ درختان سبز در نظر هوشیار    هر ورقش دفتریست معرفت کردگار

ئەم شیعرەم زۆر لا جوان بوو، لەو وێنەیە بەو منالی‌یە وتم:

بـرگ درختان زرد در نظر اهل درد    هر ورقش دفتریست معرفت ذات فرد

باوکم، براکانمی بانگ کرد، بە شانازی‌و شادمانییەوە بۆی بەیان کردن. چین هەست‌و هۆشی خۆشەویستیی شیعرم زیاد ئەبوو. هەتا بە یەکجار خوێندنەوە، دوو شیعرم ئەهاتە بەر، وە لە بیستنی شیعرێکی جوان یا وتارێکی ڕێك‌و پێك لەشم لەرزەی تێ ئەکەوت. تێ ناگەم کەسێ هەست‌و شوعووری هەبێ چۆن دڵی نایەتە لەرزەو هەڵپەرکێ بەم شیعرەی «نالی»یە کە ئەڵێ:

لە خەوفی تەلعەتت ڕۆژ هەروەکوو شێت    بە ڕوو زەردی هەڵات‌و کەوتە کێوان

بە ڕاستی لە شیعری فارسیدا بە شیعری «کەلیمی هەمەدانی» وە لە شیعری پیاوە گەورەکانا بە هی «عبدالقادر گەیلانی» ئەکەومە جووڵەو کارم تێ ئەکەن. بە شیعری یەکەمیان لەشم ئەکەوێتە جووڵەوە، بە هی دوەم چاوم پڕ ئەبێ لە گریان. زۆرم کۆشش کرد بۆ ئەوەی لە دیوانی ئەدیبانا بچمە ڕیز، یا هیچ نەبێ لە قوژبنێکی دیوانەکەیانا جێم بێتەوە، بەڵام دەسم نەکەوت.

**ما كُلُّ ما يَتَمَنَّى الْمَرْءُ يُدْرِكُهُ    تَجْرِي الرِّياحُ بِما لا تَشْتَهِي السُّفُنُ**

زۆرم هەوڵدا هەتا دوو بەرگ فوتووحاتی یارانی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ)م هۆنییەوە لە نزیکەی ٤٥ هەزار شیعردا، وە **قەسیدەی بوردیەم** شیعر بە شیعر وەرگێڕایە

سەر شیعری کوردی،و چیرۆکی میعراجم هۆنیەوە، وە نامەیەکم هۆنیەوە لە ڕەوشتو ژیانی پێغەمبەرو جانشینانیا، وە نامەیەك لە ئەدەبو ئامۆژگاری یا بە ناوی «هەشت بەهەشت» کە شتێکی زۆر جوانو بەکەڵکە... هەندێ شتی تریشم پێکەوەنا هەر بەو هیوایە، بەڵام بۆم نەچوە سەر. نەشم ئەتوانی بە جارێ وازیان لێ بێنم، چونکە «**الأرواحُ جُنُودٌ مُجَنَّدةٌ، ما تَعارفَ مِنها أُئتَلَفَ،و ما تَناكَرَ مِنها اختَلفَ**».

ناچار دەستم ئاڵاندە داوێنی دوو پیاوی گەورە چونکە «**المَرْءُ مَعَ مَنْ اَحَبَّ**». یەکەم «عبدالقادری گەیلانی» ـ خوا لە پیرۆزی ئەو بزرگوارە بێ بەشمان نەفەرموێت ـ دیوانە فارسییەکەی لە زووەوە لە ناو پیاوەگەورەکانی ئایینا پایەیەکی بەرزو پیرۆزی هەیەو هەر غەزەلێکی بۆ گەیشتن بە ئامانجێ ئەخوێنرێتەوە، هاتم کردم بە کوردی، شیعر بە شیعر وەرم گێڕا. وا ئەزانم هەر لە هیممەتی خۆیەوە بوو، ئەگینا لە کاتێکی کورتا وەرگێڕانی دیوانێك بە شیعر شتێکی ئاسان نییە. بەڕاستی لەوکاتەدا نەخۆشیش بووم هەم شیفام پێ وەرگرت، هەم یادگارێکم پێ بەجێ هێشت. بۆ نموونە ئەمە یەکەم غەزەلیەتی:

لە دەردا بێ بەبێ پەردە وەرە کاشانەیی ئێمە
کەسی تێدا نییە وبردت نەبێ خۆ خانەیی ئێمە
ئەگەر تەشریفت بێتە سەر گڵی وێرانەیی ئێمە
ئەبینی نوقمی خوێناوی جگەر بوو خانەیی ئێمە
مەئاڵۆزێنە مووی موشکین، نە ئاڵۆزێنی تا ئاشووب
نییە توانای زنجیری دڵی دێوانەیی ئێمە
مەلێکی باغەکەی باڵامو کەوتووی دەیری وێرانە
کە نووری جیلوەیی باری ئەبێتە دانەیی ئێمە
لە ژێر گۆڕیچەیی تەنگا بە یەکتای خۆم ئەڵێم: «یارەب!
ئەتۆی هەر ئاشنامان، تۆ نەبێ، بێگانەیی ئێمە»[1]

---

(١) فارسییەکەی ئاوایە: «...آشنایم تویی غیر تو بیگانهٔ ما» (بروانە: کتاب پیر گیلانی (ر.خ) لاپەرەی ٦٠). بەم جۆرەش تەرجەمە ئەبێتەوە: «ئەتۆی هەر ئاشنامان، غەیری تۆ بێگانەیی ئێمە»، ـ ع.

**نەکیر** گەر بێت بپرسێ لێم، بڵێ «کێیە خودایی[1] تۆ»
ئـــەڵێم: «یـــارێ ڕفـــاندی وا دڵی دێوانـــەیی ئـــێمـــە»
بـڵێ بـەو مـونکیرەی ئـەیکا لە سـەرمان گـریەو هـاوار:
«هەتا مەحشەر لە گوێ دێت گرمەیی مەستانەیی ئێمە»
ســوپاسی حــەق نــەمردین تـا گـەیشتین بـەو دلارامـە
هــەزاران ئـافەرین بــۆ هــیممەتی مــەردانـەیی ئـێمـە
لە بەر شەوقی جەماڵی ئەو ئەسووتا «موحیی»و دولبـەر
کە ئەیوت: سەیرە سەیری هیممەتی مەردانـەیی ئـێمـە

دوای ئەوە ویستم بە هۆی **گوڵستانی سەعدی** یەوە لە بـاغی ئـەنجومەنی ئـەدیبان چەپکە گوڵێ یا گوڵێ بچنم، یا هیچ نەبی بۆنی ئەو گوڵستانە بچێ بە لووتما، گیانی پێ تازە بێتەوە. ئەو **گوڵستانە**ی کە هەر خۆی توانیویە ستایشی بکا کە گوتوویەتی:

رۆژی گوڵ چندە، پێنجە یا خۆ شـەش ئـەم گـوڵســتانە هـەر ئـەمێنـێ گـەش

ئەو **گوڵستانە**ی بە **ئەلمانی**و **فەڕەنسی**و **ئینگلیزی**و زۆر لە زمـانە بێگـانەکـانی‌تر تەرجەمە کراوە، منیش تەرجەمەی ئەکەم بـە **کـوردی** تـا بـرایـانی هـاوزمانی کـوردم لە سەیرانی ئەم **گوڵستانە** بێ‌بەش نەبن، بەتایبەتی کە لە سەردەمی داگیرکردنی **عێراق** لە لایەن **بەریتانیا**و، پێکهاتنی حکومەتی عێراقەوە لە **کوردستانی عـێراقـا**، خـوێنـدنی فارسی باوی نەماوە. لە کاتی خەریك بوونما بە وەرگێڕانی گوڵستانەوە «عزالدین»ی کوڕم گوڵستانێکی لە مۆسکۆوە بۆ ناردم کە تەرجەمەیەکی بە زمانی ڕووسی لەگەڵا بوو. ئەو تەرجەمەیە هی «ڕۆستەم مووسا عەلی یێف» بوو. ئەو گوڵستانەی چاپی سۆڤـیەت زۆر شتی وای تیابوو لەو نوسخانەدا نین کە بە دەسمانەوەن. هەروەها **عزالدین** بۆی نووسیم کە زۆر کەس ئوترووحەی[2] دوکتۆرایان لەسەر **گوڵستانی سەعدی** پێشکەش کردووە، کە یەکێ لەوانە دوکتۆر (ڕەحیم سوڵتانوف)ی سەرەکی بەشی زمـانی فـارسی‌و زانـای

---

(١) ئەگەر وانەبێ شیعرەکە لەنگ دەبێ، لە فارسییەکەش‌دا هەر «خدایی»یە.
(٢) پایان نامە، بەڵگەی ئەنجام‌و دوایی هێنانی دوکتۆرا.

گەورەی ڕۆژهەڵات ناسە. هەروەها کچێکیش لەم دواییەدا ئوترووحەی لەسەر **گوڵستان** نووسیوە، وە لە ئوترووحەکەیدا باسی کردووە کە تیپی (ب) لە **گوڵستاندا** بە ٥٨ مەعنا بەکار هێنراوە. جا تەماشاکەن تاچ ڕادەیەك گوڵستانیان لاگرنگەوچ پایەیەکی هەیە لایان.

ئەی کوردی خوێندەوار! هیچ پێویست نیە من ستایشی **گوڵستان** بکەم بۆت. خۆت ئەی خوێنیتەوە حاڵی ئەبی چ گەوهەرێکە. **گوڵستان** هەشت بەشە، هەر بەشێکی بەیانی شتێك ئەکا لەو شتانەی پەیوەندیان هەیە بە ژیانی ئادەمیزادەوە، بەشێوەیەکی جوانو ئەدیبانەی وا وەك نەخشی بەرد لە دڵا جێ گیر ئەبێ. بەتایبەتی بەشی هەشتەمی شایانی ئەوەیە بە ئاوی ئاڵتوون، پەند بە پەندو حیکمەت بە حیکمەت بنووسرێتەوە، وە لە ژوور سەرەوە هەڵواسرێ بە دیوارا.

گوڵستانم هەر بە شێوەکەی خۆی وەرگێڕایە سەر کوردییە شیرینەکەی خۆمان. هەڵبەست بە هەڵبەستو پەخشان بە پەخشان. تا بە گوێرەی دەسەڵات ئاگاداری شەوکەتو ڕەونەقی بکەم. لام وایە ئەم مەبەستەم لە تەرجەمەکانی بێگانە زیاترە، چونکە ئەوان هەڵبەستەکانیان بە هەڵبەست وەرنەگێڕاوە. ئەم خزمەتە بچکۆلەیەم خستە ڕوو بۆ ئەوەی برا کوردەکانم کەڵك لە **گوڵستان** وەربگرن، وە تا گەلانی تر بزانن کە کوردیش خزمەتی ئەدەبی ڕۆژهەڵاتی کردووەو ئەیکات.

لەم تەرجەمەدا وا ڕێ ئەکەوێ لە هەندێ شوێنا شیعرێك ئەکرێ بەدوان، یان دوو شیعر ئەکرێن بە سیان بە پێی پێویستی شوێن، یا لە هەندێ شیعرا مەبەست بەیان ئەکەمو وتە بە وتە وەرناگێڕم، ئەم جۆرە شتانە لە شیعردا چاوپۆشیان لێ ئەکرێ.

تکا لە خوێندەواران ئەکەم لە هەڵەو کەمو کورتی ببورن. ئەبینن ئەم لە کوێو گوڵستان لە کوێ؟ چونکە یەکەم کورد ئەڵێ «کاڵا لە قەد باڵا» دووهەم، هەرگیز وەرگێڕراو ناگاتە پایەی لێ وەرگێڕراو، لەبەر ئەوە کە هەر زمانێ خاسیەتی تایبەتیی خۆی هەیە. بۆی بوەتە هۆی جوانیو، ڕازاندوویەتەوە، وە کە گۆڕرا بە زمانێکی تر ئەو خاسیەتەی نامێنێو جوانییەکەی پێشووی ئەفەوتێ. لە بەر ئەوەیە زانایانی ئایین ئەڵێن: دروستە **قورئان**

تەفسیر بکرێتەوەو مەعنای لێ بدرێتەوە، تا هەموو عالەم تێی بگات، بەڵام دروست نیە تەرجەمە بکرێت چونکە ئیعجازی قورئان لە وشەو دارشتنە عەرەبیەکەی دایە، وەکە گۆڕرایە سەر زمانێکیتر ئیعجازەکەی ئەفەوتێ. ئەوندە ئەتوانم بڵێم بەگوێرەی توانام کۆششم تیاکردووە بۆ ئەوەی شتێکی جوانتان پێشکەش بکەمو یادگارێکی شایان بۆ پاش مردنم بەجێ بهێڵم تا ڕەحمەتم بۆ بنێرن.

**مصطفی صفوت**

١٦ی ذو القعدەی ١٣٨٠

١ی مایسی ١٩٦١.

# روون کردنەوە

خوێنەری بەڕێز! لە پەراوێزەکانی ئەم کتێبەدا،

(و): ئاشێرەیە بۆ وشەی وەرگێڕ واتە: مامۆستا «مصطفی صفوت».

(ع.م): ئاشێرەیە بۆ ناوی کوڕی هێژای مامۆستای وەرگێڕ، پرۆفیسۆر «عزالدین مصطفی رسول».

(ك): ئاشێرەیە بۆ (کۆلیل) نازناوی مەلا «عمر صالحی صاحب» کە بە کتێبەکەدا چوەتەوە و لە ژێر نووسدا شێعری پێ زیاد کردوە.

(ع): ئاشێرەیە بۆ ناوی «عبدالستار نقشبندی» کە کتێبەکەی لەگەڵ دەقی نوسخە فارسییەکاندا بەراورد کردوە و پیاچووەتەوە و لە هەر جێگەیەکدا بە پێویستی زانیوە، وشە، یان ڕستە، یان شێعرێکی لە ناو [ ] دا بە دەقەکەی زیاد کردوە، کە لە نووسخە بڕوا پێکراوەکاندا (وەکوو: نووسخەی محمد علی فروغی، وە غلام حسین یوسفی وە خطیب رهبر و...) هەبووە و لە نووسخە فارسییەکەی جەنابی مامۆستا مصطفی صفوتدا نەبووە. بەو هیوایەی ئەم گۆڕانکارییە ئاسایی‌یە، بۆ زیاتر کەڵك وەرگرتنی برایانی بەڕێزی کورد زمان و بایەخدان بە زەحمەتی جەنابی مامۆستا بێت.

## سەرەتای گولستان

## بەناوی خوای بەخشەندەی میهرەبان

شانازی بۆ خوایەك كە فەرمانبەرداریی ئەو هۆی نزیكی‌یەو، سوپاس بەجێ‌هێنانی مایەی زیادی بەخشە. هەر هەناسەیەك ئەچێتە ناوەوە تازە بوونەوەیە بۆ ژیان. وە كە دێتە دەرەوە حەسانەوەیە بۆ گیان. جا لە هەر هەناسەیەكا دوو بەخشش هەیە،و بۆ هەر بەخششێ سوپاسێ پێویستە.

بە دەستو زمان كێ ئەتوانێ كێ        سوپاسی خوای كە بێنێتە جێ

﴿اِعْمَلُوا آلَ داوُدَ شُكْراً وَ قَلِيلاً مِنْ عِبَادِيَ الشَّكُور﴾

بەندە وا چاكە لە بەر سستی خۆی        بیانوو خواهی كا لە دەرگانەی خودا

وەر نە شایانی خوایی ئەو ئەبێ        كێ لە ڕووی ڕاستیوە[1] بۆی بكرێ ئەدا؟

بارانی بێ‌پایانی ڕەحمەتی، لە هەر شوێنێ بە خورۆژمو بە تاوە، وە خوانی نیعمەتو بەخشایشی لە هەرجێ‌یەك ڕاخراوە. پەردەی شەرمو حەیای بەندەگانی خۆی بە گوناه نادڕێتو مووچەی مووچەخۆرانی خۆی بە سووچو تاوان نابڕێت.

ئەی كەریمێ لە گەنجی پەنهانی        مووچە خۆرت هەیە لە گاورو جوو

دۆستانت لە كوێ ئەكەی بێ بەش        كە بە دوژمن هەتە نیگا و ڕوو؟

بە فەڕاشی بای بەیانی فەرموو هەتا فەرشی زمڕووتی ڕابخا، وە فەرمانی دا بە دایەنی هەوری بەهاری تا كچانی گیا لە بێشكەی زەمینا پەروەردە كات، وە كەوای سەوزی گەڵا بە

(١) ئەگەر لە جێی «ڕاستیوە» بوترێ «ڕاستی» شیعرەكە سوارترە، ـ«ك».

## دیباچه‌ی گلستان

بسم الله الرحمن الرحیم

منّت خدای را، عَزَّوَجَلّ، که طاعتش موجبِ قُربت است و به شکر اندرش مَزیدِ نعمت. هر نفسی که فرو می‌رود مُمِدِّ حیات است و چون برمی‌آید مفرِّحِ ذات. پس در هر نفسی دو نعمت موجودست و بر هر نعمتی شکری واجب.

از دست و زبانِ که برآید | کز عهده‌ی شکرش به در آید؟

اِعْمَلُوا آلَ دَاوُدَ شُکْراً وَ قَلِیلٌ مِّنْ عِبَادِیَ الشَّکُورُ.

بنده همان به که ز تقصیرِ خویش | عذر به درگاهِ خدای آورد
ورنه سزاوارِ خداوندیش | کس نتواند که به‌جای آورد

بارانِ رحمتِ بی‌حسابش همه را رسیده و خوانِ نعمتِ بی‌دریغش همه جا کشیده. پرده‌ی ناموسِ بندگان به گناهِ فاحش ندرد و وظیفه‌ی روزی به خطایِ مُنکَر نبرد.

ای کریمی که از خزانه‌ی غیب | گبرو ترسا وظیفه‌خور داری
دوستان را کجا کنی محروم | تو که با دشمن این نظر داری؟

خەڵاتی نەورۆزی بکاتە بەر درەختان، وە منالّی لقەکانیان بە هاتنی کاتی بەهار کڵاوی گوڵیان بکاتە سەر. بە هۆی دەسەڵاتو توانای ئەوەوەیە کە خۆراکی هەنگ بووەتە هەنگوینی دڵکەش، وە بە پەروەردەی ئەوە تووی خورما بووە بە درەختێکی سەوزی گەردن کەش.

هەڵ ئەسوورێن، مانگو ڕۆژو ئاسمانو هەورو با

تا تۆ نانێ دەست ئەخەی، بێ هۆش نەیخۆی هۆشیار

بۆ تۆ وا دێنو ئەچن فەرمان بەجێ دێنن هەموو

داخە، گەر تۆ جێ نەهێنی ئەمری زاتی کردگار

لە سەروەری کائیناتو فەخری مەوجودات، ڕەحمەتی هەموو عالەمو کاکڵەی نەوەی ئادەم، تەواوکەری چەرخی زەمان، [موحەممەدی موستەفا (د.خ) ڕیوایەت کراوە:][1]

شَـفِيعٌ، مُـطاعٌ، نَـبِيٌّ، كَـرِيمٌ    قَسِـيمٌ، جَسِـيمٌ، بَسِـيمٌ، وَسِـيمٌ

تکاکارو تکا لێوەرگیراوە    بە بەخشایش پەیامبەر ناسراوە

* * *

بَلَغَ الْعُلَىٰ بِكَمالِهِ، كَشَفَ الدُّجىٰ بِجَمالِهِ

حَسُنَتْ جَمِيعُ خِصالِهِ صَلُّوا عَلَيهِ و آلِهِ

گەییە پایەی بەرز بەهۆی کەماڵی

تاریکی لادا بە هۆی جەماڵی

شیرین ڕەوشتە جوانە فەساڵی[2]

سەلام لە خۆیو لە بنە ماڵی

* * *

قایمە دیواری ئوممەت تۆی هەبێ بۆ پشتیوان

کێ لە گێژی بەحر ئەترسێ نووح کە بێتە کەشتیوان؟

* * *

(١) فارسییەکەی بەم شێوەیە: «در خبر است از سرور کائنات...»، ـع.

(٢) دیمەن، شێوە ـ«ك».

فرّاشِ بادِ صبا را گفته تا فرشِ زمرّدین بگسترد و دایه‌ی ابرِ بهاری را فرموده تا بناتِ نبات در مهدِ زمین بپرورد. درختان را به خِلعتِ‌نوروزی قبایِ سبزِ ورق در بر گرفته و اطفالِ شاخ را به قُدومِ موسمِ ربیع کلاهِ شکوفه بر سر نهاده. عُصاره‌ی تاکی به قدرتِ او شهدِ فایق شده و تخمِ خرمایی به تربیتش نخلِ باسق گشته.

ابر و باد و مَه و خورشید و فلک در کارند
تا تو نانی به کف آریّ و به غفلت نخوری
همه از بهرِ تو سرگشته و فرمانبُردار
شرطِ انصاف نباشد که تو فرمان نبری

در خبرست از سروَرِ کاینات و مَفْخَرِ موجودات و رحمتِ عالمیان و صفوَتِ آدمیان و تتمّه‌ی دَورِ زمان، محمّدِ مصطفیٰ ﷺ

شَفِيعٌ مُطاعٌ نَبِيٌّ کَرِيم قَسِيمٌ جَسِيمٌ نَسِيمٌ وَسِيم

بَلَغَ الْعُلىٰ بِکَمالِهِ، کَشَفَ الدُّجىٰ بِجَمَالِهِ
حَسُنَتْ جَمِيْعُ خِصَالِهِ، صَلُّوا عَلَيهِ وَ آلِهِ

چه غم دیوارِ امّت را که دارد چون تو پشتیبان؟
چه باک از موجِ بحر آن را که باشد نوح کشتیبان؟

بەندەیەکی پەرێشان ڕۆزگار، دەستی پەشیمانی بە هیوای لێبوردنی یەزدانی، بۆ دەرگای خوا هەڵبڕی خوا تەماشای نەکرد، دووەم جار پاڕایەوە، خوا ڕووی تێ نەکرد، سێیەم بە گریانو زاری لاڵایەوە. کردگار فەرمووی: ئەی فریشتانم! لەم بەندەیەم شەرمم کرد. من نەبێ کێی تری هەیە؟ ئەوا لێی بوردمو هیوایم هێنایە جێ.

تەماشاکە لەم لوتفە چۆن ڕەحم ئەکا　　　گوناە بەندە ئەیکاتو ئەو شەرم ئەکا

گۆشە نشینانی کەعبەی جەلالی، دانیان بە تەواو نەپرستنیا ناوەو وتوویانە «**ما عَبَدْناكَ حَقَّ عِبادَتِكَ**» (بە پەرستنی شایانی تۆ نەمان پەرستوویت). ستایش گۆیانی جەمالی شیرینی، سەرسام ئەڵێن: «**ما عَرَفْناكَ حَقَّ مَعْرِفَتِكَ**» (بەڕاستی نەمان ناسیویت کە شایستەی ناسین بێ).

گەر کەسێ لێم بپرسێ باسی ئەو　　　بێ دڵ چی لە بێ نیشان بدوێ؟
عاشقێ کوشتە بێ بە دەس مەعشووق　　　کوشتە کێ دیویەتی دەمی بزوێ؟

خاوەن دڵێ، سەری بیر کردنەوەی لە یەخەی خۆی توند کردبوو، لە دەلیای موکاشەفەدا نوقم بوو بوو، کاتێ هاتەوە هۆش، یەکێ لە خۆشەویستانی [بە خۆش ڕوویی][1] لێی پرسی: لەو گوڵستانەدا کە سەیرانت تیا ئەکرد چیت بۆ هاوڕێکانت هێنا بە دیاری؟ وتی: لە دڵما بوو کە گەیشتمە گوڵستان داوێنم پڕ لە گوڵ کەم بۆ دیاری هاوڕێیانم، بەڵام کە گەیشتمە ناو باخ بۆنی گوڵان وەهای سەرسام کردم داوێنم لە دەس بەربوو.

بەڵێ فێر بن مەلانی بەربەیان عەشقیان لە پەروانە
کە سووتاوو سپاردی گیانی خۆی بێ دەنگ بە پەروانە[2]
بە لاف هەر کەس کە کڕیارە مەزانە ئەو خەبەرداره
ئەوەی زانای نیهانی بێ لە کونجێ ماتو پەنهانە

* * *

---

(١) لە فارسییەکە دا ئەمە هەیە: «به طریق انبساط...»،ـع.

(٢) هەزاران باڵدار چەشنی پەروانە　　　چونکو بێ عەشقە هەر بێ نیشانە
با نەگری بولبول دەمەو بەیانی　　　یاسای عاشقی بە شەو سووتانە، ـ«ك».

هرگه که یکی از بندگانِ گنهکارِ پریشان روزگار دستِ انابت به امیدِ اجابت به درگاهِ حق جَلَّ و عَلاٰ، بردارد ایزد تَعالیٰ در او نظر نکند؛ بازش بخواند باز اعراض فرماید؛ بار دیگرش به تضّرع و زاری بخواند، حقْ سُبحانَهُ و تَعٰالیٰ فرماید: **یَا مَلائِکَتی قَدِ اسْتَحْیَیْتُ مِنْ عَبْدِی وَ لَیْسَ لَهُ غَیْرِی فَقَدْ غَفَرْتُ لَهُ.** دعوتش اجابت کردم و امیدش برآوردم که از بسیاریِ دعا و زاریِ بنده همی شرم دارم.

**کرم بین و لطفِ خداوندگار　　　گنه بنده کرده‌ست و او شرمسار**

عاکفانِ کعبه‌ی جلالش به تقصیرِ عبادت معترف که: **مٰا عَبَدْنَاکَ حَقَّ عِبادَتِکَ**، واصفانِ حِلیه‌ی جمالش به تحیّر منسوب که: **مٰا عَرَفْنَاکَ حَقَّ مَعْرِفَتِکَ.**

**گر کسی وصفِ او ز من پرسد　　　بی‌دل از بی‌نشان چه گوید باز؟**
**عاشقان کُشتگانِ معشوقند　　　برنیاید ز کُشتگان آواز**

یکی از صاحب‌دلان سر به جَیبِ مراقبت فرو برده بود و در بحرِ مکاشفت مستغرق شده. آن‌گه که از این معاملت باز آمد یکی از یاران به طریقِ انبساط گفت: از این بوستان که بودی ما را چه تحفه‌کرامت کردی؟ گفت به خاطر داشتم که چون به درختِ گل رسم دامنی پُر کنم هدیه‌ی اصحاب را. چون برسیدم بویِ گُلم چنان مست کرد که دامنم از دست برفت!

**ای مرغِ سحر عشق ز پروانه بیاموز　　　کآن سوخته را جان شد و آواز نیامد**
**این مدّعیان در طلبش بی‌خبرانند　　　کآن را که خبر شد خبری باز نیامد**

***

ئـــەی بـــڵنـــدتر لە قـیاس‌و لە گـومان‌و لە خـەیاڵ

هەم لە هەڵبەست‌و لە هۆنراوی هەموو ئەهلی کـەماڵ

نـــامەو دەفـــتەری عـــومرم گـــەییەئاخری کـــار

لە یـــەکـەم پـایەی وەسـفی تـۆ زمـانم بـووە لاڵ

## ستایشی پادشای موسڵمانان ئەتابوك ئەبووبەکر سەعدی کوڕی زەنگی

ناوی «سەعدی» کە بەچاکی کەوتۆتە ناو دەمی هەموان، وە وتاری لە پانایی زەمینا بڵاو بووتەووە، قامیشە شەکری ووتارەکانی کە وەکوو شەکراو ئەخۆن، وە پارچە نووسراوەکانی وەکوو ئاڵتوون ئەکڕن، لەبەر فەزڵ‌و بەلاغەتی خۆی نییە، بەڵکو گەورەی جیهان‌و قوتبی زەمان، جێ‌نشینی سولەیمان‌و، پەنای خاوەنانی باوەڕو ئیمان، ئەتابوکی گەورە، سالاری هەردوو جیهان، ئەبووبەکری کوڕی سەعدی کوڕی زەنگی، سیبەری جیهان ئـافەرین لەسەرڕووی زەمین، خوای لێ ڕازی بێ، بە چاوی لوتف تەماشاو پەسەندی کردووە. بۆیە هەموو زانا و نەزان باوەڕیان پێ کردووە. «النَّاسُ عَلىٰ دِينِ مُلُوكِهِمْ» (خەڵك لەسەرئایینی پادشایانیانن).

تاکوو لوتفی تۆم لەسـەربێ مـن هـەمە نـاوو نـیشان

ناوی من ڕونتر لە ڕۆژی ڕوونـە لای خـاوەن نـەزەر

گەر سەراپایی وجـوودی مـن کـەم‌و کـورتە چ بـاك؟

تۆ پەسەندی کەی کەم‌و کورتی هەموو فەزڵە‌و هونەر

* * *

گـــڵێ ڕۆژێ لە نـــاو ژووری حـــەمامێ

لە دەســتی خـۆشـەویستێ گـەییە دەستم

وتم: تـۆ مـوشکی ئـەی گـڵ یـا عـەبیری؟

لە بـۆنـی دڵکـەشت سـەرسام‌و مـەستم

ای برتر از خیال و قیاس و گـمان و وَهـم
وز هرچه گفته‌اند و شنیدیم و خوانده‌ایـم
مجلس تمام گشت و به آخر رسـید عـمر
ما هم‌چنان در اول وصفِ تـو مـانده‌ایـم

***

ذکرِ جمیلِ سعدی که در افواهِ عوام افتاده است و صیتِ سخنش که در بسیطِ زمین منتشر گشته و قصب‌الجیبِ حدیثش که هم‌چون شکر می‌خورند و رقعه‌ی منشَآتش که چون کاغذِ زر می‌برند بر کمالِ فضل و بلاغتِ او حمل نتوان کرد بلکه خداوندِ جهان و قطبِ دایره‌ی زمان و قایم مقامِ سلیمان و ناصِرِ اهلِ ایمان و شاهنشاهِ مُعظَّم، اتابکِ اعظم، مظفَّر الدُّنیا والدِّین، ابوبکر بنِ سعد بنِ زنگی، ظِلُّ‌اللّٰهِ تَعالیٰ فی أَرْضِهِ، رَبِّ ارْضَ عَنْهُ وَ أَرْضِهِ، به عینِ عنایت نظر کرده است و تحسین بلیغ فرموده و ارادتِ صادق نموده لاجَرَم کافّه‌ی اَنام، خاصّه و عوام، به محبّت گراییده‌اند که النَّاسُ عَلَیٰ دِینِ مُلُوکِهِمْ.

زان‌گه که تو را بر مـنِ مسکـین نـظر است
آثــــارم از آفـــتاب مشـــــهورترست
گر خود هـمه عـیب‌ها بـدین بـنده درست
هــر عـیب کـه سـلطان بـپسندد هـنرست

***

گِـلی خـوشبوی در حـمّام روزی
رسید از دست مخدومی به دسـتم
بدو گفتم کـه مُشکـی یـا عـبیری
کـه از بـویِ دلاویـزِ تـو مسـتم

وتی: سەعدی گڵێ بووم نەم بوو نرخێ

بەڵام بەینێ لەگەڵ گوڵ دائەنیشتم

جەماڵی هەمنشینی کاری لێم کرد

ئەگین من کەی گوڵم، خاکێکی پەستم[1]

ئەی پەروەردگارا! موسڵمانان بەرخوردارکەی بە مانەوەی ژیانی، وە دوو چەندانکەی پاداش‌و ئیحسانی، وە بەرز کەیتەوە دۆستان‌و فەرمان بەرانی، وە بفەوتێنی دوژمنانی، بەگەورەیی ئایاتی قورئانی.

دامەزرێ وڵات با بە نگینی

ئاگاداری کە ڕۆڵەی شیرینی

لقد سَعِدَ الدُّنْيا بِهِ، دامَ سَعْدُهُ

وَ أَيَّدَهُ المَوْلیٰ بِأَلْوِيَةِ النَّصْرِ

كَذلك تَنْشَأُ لِينَةٌ هُوَ عِرْقُها

وَ حُسْنُ نَباتِ الأَرْضِ مِنْ كَرَمِ البَذْرِ

جیهان پێی کامەران بوو، بەردەوام بێ کامەرانی ئەو

بە هێزیکا بە ئاڵای نەسرەتی خۆی، زاتی یەزدانی

نەمامێ بنجەکەی لەو بێ، وەکوو ئەو پێ ئەگا بێ شك

نیشانەی توو لە بن توو وە بە گوێرەی پەندی پێشانی

ئیزەدی پاك‌و بلند، خاکی پاکی شیراز بە دەسەڵات‌و سامی حوکمدارانی عادڵ، وە هیممەت وکۆششی زانایانی بەکردەوە، تا ڕۆژی قیامەت لە سایەی سەلامەتیی ئەودا ئاگاداری بکات.

---

(١) لە نووسخەیەکدا ئەم چوار شیعرەی خوارەوە هەیە. بەڵام کەسێ شارەزای زەوقی سەعدی بێ ئەزانێ ئەم شیعرانە هی ئەو نین:

ئەگەر من دەوری عالەم خول بخۆم — جوانێکی وەك تۆ نایەتە دەستم

بە دووسەد کافر بتێکیان هەیە — من تەنیا یەك بت وا ئەپەرستم

پێم ئەڵین بۆچی تۆ بت پەرستی — کە یارم بت بێ چۆن نەی پەرستم

لەم دەردە منم (سعدی) دانیشتووم — لە خاکی پێی تۆ بت ئەپەرستم

بگــفتا مــن گِـلی نـاچیز بـودم | ولیکــن مـدّتی بـا گُـل نشسـتم
کمالِ هم‌نشین بـر مـن اثـر کـرد | وگرنه من همان خاکم کـه هسـتم

اَللّٰهُمَّ مَتِّعِ الْمُسْلِمینَ بِطُولِ حَیاتِهِ وَ ضَاعِفْ ثَوابَ جَمِیلِ حَسَناتِهِ وَارْفَعْ دَرَجَةَ أَوِدّائهِ وَ وُلاتِهِ وَ دَمِّرْ عَلَىٰ أَعْدَائِهِ وَ شُناتِهِ بِمَا تُلِیَ فِی الْقُرآنِ مِنْ آیاتِهِ، أَللّٰهُمَّ آمِنْ بَلَدَهُ وَاحْفَظْ وَلَدَهُ

لَــقَدْ سَـعِدَ الدُّنـیا بِـهِ دامَ سَـعْدُهُ | وَ أَیَّــدَهُ الْـمَوْلىٰ بِـأَلْوِیَةِ النَّـصْرِ
کَـــذٰلِکَ یَـــنْشَأُ لِـینَةٌ هُـوَ عِـرْقُها | وَ حُسْنُ نَباتِ الْأَرْضِ مِنْ کَرَمِ الْبَذْرِ

ایزد تعالیٰ و تَقَدَّس خِطّه‌ی پاکِ شیراز را به هیبتِ حاکمانِ عادل و همّتِ عالمانِ عامل تا زمانِ قیامت در امانِ سلامت نگه داراد.

ترسی نییە ئیقلیمی فورس ئەمڕو لە ئاشووب

تا تۆ لە سەری گەورە بی ئەی سێبەری یەزدان

دەس ناکەوێ ئەمڕۆ لەسەرئەم ڕوویی زەمینە

وەك دەرگەیی تۆ پڕ لە ئەمن، دەرگەوو دەربان

پاسیکە هەمیشە تۆ دڵی بێ دەسەڵاتان

پاداشت لەسەرئێمە، لەسەرحەزرەتی یەزدان

ئەی خوایە هەتا "با"و هەتا خاکە، هەمیشە

پارێزی لە بای فیتنە کە تۆ، پارسی ئێران

## هۆی دانانی ئەم کتێبە

شەوێك بیرم لە ڕۆژانی ڕابردوو ئەکردەوەو، بۆ ژیانی فەوتاوم خەفەتم ئەخوارد، وە بە ئاوی چاو بەردی بینای لەشم کون ئەکرد، وە بە لاواندنەوە بۆ پەرێشانی خۆم ئەم شیعرانەم ئەخوێندەوە:

هەردەم نەفەسێ لە ژین ئەبێ کەم
چی ماوە بە ڕاستی سەیرکەم

پەنجا لە تەمەن چوو، خەو لە چاوی
پێنج ڕۆژە کە ماوە گەر تۆ پیاوی

بێکارە ئەوی ڕۆی، بوو خەجاڵەت
بار بەستیی نەکرد بە تەپڵی ریحلەت

نووستنی پێش بەیانی بار کردن
دوا ئەخا پیادەکان لە ڕۆیشتن

هەر کەسێ هات بینایێ تازەی کرد
بوو بە ماڵی یەکێکی‌تر، ئەو مرد

نەگەڕا ئەو یەکەش تیا بە هەوەس
لە جیهان نەیدی کامەرانی کەس

یارێ نەیبێ دەوام، کەی یارە
ناشێ بۆ دۆستی ئەوی غەددارە

سکە مایەی ژیان، نەبێ برسی
تا لە ئیشا بێ، ڕاستی ناترسی

گەر قەبز بێ بە ئێش‌و ئازاری
وە ڕەوان بێ یەقینە بێ چاری

چوار تەبێعەت موخالیفی یەکتر
خاك‌و ئاوو هەواو هەم ئاگر

پێکەوە هەڵ ئەکەن کەمێ لە ژیان
یەکێ لەم چوارە سەرکەوێ ئامان!

ژووری وێران ئەبێ بە بینایی تەن
گیانی شیرین کە دێتە دەر لە بەدەن

اقلیمِ پارس را غم از آسیبِ دهر نیست | تا بر سرش بوَد چو تویی سایه‌ی خدا
امروز کس نشان ندهد در بسیطِ خاک | مـانند آسـتانِ درت مأمـنِ رضـا
بر توست پاسِ خاطرِ بیچارگان و، شکر | بر ما و، بـر خـدایِ جـهان‌آفرین جـزا
یا رب ز بادِ فتنه نگه‌دار خاکِ پـارس | چندان که خـاک را بـوَد و بـاد را بـقا

***

یک شب تأمّلِ ایامِ گذشته می‌کردم و بر عمرِ تلف کرده تأسّف می‌خوردم و سنگِ سراچه‌ی دل به الماسِ آبِ دیده می‌سُفتم و این بیت‌ها مناسبِ حالِ خود می‌گفتم:

هـر دم از عـمر مـی‌رود نَـفَسی | چـون نگـه مـی‌کنم نـماند بسـی
ای کـه پـنجاه رفت و در خـوابـی | مگـر ایـن پـنج روز دریـابی
خجل آن کس که رفت و کـار نسـاخت | کـوسِ رِحـلت زدنـد و بـار نسـاخت
خـوابِ نـوشینِ بـامدادِ رحـیل | بـاز دارد پـیاده را ز سـبیل
هـرکه آمـد عـمارتی نـو سـاخت | رفت و مـنزل بـه دیگـری پـرداخت
وان دگـر پـخت هـم‌چنین هـوسی | ویـن عـمارت بسـر نـبُرد کسـی
یـارِ نـاپایدار دوست مـدار | دوسـتی را نشـاید ایـن غـدّار

بێ گومان پیاوی زیرەکی عاقڵ بە جیهانێ وەها بێ نانێ دڵ
لە جیهانا خراپو چاك ئەمرێ ئەو کەسە مەردە چاکە وەر ئەگرێ
بەشی گۆڕت بنێرە گەر مەردی بە تەمای کەس مەبە کە تۆ مردی
عومر بەفرە لە بەر خۆری هاوین سەرکشی بەسیە وا تەوایەوە ژین
چوویتە بازاڕ ئەگەر بە دەستی بەتاڵ دەسرت پڕ نییە کە دێیتەوە ماڵ
کاتی زەرعات ئەوەی نەکا فەرمان هێشوەچن بێ ئەبێ لە خەرمانان
پەندی سەعدی بەگوێی دڵت ببێ گەر هەتە مەردی ڕوو کەرە سەر ڕێ

دوای ورد بوونەوەم لەم ڕووەوە ویستم بڕیاری تەنیایی بدەم، وە لە ڕابواردنی ئەمو ئەو داوێن بکێشمەوە، وە نامەو وتاری پەرێشانو بڵاوم بشۆمەوە،وە لەمەولا پڕوپووچ بە دەمما نەیەت.

لە کونجێ بە تەنیایی بێ گوێو زمان گەلێ چاترە بۆم لە هاوڕێی نەزان[1]

تا یەکێ لە دۆستانی هاوڕێی کەژاوەو، هەمنشینی ژوور وەتاغم وەکوو جاران هاتە لام، بە ڕوو خۆشییەوە دەستی کرد بە یاریو وتاری ڕەنگین، دەم بە پێکەنین، هەرچی کردو هەرچی وت وڵامم نەدایەوە. سەرم لەسەر ئەژنۆی خواپەرستی هەڵنەبڕی. لەم شێوەیەی من وەك ژێ کەوان هاتەوە یەكو وتی:

هەتاکوو هەتە هێزێ بۆ گفتوگۆ بکە گفتوگۆ خۆشو ڕەنگینو جوان
کە پەیکی ئەجەل دای بەسەرتا ئیتر ئە چێتە کلیلە دەمت بێ زمان

یەکێ لە هاوڕێیانم پێی‌وت: سەعدی بڕیاری بێ دەنگیو گۆشەنشینیی داوە، هەتا ئەم تۆزە ژیانەی ماوەتی لە پڕو پووچا بەکاری نەهێنێ. جاتۆیش ئەگەر ئەتوانی بڕۆ پەیڕەوی ئەو بکەو لە هەموو کەس دوور کەوەرەوە. وەڵامی: دایەوە بە جیهان ئافەرینو ڕابواردنی دێرین، دەم نابزوێنم هەتا وەکوو جاران نەکەویتە گفتوگۆ. ڕەنجاندنی دۆستان نەفامینو نەزانینە، وە کەفارەتی سوێند ئاسانە. بیرو باوەڕی خاوەن عەقڵان پێچەوانەی بڕیاری ئەوە، زوڵفەقاری عەلی لە کەلانو[2] زمانی سەعدی لە دەما پەنهان نابێ.

---

(١) شەرتە لەم دوا نەوێم لەگەڵ کەس لەگەڵ دڵبەرا باس بکەمو بەس،ـ«ك».
(٢) کێلانی خەنجەر یا شمشێر، ـ«ك».

نـــیک و بـد چـون هـمی بـباید مـرد　　خُـنُک آن کس کـه گـوی نـیکی بـرد
برگِ عیشی بـه گـورِ خـویش فـرست　　کس نـــیارد ز پس، ز پـــیش فـــرست
عـــمر بـــرف است و آفـــتابِ تـــموز　　انـــدکی مـــاند و خـــواجـه غِـرّه هـنوز
ای تـــــهی‌دست رفـــــته در بـــازار　　تـــــرسمت پُـــــر نـــیاوری دســـتار
هرکه مـزروعِ خـود بـخورد بـه خـوید　　وقتِ خـــرمنْش خـــوشه بـــاید چـــید

بعد از تأمّلِ این معنی مصلحت آن دیدم که در نشیمنِ عُزلت نشینم و دامنِ از صحبت فراهم چینم و دفتر از گفته‌های پریشان بشویم و مِن بعد پریشان نگویم.

زبان بریده به کُنجی نشسته صُـمٌّ بُکـم　　به از کسی که زبانش نباشد اندر حکـم

تا یکی از دوستان که در کجاوه انیسِ من بود و در حجره‌جلیس، برسمِ قدیم از در درآمد. چندان که نشاطِ ملاعبت کرد و بساطِ مداعبت گسترد جوابش نگـفتم و سـر از زانویِ تعبّد برنگرفتم رنجیده نگه کرد و گفت:

کـــنونت کـه امکـانِ گـفتار هست　　بگوی، ای برادر، به لطف و خـوشی
که فردا چـو پـیکِ اجـل در رسـد　　به حکـمِ ضـرورت زبـان درکشـی

کسی از متعلّقانِ مَنَش بر حَسَبِ واقعه مطّلع گردانید که فلان عزم کرده است و نیّت جَزم که بقیّتِ عمر معتکف نشیند و خاموشی گزیند تو نیز اگر توانی سرِ خویش گیر و راهِ مجانبت پیش. گفتا به عزّتِ عظیم و صحبتِ قدیم که دم برنیارم و قدم برندارم مگر آن‌گه که سخن گفته شود به عادتِ مألوف و طریقِ معروف که آزردنِ دوستان جـهل است و کفّارتِ یمین سهل. و خلافِ راهِ صواب است و نقضِ رأیِ اولوآلاَلْباب: ذوالفقارِ علی در نیام و زبانِ سعدی در کام.

زمـــانت لە دەمـــتا ئـەزانـی چـییە؟ کـلیلی دەری گـەنجی خـاوەنی هـۆش
چوزانی چییە، سـواڵەتـە،[1] گـەوهەرە کە دووکانی داخست جەواهێر فـرۆش

(پارچە)

گەرچی بێ دەنگی لەلای پیری حەکیمان ئەدەبە
کـاتی پـێویسـتی ئـەبێ بـۆ وتـنت تـێ کـۆشـی
عەقڵ و هـۆشـی بـەشرییەت ئـەڕووخـێنـن دوو شت
کـاتی بـێ دەنگـی، وتـن. کـاتی وتـن، خـامۆشـی

بە کورتی توانام نەما زمان لە گفتوگۆی بگێڕمەوە، وە ڕوو لێ وەرگێڕانم بە مرووەت نەئەزانی. دۆستێکی ڕێك‌و خۆشەویستێکی ڕاست بوو. (هۆنراوە):

کەسێ! نیتە دەرچوون لە ژێر چنگی ئەو ئەگەر ئەهلی عەقڵی مەچۆ جەنگی ئـەو

ناچار لە گەڵیا کەوتمە وتار، وە بۆ ڕابواردن پێکەوە ڕوومان کردە دەشت، کـاتێ بـوو بەهار دەشتی کردبوو بە بەهەشت، دوور لە کزەی سەرماو تینی گەرما.

[کـــراســی گــەلا لەبــەر درەخــتان وەك بەرگی جێژنی خۆشـبەختان][2]

* * *

ئـــوردیبەهشتی جـەلالی بـوو یـانی مـانگی نـیسان
بـولبول بـە دەنگ‌و چـریکەی نـەوا لەسـەرلقەکـان
لوءلوء لە شـەونمی تـەڕەوە وا لەسـەرگوڵاڵەی سـوور
وێنـەی عـەرەق کـە ڕژابـێتـە سـەر گـۆنـە یـی جـانان

لەگەڵ یەکێ لە دۆستان لە ناو باغ‌و گوڵستانا ماینەوە هەتاکوو بەیانی، لە شوێنێکی خۆش کە درەختانی دڵکەشی تیا بەیەکا چوو بوون. سەیری زەمینت ئەکرد گـۆیـا وردە شووشەی تیا ڕژاوە، وە هێشووی ترێی گەردوون لە گەردنی میوەکان کراوە.

---

(١) لەت‌و کوتی گۆزەو گڵینەی شکاو، کاسەی کەل، ـ«ك».
(٢) فارسییەکە بەم شێوەیە: «پیراهن برگ درختان، چون جامۀ عید نیکبختان»،ـ ع.

زبان در دهان، ای خردمند، چیست؟ کــــلیدِ درِ گـــنجِ صـــاحب هـــنر
چو در بسته باشد چـه دانـد کسـی که جـوهرفروش است یـا پـیله‌ور

***

اگرچه پیشِ خـردمند، خـامشی ادب است
به وقتِ مصلحت آن به که در سخن کوشی
دو چیز طَیره‌ی عـقل است: دم فـرو بسـتن
به وقتِ گفتن و، گـفتن بـه وقتِ خـاموشی

فی‌الجمله زبان از مکالمه‌ی او درکشیدن قوّت نداشتم و روی از محادثه او گردانیدن مروّت ندانستم که یارْ موافق بود و ارادتْ صادق.

چو جنگ آوری، بـا کسـی بـرستیز که از وی گـزیرت بـوَد یـا گـریز

به حکمِ ضرورت سخن گفتم و تفرّج‌کنان بیرون رفتیم در فصلِ ربیعی که صولتِ بَرد آرمیده بود و اوانِ دولتِ وَرد رسیده.

پـیراهـنِ بـرگ بـر درخـتان چون جامه‌ی عیدِ نیک‌بختان

***

اول اردیــبهشت مـــاهِ جــلالی بـلبل گـوینده، بـر مَـنابرِ قُـضْبان
بر گلِ سـرخ، از نـم اوفـتاده لآلی هم‌چو عرق بر عذارِ شاهدِ غَضْبان

شب را به بوستان با یکی از دوستان اتـفاقِ مَـبیت افـتاد: مَـوضعی خوش و خـرّم و درختان درهم، گفتی که خرده‌ی مینا بر خاکش ریخته و عِقدِ ثریّا از تاکش درآویخته.

رَوْضَـــةٌ مـــاءُ نَـــهْرِها سَـــلسال      دَوْحَـــةٌ سَـــجْعُ طَـيْرِها مَـوْزون[1]

پـڕ لە لاولاوە ئـەو لە ڕەنگـاوڕەنگ      ئـەم پـڕە لە مـیوەهایی گـوونـاگـوون

بـــا لە ژێر ســـێبـــەری درەخـــتانا      فەرشی داخستووە هەموو گوڵگوون

سبەینێ کە بیری گەڕانەوە بەسەرمانا زاڵ بوو، دیم داوێنی پڕ کردووە لە گوڵو ڕێحانەو نەسرینو نازناز، وە هەنگاوی بۆ گەڕانەوە نا. پێم وت: گوڵی گوڵزار وەکوو ئەزانی ئەوەندە نامێنێتەوە، وە کاتی بەهاریش زوو ئەبڕێتەوە. زانایان وتوویانە ئەوەی پایەدار نەبێ، بۆ ئەوە ناشێ دڵی پێوە ببەستی. وتی: ئەی چارەم چییە؟ وتم: بۆ سـەیرانـی خـوێنـدەوارانو دڵ کرانەوەی یاران ئەتوانم کتێبێکی (گوڵستان) دروست بکەم کە بای پایز دەستی زەبرو زۆر بۆ لقو گەڵای درێژ نەکاتو، گەردشی زەمان هەرگیز بەهاری نەگێڕێ بە پایز.

بـە چ کـەڵك دێت لە گـوڵ تـەبەقێ      لە گـوڵسـتانی مـن بـبە وەرەقـێ

ڕۆژی ئەو چندە پێنجە یاخۆ شەش      ئەم گوڵسـتانە هـەر ئـەمێنـێ گـەش

کاتێ ئەمەی بیست داوێنە گوڵی ڕژاندو، دەستی لە داوێنم ئاڵاند. وتی: «الكَريمُ إذا وَعَدَ وَفا» واتە: (بەخشندە پەیمان بدا بەجێی دێنێ).

وا ڕێ کەوتبوو لەو ڕۆژانەدا چەند بەندێکم نـووسیبوو لە بـاسی جـوان ڕابـواردنو دەستووری گفتوگۆدا کە ئەگەر بەکار بهێنرێت بەلاغەتو زمان ڕەوانی زیاد ئەکا. بەکورتی هەندێ گوڵ لە باغا مابوو گوڵستانم تەواو کرد. خوا خۆی ئەزانێ.

ئەم گوڵستانە کاتێ پەسندە کەوا بارەگای جیهان پەنای سێبەری کردگارو پڕتەوی لوتفی پەروەردگار. گەنجینەی زەمان، پەنای ئەمان، بەهێزکـراوی ئـاسمان، زاڵو یـاریدەدراوی سەر دوژمنان، هێزو دەسەڵاتی دەوڵەت، چرای ڕووناکی مـیللەت، شـانازی ئـیسلامو، جەماڵی ئەنام، سەعدی کوڕی ئەتابوك شەهەنشای گەورە، خاوەنی ئـومەم، سـەرداری عەرەبو عەجەم، سوڵتـانی زەمـینو دەلیـا، واریـسی مـوڵکـی سـولەیمان مـظفرالدیـن ئەبووبەکری کوڕی سەعدی کوڕی زەنگی، پایەدار بێ ئیقباڵیانو، زیـاد بـێ ئـیجلالیان. ڕووی لە هەموو چاکەیەك بێ دواڕۆژیان، لە ڕووی لوتفو نەوازشەوە تەماشای بکات.

---

(١) باخێ کە ئاوی جۆگـەی شـیرینە      شا باڵی شیعری مەلی ڕەنگینە، ـ«ك».

رَوْضَـــةٌ مـاءُ نَـهْرِها سَـلْسالْ　　دَوْحَـةٌ سَـجْعُ طَـیْرِها مَـوْزُونْ
آن پر از لاله‌هـای رنگـارنگ　　وین پر از میوه‌های گوناگـون
بـــاد در ســـایه‌ی درخـــتانش　　گســترانـیده فـرشِ بـوقلمون

بامدادان که خاطرِ باز آمدن بر رایِ نشستن غالب آمد دیدمش دامنی گل و ریحان و سنبل و ضَیْمَران فراهم آورده و آهنگِ رجوع کرده. گفتم: گلِ بُستان را چنان که دانی بقایی و عهدِ گلستان را وفایی نباشد و حکیمان گفته‌اند: هرچه نپاید دل‌بستگی را نشاید. گفتا: طریق چیست؟ گفتم: برای نُزهَتِ ناظران و فُسحَتِ حاضران کتابِ گلستانی توانم تصنیف کردن که بادِ خزان را بر ورقِ او دستِ تطاول نباشد و گردشِ زمان عیشِ ربیع آن را بـه طیشِ خریف مبدّل نکند.

به چه کـار آیـدت ز گُـل طـبقی؟　　از گـــلستانِ مـــن بـــبر ورقـــی
گل همین پـنج روز و شَـش بـاشد　　وین گلستان همیشه خـوش بـاشد

حالی که من این حکایت بگفتم دامنِ گُل بریخت و در دامنم آویخت که: **اَلْکَرِیمُ إِذَا وَعَدَ وَفیٰ.** فصلی در همان روز اتّفاقِ بیاض افتاد در حُسنِ معاشرت و آدابِ محاورت، در لباسی که متکلّمان را به‌کار آید و مترَسِّلان را بلاغت بیفزاید. فی‌الجمله از گلِ بستان هنوز بقیّتی مانده بود که کتابِ گلستان تمام شد. و تمام آنگه شود به حقیقت که پسندیده آید در بارگاهِ شاهِ جهان پناه و سایه‌ی کردگار و پرتوِ لطفِ پروردگار، ذُخرِ زمان و کهفِ امان، **أَلْمُؤَیَّدُ مِنَ السَّماءِ، أَلْمَنْصُورُ عَلَی الْأَعْدَاءِ، عَضُدُالدَّوْلَةِ الْـقَاهِرَةِ، سِـراجُ الْـمِلَّةِ الْـبَاهِرَةِ، جَمالُ الْأَنامِ، مَفْخَرُ الْإِسلامِ، سَعْدُ بْنُ الْأَتابَك الْأَعْظَمْ، شَاهَنْشاهَ الْمُعَظَّمِ، مـالِکُ رِقـابِ الْأُمَمِ، مَوْلَی مُلوکِ الْعَرَبِ وَ الْعَجَمِ، سُلْطَانِ الْبَرِّ وَ الْبَحْرِ، وارثِ مُلْكِ سُلَیْمانَ، مُظَفَّر الدِّینِ أَبی‌بَکْر بْنِ سَعْدِ بْنِ زنگی أَدامَ اللّهُ إِقْبالَهُما و ضَاعَفَ جَلالَهُمَا وَ جَعَلَ إِلی کُلِّ خَیْرٍ مَآلَهُما،** و به کرشمه‌ی لطفِ خداوندی مطالعه‌فرماید.

به سەیری گۆشـەیەکـی چـاوی ئـەم کـتێبـە وەکـوو
نـــیگارخــــانەیی چـــینەو نـــەخشی ئـــەرژەنگی
هـــیوام وایـــە نـــەرەنـــجێ وتـــم: گـــوڵستانە
بێتە خۆشـیی‌و شـادی، نـە بێتـە هـۆی دڵ تـەنگی
بـــە تـــایبەتی ســـەرەتای ئـــەم نـــامە پـیرۆزە
به ناوی سەعدی بووبەکرە، سەعدی کوڕی زەنگی

## میری گەورە فەخرەددین ئەبووبەکری کوڕی ئەبوو نەسر.

دیسان بیرو هۆشی دەماخم وەکوو بووکێکی ناشیرین سەر ناهێنێتە دەر، وە چاوی شەرمەزاری لە پشتی پێ جیاناکاتەوە، وە بۆ ڕیزی تەماشاکەران خۆی دەرناخات، مەگەر ئەو کاتە خشڵی قبووڵی میری گەورە، زانای بە عـەداڵەت‌و دەسـەڵات‌و هـێز، پـاڵپشتی تەختی سەڵتەنەت‌و، ڕاوێژکەری ڕاوێژی وڵات، پەنای هەژاران‌و دەربەدەران، مامۆستاو لەلەی زانایان، دۆستی خواپەرستان، هۆی شانازی فارس، قۆڵی بە هێزی پاشاو وڵات، «باربەك»،[1] شانازی دەوڵەت‌و ئایین فەریادڕەسی ئیسلام‌و موسوڵمانان، پاڵپشتی شاهان ئەبووبەکری کوڕی ئەبوو نەسر خوا بەرقەرارو پایەداری کا، سوپاس کراو لە هەموو ئافاق، سەراپای جوانی‌و ئەخلاق.

کەسێ ژێر سێبەری لوتفی ئەوی دەسکەوتبێ بێ شك
گـــوناهی تـــاعەتە، زۆر بـــەختیارەو دوژمـــنی دۆستە

بە هەر یەکە لە بەندەکانی دەورو پشتی خزمەتێکی پێ سپێرراوە کە ئەگەر سستی تیا بنوێنێ، دێتە مـەیدانی سـەرزەنشت، مـەگـەرئەم دەسـتەی دەروێشـانە کـە سـوپاسیان لەسەرپێویستە وە داوای چاکەی بۆ بکەن. بەجێ هێنانی دۆعای لەلاوە چاکتر جێ گیرە چونکە لە ڕوو پەرمایی دوورە.

---

(١) بار + بەک (بەیگ) کەسێك هەر کاتێ بیەوێ شا ببینێ، ئیزنی ببێ. (بـروانـە گـلستان، بـا تصحیح و توضیح دکتر غلام حسین یوسفی) ـ ع.

**گر التفاتِ خداوندیش بیاراید**
**نگارخانه‌ی چینی و نقشِ اَرتَنگی است**
**امید هست که رویِ ملال درنکشد**
**از این سخن، که گلستان نه جای دلتنگی است**
**علی‌الخصوص که دیباچه‌ی همایونش**
**به نامِ سعدِ ابوبکر سعدِ بن زنگی است**

***

دیگر، عروسِ فکرِ من از بی‌جمالی سر برنگیرد و دیده‌ی یأس از پشتِ پایِ خجالت برندارد و در زمره‌ی صاحب‌دلان متجلّی نشود مگر آن‌گه که متحلّی گردد به زیورِ قبولِ امیرِ کبیرِ عالمِ عادل، مؤیَّدِ مظفّرِ منصور، ظهیرِ سریرِ سلطنت و مشیرِ تدبیرِ مملکت، کَهْفُ الْفُقَرَاء، مَلاذُ الْغُرَباء، مُرَبِّی الْفُضَلاء، مُحِبُّ الْأَتقیاء، إِفْتِخَارُ آلِ فَارِس، یَمِینُ الْمُلْك، مَلِكُ الْخَواصِّ باربَك، فَخْرُ الدَّوْلَةِ وَ الدِّین، غِیاثُ الْإِسلاَمِ وَ الْمُسْلِمین، عُمْدَةُ الْمُلُوكِ وَ السَّلاطِینِ، أَبُوبَکْرِ بْن أَبِی نَصْر أَطَالَ اللّهُ عُمْرَهُ وَ أَجَلَّ قَدْرَهُ وَ شَـرَحَ صَـدْرهُ وَ ضَاعَفَ أَجْرَهُ، که ممدوحِ اکابرِ آفاق است و مجموعِ مکارمِ‌اخلاق.

**هرکه در سایه‌ی عنایتِ اوست گنهش طاعت است و دشمن، دوست**

بر هریک از سایرِ بندگان و حواشی خدمتی متعیّن است که اگر در ادایِ برخی ازان تهاوُن و تکاسُل روا دارند در معرضِ خطاب آیند و در محلِّ عتاب، مگر بر این طایفه‌ی درویشان که شکرِ نعمتِ بزرگان واجب است و ذکرِ جمیل و دعایِ خیر. و ادای چنین خدمتی در غیبت اولیٰ‌ترست که در حضور، که این به تصنّع نزدیک است و آن از تکلّف دور. به اجابت مقرون بادا!

پشتی چەماوەی سەما، ڕاستە، لە خۆشی کە دی
دایکی زەمانە چەشنی تۆ ڕۆڵەی هێنایە دی
حیکمەتی ڕووتە کەوا لوتفی جیهان ئافەرین
پیاوێ بنێرێ بکا خزمەتی رووی زەمین
دەوڵەتی دەسکەوت تەواو هەر کە ژیا نیك‌ناو
ناوی بە چاکی لە دوای، زیندووی ئەهێڵێ لە ناو
وەسفت بکەن یا نەکەن ئەهلی فەزڵ، ڕووی جوان
نایەوێ ئارایشی بکرێ بە دەستی ژنان

(جا بەیانی ئەوە ئەکا کە بۆچی لە خزمەت سستی کردووەو خۆی لەو بارەگایە دوور گرتووە).

سستی و خۆ دوور گرتنم لە خزمەتی بارەگای ئەوگەورەیە لە بەر ئەوەیە کە دەستەیەك لە حوکەمای هێندوستان، لە زاناو هونەروەر بوزورجمیهر ئەدوان، کەم و کووڕییان لێ نەدۆزیەوە ئەوە نەبێ کە زمانی لە گفتوگۆدا ڕەوان نییە، گوێ گر زۆر چاوەڕوان ئەبێ هەتا باسێ تەواو ئەکات بوزرجمیهر بیستیەوە، فەرمووی: بیرکردنەوە لەوە کە چی بڵێم، چاکترە لە پەشیمان بوونەوە لەوە کە بۆ چیم وت.

| | |
|---|---|
| واتە زانی پەروەردەی دەستی پیر | واتە ناڵێ نەیکا هەتا تۆزێ بیر |
| بە بێ بیر وردی مەجوڵێنە دەم | ئەگەر چاکت وت دوایش کەوی چ غەم |
| لە دوای بیر وردی هەڵێنە نەفەس | وتت وا تەواو نەڵێن ئیتر بەس |
| بەشەر لە حەیوان چاکترە هەردەم | کە خراپی وت خرابترە ئەم |

ئەگەر لە ئاستانی ئەوگەورەیەداکە جێی کۆبوونەوەی خاوەن دڵان و مەرکەزی زانایانە، لە گفتوگۆدا پاڵەوانی بکەم سەرکەشییە، وەهۆی کەم هێنانە بۆ بازاری عەزیزی میسر. لە بازاری گەوهەر فرۆشانا دەنکە جۆیەك نرخی نییە[1]. چرا لە بەرابەری ڕۆژا پڕتەوی نییە. منارە لە داوێنی چیای ئەڵوەندا پەست ئەنوێنێ.

(١) بەم شێوەش تەرجمە کراوە: (لە بازاری گەوهەر فرۆشانا مووروە کەوەڵە، دەنکە جۆیە)

**پشتِ دوتـایِ فـلک راست شـد از خـرّمی**
**تـا چـو تـو فـرزند زاد مـادرِ ایّـام را**
**حکمتِ محض است اگر لطفِ جهان آفرین**
**خـاص کـند بـنده‌ای، مـصلحتِ عـام را**
**دولتِ جاوید یـافت هـرکه نکـونام زیست**
**کـز عـقبش ذکـر خـیر زنـده کـند نـام را**
**وصفِ ترا گر کـنند ور نکـنند اهـلِ فـضل**
**حـاجتِ مشّـاطه نـیست روی دلارام را**

***

تقصیر و تقاعُدی که در مواظبتِ خدمتِ بارگاهِ خداوندی می‌رود بنابر آن است که وقتی جمعی حکمای هندوستان در فضیلتِ بزرجمهر سخن می‌گفتند و به آخر جز این عیبش ندانستند که در سخن گفتن بَطِیء است یعنی درنگِ بسیار می‌کند و مُستَمِع را بسی منتظر می‌باید بودن تا وی تقریرِ سخنی کند. بزرجمهر بشنید و گفت: اندیشه کردن که چه گویم به از پشیمانی خوردن که چرا گفتم.

**سـخندانِ پـرورده، پـیرِ کـهن — بـیندیشد، آن‌گـه بگـوید سـخن**
**مـزن بـی‌تأمّل بـه گـفتار دم — نکو گو و گر دیر گـویی چـه غـم؟**
**بـیندیش و آن‌گـه بـرآور نـفس — وز آن پیش بس کن کـه گـویند بس**
**به نـطق آدمـی بـهترست از دواب — دواب از تو به، گر نگـویی صـواب**

فَکَیْفَ در نظرِ اعیانِ حضرتِ خداوندی، عَزَّ نَصْرُهُ ـ که مجمعِ اهلِ دل است و مرکزِ علمایِ متبحّر ـ اگر در سیاقتِ سخن دلیری کنم شوخی کرده باشم و بضاعتِ مُزجاة به حضرتِ عزیز آورده و شَبَه در جوهریان جُوی نیارد و چراغ پیشِ آفتاب پرتوی ندارد و مَناره‌ی بلند بر دامنِ کوهِ الوند پست نماید.

سـەعدی پیرێکـە بیری ئازادە | کـەسێ نایەتە جـەنگی ئوفتادە
چاکە بیر کەیتەوە لە پێش گوفتار | پایە دانان خـرایـە پێش دیـوار[١]
دار ئـەنێژم نـەوەك لە نـاو بـاخان | هەمە جوانی نەوەك لە ناو کەنعان

لە لوقمانیان پرسی: لە کێوە حیکمەت فێربوویت؟ وتی: لە کوێرانەوە، هەتا جێگە پێ نەدۆزنەوە پێ دانانێن (قَدِّمِ الخُروجَ قَبْلَ الْوُلوجِ) (هاتنە دەرەوە پێش چوونە ژوورەوە).

پیاوەتیت تاقی کەرەوە ئەنجا ژن بێنە. (پارچە):

گەرچی چـالاکـە لە جـەنگا کـەڵەشێر | نـاگـرێ بـەرگە لە چـنگ بـازی دلێر
بـۆ مشك شـێرە پشـیلە، بـەڵام | مشکـی مـەیدانـی پـڵنگـە یـا شێر

بەڵام پشتم بەوە قایمە کە چاو لە کەمو کـورتی ژێردەستانی ئەپۆشـێ، وە بـۆ بـڵاو کردنەوەی سووچی بەردەستانی تێ ناکۆشی. لە بەر ئەوە بە کـورتی لەوتـەی نـەسەقو نموونەی ڕەوشتی پاشایانی ڕابردوو، خوایان لێ خۆش بێ، لەم کتێبەدا هەندێ لە تەمەنی گرانمایەم بەخت کرد. ئەمە بوو هۆی پێکەوەنانی گوڵستان.

برا هەڵبەستی ئێمـە هـەر ئـەمێنـێ | کە گەردی خاکی ئێمە وا لە شوێنێ
بـمێنـی یـادگاری نـەخشی دەستم | ژیـانێ وانـەبێ خـۆی نـانوێنـێ
هیوام خاوەن دڵێکە مەرحەمەت کا | دوعـا یـا فـاتیحا بـۆ مـن بـخوێنـێ

بە کورتی سەیری ئەم کتێبەم کرد وە لە بەندەکانی ورد بوومەوە بۆ ئەوە ئەم گـوڵزارە گەشە وە ئەم باغچەی درەختانی سەرکەشە وەك بەهەشت لەسەرهەشت ڕێ کەوێ، وا بە کورتی بەندەکانی بەیان ئەکەم:

بەندی یەکەم: ڕەوشـتی پـادشایان.
بەندی دووەم: ڕەوشـتی دەروێشـان.
بەندی سێیەم: گـەورەیی قـەناعەت.
بەندی چوارەم: سوودو کەڵکی بێ دەنگی.

---

(١) وەرگێڕانی شیعری ئەووەڵ لەم جێگەدا یا لە بیر چووە یا دواکەوتووە من ئاوام تەرجـەمە کردەوە:
هـەر خـۆڵکـێشـێ پـڕ دەعـیەو دەمـار | مل خۆی ئەشکێنێ سەرئەنجام کار، ـ«ك».

هرکه گردن به دعوی افرازد  خویشتن را به گردن اندازد
سعدی افتاده‌ای است آزاده  کس نیاید به جنگِ افتاده
اول اندیشه وانگهی گفتار  پای بَست آمده‌ست و پس دیوار

نخل‌بندی دانم ولی نه در بُستان، شاهدی فروشم ولیکن نه در کنعان. لقمان را گفتند: حکمت از که آموختی؟ گفت: از نابینایان که تا جای نبینند پای ننهند. **قَدِّمِ الْخُرُوجَ قَبْلَ الْوُلُوجِ**. مردیت بیازمای و آنگه زن کن.

گرچه شاطر بوَد خروس به جنگ  چه زند پیش باز رویین چنگ؟
گُربه شیرست در گرفتنِ موش  لیک موش است در مصافِ پلنگ

امّا به اعتمادِ سعتِ اخلاقِ بزرگان که چشم از عوایبِ زیردستان بپوشند و در افشایِ جرایمِ کهتران نکوشند کلمه‌ای چند به طریقِ اختصار از نوادر و امثال و شعر و حکایات و سیرِ ملوکِ ماضی،رحمهم‌الله، در این کتاب درج کردیم و برخی از عمرِ گران‌مایه بر او خرج. موجبِ تصنیفِ این کتاب این بود و باللّهِ التّوفیق.

بمانَد سال‌ها این نظم و ترتیب  ز ما هر ذرّه خاک افتاده جایی
غرض نقشی است کز ما باز ماند  که گیتی را نمی‌بینم بقایی
مگر صاحب‌دلی روزی برحمت  کند در کارِ درویشان دعایی

امعانِ نظر در ترتیبِ کتاب و تهذیبِ ابواب، ایجازِ سخن را مصلحت دید تا مر این رَوضه‌ی غَنّا و حدیقه‌ی غُلْبا را چون بهشت هشت باب اتفاق افتاد. ازان مختصر آمد تا به ملالت نینجامد.

- باب اوّل: در سیرتِ پادشاهان؛
- باب دوّم: در اخلاقِ درویشان؛
- باب سوّم: در فضیلتِ قناعت؛
- باب چهارم: در فوایدِ خاموشی؛

بەندی پێنجەم: باسی عەشق و جوانی.

بەندی شەشەم: باسی پیری و ناتوانایی.

بەندی حەوتەم: سوودی بەخێو کردن.

بەندی هەشتەم: سوودی برایەتی و حیکمەت.

❋ ❋ ❋

لە کاتێکا کە وەختی ئێمە خۆش بوو

لە هیجرەت شەش سەدو پەنجاوو شەش بوو

من ئامۆژگاری خۆمم کرد برا وا

ئەڕۆم و ئێوە ئەسپێرم بە دەس خوا

- باب پنجم: در عشق و جوانی؛
- باب ششم: در ضعف و پیری؛
- باب هفتم: در تأثیرِ تربیت؛
- باب هشتم: در آدابِ صحبت.

***

در این مدّت که ما را وقتْ خوش بود ز هجرت ششصد و پنجاه و شش بود

مرادِ ما نصیحت بود و گفتیم حوالت با خدا کردیم و رفتیم

## بەندی یەکەم:

# ڕەوشتی پادشایان

### چیرۆک (١)[١]

بیستم پادشایەك بەکوشتنی دیلێ فەرمانی دا. ئەو بێچارەیە لەو حاڵە بێ‌هیوایی‌یەدا بە زمانێ کە هەیبوو پادشای داگرت بە جنێوو وتاری سووك. وەك وتراوە هەرکەسێ دەس لە گیانی خۆی بشوا هەرچی لە دڵی‌دا بێ ئەیڵێ.

اِذا یَـئِس الْاِنسـانُ طـالَ لِسـانُهُ          کَسِنَّوْرٍ مَغْلُوبٍ یَصُولُ عَلَی الْکَلْبِ

(کە ئادەمی بێ‌هەوا بوو زمان درێژ ئەکا، وەك پشیلەیەك زۆری لێ کرابێ پەلامار بەرێ بۆ سەر سەگ). (تاك):

کەوتیە تەنگانە نـەما ڕێی فـیرار          دەست بدە شمشێر برۆ کـارزار

پادشا پرسی: ئەمە چی ئەڵێ؟ یەکێ لە وەزیرانی پاك سروشتی وتی: ئەی پادشام ئەمە ئەڵێ: ﴿وَ الْکَاظِمِینَ الْغَیْظَ وَ الْعَافِینَ عَنِ النَّاسِ﴾[٢] پادشا دڵی نەرم بوو، بـەزەیی پـیا

---

(١) چیرۆك: حەقایەت، حەکایەت، ڕازو ئەفسانە یەکێکن (میتولۆژی) کورد لە چیرۆكو ڕازی کۆنا زۆر دەوڵەمەندە، بەڵام بە داخەوە زۆربەی ئەو شـتانە نـە نـووسراون وە هـەر دەمـاو دەم ئەیگێڕنەوە ئەوەندەی نەماوە تیا بچن و یا بیانی بە ناوی خۆیەوە بە نەختێ ئاڵو گۆڕەوە بـیان نووسن، ـ«ك».

(٢) پـیاوانـی گـەورە دەبـەخشن تـاوان          قین دەخۆنەوە کاتی ڕق هەستان، ـ«ك».

باب اول:

# در سیرت پادشاهان

## حکایت [۱]

پادشاهی را شنیدم که به کشتنِ اسیری اشارت کرد. بیچاره در حالتِ نومیدی به زبانی که داشت مَلِک را دشنام دادن گرفت و سَقَط گفتن که گفته‌اند: هرکه دست از جان بشوید هرچه در دل دارد بگوید.

إِذَا يَــئِسَ ٱلْإِنْسَــانُ طَـالَ لِسَــانُهُ　　　كَسِنَّوْرٍ مَغْلُوبٍ يَصُولُ عَلَى ٱلْكَلْبِ

***

وقتِ ضرورت چو نــمانَد گــریز　　　دست بگــیرد ســرِ شــمشیرِ تــیز

مَلِک پرسید که چه می‌گوید. یکی از وزرای نیک‌محضر گفت: ای خداوندِ جهان همی گوید: [وَ] ٱلْكَاظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ. مَلِک را رحمت در دل آمد و از سرِ خونِ

هاتەوە، دەستی لە کوشتنی هەڵگرت. وەزیرێکی تری لەگەڵ ئەم وەزیرەدا ناڕێك بوو، وتی: بۆ ئێمە ناشێ لە خزمەت پادشادا بەڕاستی نەبێ بدوێین. ئەمە جنێوی بە پادشاداو ناشایستی وت. پادشا لەم وتارە وەك ژێی کەوان هاتەوە یەكو وتی: ئەو درۆیەی ئەو لای ئێمە پەسندتر بوو لەم ڕاستەی تۆ وتت، چونکە درۆکەی ئەو ڕووی لە ئاسایش بوو وە کەڵکی هەبوو، وە ڕاستەکەی تۆ بینای لەسەرپیسی بوو. زانایان وتوویانە درۆ بۆ ئاسایش، چاترە لە ڕاستی بۆ ئاشووب.

شا بە گوفتاری تۆ بکا کردار　　　داخە، چاکی نەبێ بکەی گوفتار

لە تاقی هەیوانی فەرەیدوون نووسرابوو:

جیهان بێ بەقایەو نییە پایدار
ئەگەر عاقڵی دڵ بدە کردگار
لە دنیا مەکە تەکیەوو پاڵی پشت
گەلێ چەشنی تۆی پێگەیاند گورجی کوشت
لە ڕۆیشتنا وەك یەکە گیانی پاك
لەسەرتەختە مردن وەیا ڕووی خاك

## چیرۆك (۲)

یەکێ لە پادشایانی خوراسان سوڵتان مەحمودی کوڕی سەبوکتەگینی لە خەوا دی، هەموو ئەندامەکانی بووبوون بە خاك، مەگەر چاوەکانی، هەروا لەکالانەی چوایا ئەگەڕانو تەماشایان ئەکرد. زانایانو حەکیمان لە مەعنای ئەم خەوە سەرسام بوون، دەروێشێ مەعنای لێ دایەوە وتی: ئێستاش دڵتەنگو ڕەنجیدەیە چونکە موڵکەکەی بە دەستی ئەمو ئەوەوەیە.

گەلێ نامەوەرمردو ڕووی کردە گۆڕ　　　لەسەرڕووی زەمینا نیشانی نەما
کە لاکی گەلێ کەس سپێررا بەخاك　　　ڕزی پێستو ئێسقانەکانی نەما
عەدڵ ناوی نەوشیرەوانی ژیاند　　　ئەگەرچی دەمێکە ژیانی نەما
هەڵێکە، زەمان کۆششی چاکە کە　　　لە پڕ بانگ ئەکەن وا فلانی نەما

او درگذشت. وزیرِ دیگر که ضدّ او بود گفت: ابنای جنسِ ما را نشاید در حضرتِ پادشاهان جز براستی سخن گفتن. این مَلِک را دشنام داد و سقط گفت. مَلِک روی از این سخن در هم کشید و گفت: مرا آن دروغ پسندیده‌تر آمد از این راست که تو گفتی که روی آن در مصلحتی بود و بنای این بر خُبثی. و خردمندان گفته‌اند: دروغی مصلحت‌آمیز به از راستی فتنه‌انگیز.

هرکه شاه آن کند که او گوید — حیف باشد که جز نکو گوید

بر طاقِ ایوانِ فریدون نِبشته بود:

جهان، ای برادر، نماند به کس — دل اندر جهان آفرین بند و بس
مکن تکیه بر مُلکِ دنیا و پشت — که بسیار کس چون تو پرورد و کُشت
چو آهنگِ رفتن کند جانِ پاک — چه بر تخت مردن، چه بر روی خاک

## حکایت [۲]

یکی از ملوکِ خراسان محمودِ سبکتگین را به خواب چنان دید که جمله وجودِ او ریخته بود و خاک شده مگر چشمانِ او که هم‌چنان در چشم‌خانه می‌گردید و نظر می‌کرد. سایرِ حکما از تأویلِ آن فرو ماندند مگر درویشی که به‌جای آورد و گفت: هنوز نگران است که مُلکش با دگران است.

بس نامور به زیرِ زمین دفن کرده‌اند
کز هستیش به روی زمین بر، نشان نماند
وان پیر لاشه را که سپردند زیرِ خاک
خاکش چنان بخورد کز او استخوان نماند
زنده‌ست نامِ فرّخِ نوشیروان به خیر
گر چه بسی گذشت که نوشیروان نماند
خیری کن ای فلان و غنیمت شمار عمر
زان پیشتر که بانگ برآید فلان نماند

## چیرۆك (٣)

بیستم شازادەیەك کورتە باڵاو بێ ڕواڵەت بوو، براکانی باڵابەرزو لاو چاك بوون. جارێکیان باوکی بە ڕووگرژیو بە سووکی سەیری کرد. کوڕە وریا بوو، تێ گەیشت. وتی: بابە! کورتە باڵایەکی خێرۆمەند،[1] چاکترە لە درێژێکی بێ خێری بڵند. وە نەبێ هەرچی باڵای بەزرتر بێ نرخی زیادتر بێ (مەڕ پاکەو فیل پیسە).

اَقَلُّ جِبالِ الْاَرضِ طُورٌ وَ اِنَّـهُ      لَاَعْظَمُ عِندَاللّٰهِ قَدراً وَ مَـنْزِلاً

(بچوکترینی کێوانی زەوی کێوی توورە، کەچی قەدرو پایەی لای خوا لە هەموو چیاکان بەرزترە).

بۆچ نەت بیستووە ڕۆژێ لە ڕۆژان دانایەکی زەبوون بە نادانیکی مل هوڕی وت:

ئەسپ تا ناو قەدی باریك بێ چاکە      لە ڕۆژی شەڕ نەوەك گایێکی ئەستوور[2]

باوکی پێکەنیو پیاوانی دەوڵەت شادمان بوون و براکانی دڵگیر.

بێ دەنگ بێ کەسێ، گرانە بکەیت      کورتیو هونەری لە یەکتری جیا

هەر بێشە مەزانە وا بە تاڵە      ڕەنگە کە پڵنگێ نووستبێ تیا

بیستم لەو ڕۆژانەدا دوژمنێکی زۆرو بێ ئەمان هاتە سەر پادشا. کاتێ هەردوو سوپا بەرامبەر یەك وەستانو پیاوانی جەنگ بانگ کران بۆ شەڕ، یەکەم کەس هەڵی کوتایە مەیدان ئەو کوڕە بوو وتی:

گەر کەسێکت دی کە پشتی کردە شەڕ من نیم ئەوە

من ئەوەم سەیری سەرێکت کرد کە نوقمی خوێنو خاك

مەردی جەنگاوەر بە خوێنی ئاڵی خۆی یاری ئەکا

هەرکەسێ ڕای کرد لە جەنگا لەشکرێکی کرد هیلاك

ئەمەی وتو دای بەسەر سوپای دوژمنا. چەند پاڵەوانێکی کوشتو گەڕایەوە. خاکی ژێر پێی باوکی ماچ کردو وتی:

---

(١) خیرەدمندیش ئەبێ بوترێ، ـ «ك».

(٢) وەرگێڕانی شیعرێ لە دوو شیعری چیرۆکە کە داکەوتووە:

ئەوەت بیستوون، لەڕێ زانا وتوویە      بە گەوجێکی قەڵەو دەرسێکی مەشهوور

کە بۆ شەر ئەسپی باریكو تونو تیژ      نە گایێکی زەبەللاحو مەلەستوور، ـ «ك».

## حکایت [۳]

مَلِک‌زاده‌ای را شنیدم که کوتاه بود و حقیر و دیگر برادرانش بلند و خوب‌روی. باری پدر به کراهیت و استحقار در وی نظر همی کرد. پسر بفراست و استبصار به‌جای آورد و گفت: ای پدر، کوتاهِ خردمند به از نادانِ بلند، نه هرچه به قامت مهتر به قیمت بهتر. أَلشّاةُ نَظیفَةٌ وَ اَلْفیلُ جِیفَةٌ.

أَقَلُّ جِبالِ اَلْأَرْضِ طُورٌ وَ إِنَّـهُ		لَاَعْظَمُ عِنْدَ اَللّٰهِ قَدْراً وَ مَنْزِلاً

***

آن شـنیدی کـه لاغـری دانـا		گفت بـاری بـه ابـلهی فـربه
اسبِ تازی اگـر ضـعیف بـوَد		هم‌چنان از طـویله‌ای خـر بـه

پدر بخندید و ارکانِ دولت بپسندیدند و برادران به جان برنجیدند.

تـا مـرد سـخن نگـفته بـاشد		عـیب و هـنرش نـهفته بـاشد
هر بیشه گمان مبر کـه خـالی است		بـاشد کـه پـلنگْ خـفته بـاشد

شنیدم که مَلِک را در آن مدّت دشمنی صعب روی نمود. چون لشکر از هردو طرف روی در هم آوردند اوّل کسی که اسب در میدان جهانید این پسر بود و گفت:

آن نه من بـاشم کـه روزِ جـنگ بـینی پشتِ مـن
آن منم گـر در مـیانِ خـاک و خـون بـینی سـری
کان که جنگ آرد به خونِ خـویش بـازی مـی‌کند
روزِ میدان، وان کـه بگـریزد بـه خـونِ لشکـری

این بگفت و بر سپاهِ دشمن زد و تنی چند مردانِ کاری بینداخت. چون پیش پـدر بازآمد زمینِ خدمت ببوسید و گفت:

ئەی ئەو کەسە سەیرت کە ئەکردم بەکەم‌و سووك

وا تێ مەگە زل خاوەنی مەردی‌و هونەری بێ

بۆ شەڕ دەس ئەدا ئەسپی ڕەسەن ناو قەدی باریك

گا جووتێ کە دابستە بێ کێ دی سەمەری بێ

ئەگێڕنەوە سوپای دوژمن زۆر بوو ئەمان کەم. دەستەیەك تەمای ڕاکردنیان هەبوو. کوڕە تێی گرماندن وتی: ئەی دلێران تێ کۆشن تا جل‌و بەرگی ژنان نەپۆشن. بە جارێ پەلاماریان برد. هەر لەو ڕوژەدا سوپای دوژمنیان شکاند. باوکی ناو چاوانی ماچ کردو گرتیە باوەش. ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر تەماشای ئەکرد، هەتا کردی بە جێ‌نشینی خۆی. براکانی بەخێلی‌یان پێ برد، زەهریان بۆ کردە ناو خواردنەوە، خوشکێکی ئاگادار بوو دوودەری دا بەیەکدا. کوڕە تێ گەیشت، دەستی لە خواردن هەڵ‌گرت‌و وتی: ناشێ هونەرمەندان بمرن‌و بێ‌هونەران جێگەی ئەوان بگرنەوە.

هیچ‌کەس ناچێتە سایەی کوندەبوو    با لە دنیاشا نەمێنێ هیچ هوما

باوکیان لەم کەین‌و بەینە ئاگادار کرد. براکانی بانگ کردو هەریەکە شایانی خۆی شەپازلەی وەرگرت. جا هەر یەکە شتێکی بۆ دیاری کردو ڕوو بەو شوێنە ڕەوانەی کردن. بەم جۆرە ئاشووبی دامرکاندەوەو ئاگری کوژاندەوە.[وتوویانە:] دە دەروێش لەسەرگلیمێ جێ‌یان ئەبێتەوەو، دوو پادشا لە ئیقلیمێ پێکەوە ناگونجێن.

پیاوی خوا نانێکی بێ نیوەی ئەخوا    نیوەکەی کەی ئەو ئەداتە بە بێ‌نەوا

پادشا گەر وڵگەیێکی دەس‌کەوێ    تێری پێ ناخوات‌و وڵگەی[1] کەی ئەوێ

## چیرۆك (٤)

دەستەیەك لە دزانی عەرەب سەرشاخێکیان گرتبوو، ڕێگەی کاروانیان بردبوو بەست. دانیشتووانی شاران لە فێڵ‌و تەڵەکەیان هەراسان بوون، لە هەر شەڕێکا لەشکری پاشایان ئەشکاند، چونکە لەسەرکێوێکی بەرز قەڵایەکی قایمیان درووست کردبوو. داناکانی ئەو وڵاتە کەوتنە ڕاوێژ، وتیان: ئەمانە ئیشیان هەروا بمێنێ دەسەڵات‌و زۆریان پەرەئەسێنێ، ئیتر بەرامبەری‌یان ناکرێت.

---

(١) وڵگە: خاك، کیشوەر، وڵات، زید.

ای که شخصِ مَنَت حقیر نمود  تا درشتی هنر نپنداری
اسبِ لاغرمیان بکار آید  روزِ میدان، نه گاوِ پرواری

آورده‌اند که سپاهِ دشمن بی‌قیاس بود و اینان اندک. طایفه‌ای آهنگِ گریز کردند. پسر نعره‌ای زد و گفت: ای مردان بکوشید یا جامه‌ی زنان بپوشید. سواران را به گفتِ او تهوّر زیادت گشت و به یک بار حمله بردند. شنیدم که هم در آن روز بر دشمن ظفر یافتند. مَلِک سر و چشمش ببوسید و در کنار گرفت و هر روز نظر بیش کرد تا ولی‌عهدِ خویش کرد. برادران حسد بردند و زهر در طعامش کردند. خواهرش از غُرفه بدید دریچه بر هم زد. پسر دریافت و دست از طعام بازکشید و گفت: مُحال است که هنرمندان بمیرند و بی‌هنران جای ایشان بگیرند.

کس نیاید به زیرِ سایه‌ی بوم  ور همای از جهان شود معدوم

پدر را از این حال آگهی دادند. برادرانش را بخواند و گوشمالی به واجب بداد. پس هریک را از اطرافِ بلاد حصّه‌ای مَرضیّ معیّن کرد تا فتنه بنشست و نزاع برخاست که گفته‌اند: ده درویش در گلیمی بخسبند و دو پادشاه در اقلیمی نگنجند.

نیم‌نانی گر خورد مردِ خدای  بذلِ درویشان کند نیمی دگر
مُلکِ اقلیمی بگیرد پادشاه  همچنان در بندِ اقلیمی دگر

## حکایت [۴]

طایفه‌ای دزدانِ عرب بر سرِ کوهی نشسته بودند و منفذِ کاروان بسته و رعیّتِ بُلدان از مکایدِ ایشان مرعوب و لشکرِ سلطان مغلوب. به حُکمِ آن که ملاذی منیع از قلّه‌ی کوهی به دست آورده بودند و ملجأ و مأوای خود کرده. مدبّرانِ ممالکِ آن طرف در دفعِ مضرّتِ ایشان مشورت کردند که اگر این طایفه هم بر این نَسَق روزگاری مداومت نمایند مقاومت ممتنع گردد.

نـەمامێ کـە تـازە ڕوابـێ ئـەگـەر یەکێ دەستی دایە بەهێز، دێتـەدەر
ئەگەر لێی گەڕێت تا ڕەگو بن ئەنێ زەمانە لە جێی خۆی هەلێ ناکەنێ
بەری جۆگە ئاسانە بگـری بـە بـێڵ بوار نادا گەر لێی گەڕێی بێ بە سێڵ

بەم جۆرە بڕیاریان دا یەکێکیان ناردە ناویان هەتا هەلێکیان بۆ دەس ئەکەوێ، ئەم پیاوە لە ناویانا ماویەوە، تا ڕۆژێ چوونە سەر تیرەیەكو جێگـە کـەی خـۆیـان چـۆڵ کـردبوو. کۆمەڵێ لە پاڵەوانان خۆیان پڕ چەك کردوو ڕۆیشتن لە نزیك قەڵاکەیان خۆیان لە پۆسە[1] دا. کاتێ دزەکان بە تاڵانەوە گەڕانەوە جێی خۆیان، تاڵانیان هەڵڕشتو چەکیان دانا، یەکەم دوژمنێ کە دای بە سەریانا خەو بوو تا هەندێ لە شەو بە سەر چوو.

جورمی ڕۆژ کەوتە دەمی سـیایی یونـسی قووتدا مـاسیی دەلیـایی

دلاوەران لە پۆسە هاتنە دەرەوە پەلاماریان دا هەموو دەسگیر کرانو یەکەیەکە باڵیان بەستراو هێنانیان بۆلای پادشا. پادشا فەرمانی دا بە کوشتنیان. دەس کرا بە کوشتنیان، هەتا یەکێ مابوو هێنایانە مەیدانی کوشتن. نەوجوانێ بوو تازە پێ گەیشتوو. یەکێ لە وەزیران پێچکەی تەختی پادشای ماچ کردو وتی: پادشاهم ئەم نەو جـوانـە لە بـاخی کـامەرانـی بەرخوردار نەبووەو خۆشی لە ژیان نەدیوە. هیوام بە ڕەوشتی شـیرینی تـۆ وەهـایە ئـەم گەنجە ببەخشیو ئەم کۆیلەیەی خۆت دڵشاد بکەیت. پادشا لەم وتارە هاتەوە یەك چونکە ڕێکی بیرو باوەڕی بەرزی ئەو نەبوو، وە فەرموویانە:

لە چاکە دوورە بـەد ڕەگـەزو پـیاوی جـەربەزە
نا ئەهلو تەربیەتی بە مەسەل گوێزو گـومەزە

وا چاکە ئەمانە بناغەیان لە بن دەربێنی چونکە ئاگر کوژاندنەوەو پشکۆ بەجێ هێشتن، مار کوشتنو توولەمار بەخێو کردن فەرمانی هۆشیاران نییە.

بە خوڕژم هەور ئەگەرچی ئاوی هۆی ژینە ئەبارێنێ
کەسێ نەیدیوە داری بـی کـە ڕۆژێ مـیوە بـڕوێنـێ

---

(١) خۆیان لە «پۆسە»دا واتە: خۆیان داشارد، کەمینیان دانا، پۆسو پۆستە بە مانای قـەڕەوڵ، کێشک، کەوڵ، چەرمو چەپەر، هاتووە.

درختی که اکنون گرفته‌ست پای　　به نیروی مردی برآید ز جای

وَرَش هم‌چنان روزگاری هِلی　　به گردونش از بیخ برنگسلی

سرِ چشمه شاید گرفتن به بیل　　چو پُر شد نشاید گذشتن به پیل

سخن بر این مقرّر شد که یکی را به تجسّسِ ایشان برگماشتند و فرصت نگه داشتند تا وقتی که بر سرِ قومی رانده بودند و مکان خالی مانده، تنی چند مردانِ واقعه‌دیده‌ی جنگ‌آزموده را بفرستادند تا در شِعْبِ جَبَل پنهان شدند. شبانگاه که دزدان باز آمدند سفر کرده و غارت آورده سِلاح بگشادند و رختِ غنیمت بنهادند نخستین دشمنی که بر سرِ ایشان تاخت خواب بود. چندان که پاسی از شب درگذشت،

قرصِ خورشید در سیاهی شد　　یونس اندر دهانِ ماهی شد

مردانِ دلاور از کمینگاه به در جستند و دستِ یکان یکان بر کتف بستند و بامدادان به درگاهِ مَلِک حاضر آوردند. ملک همه را به کشتن فرمود. در آن میان جوانی بود میوه‌ی عُنفُوانِ شبابش نو رسیده و سبزه‌ی گلستانِ عذارش نو دمیده. یکی از وزرا پای تختِ مَلِک را بوسه داد و روی به شفاعت بر زمین نهاد و گفت: این پسر هم‌چنان از باغِ زندگانی بر نخورده و از رَیْعانِ جوانی تمتّع نیافته. توقّع به کرم و اخلاقِ خداوندی چنان است که به بخشیدنِ خونِ این جوان بر بنده منّت نهد. مَلِک روی از این سخن در هم کشید و موافقِ رای بلندش نیامد و گفت:

پرتوِ نیکان نگیرد هرکه بنیادش بدست

تربیت نا اهل را چون گِردکان بر گنبدست

نسلِ فسادِ اینان منقطع کردن اولی‌ترست و بیخ و تَبارِ ایشان برآوردن که آتش وانشاندن و اخگر گذاشتن و افعی کشتن و بچه نگاه داشتن کارِ خردمندان نیست.

ابر اگر آبِ زندگانی بارد　　هرگز از شاخِ بید برنخوری

لەگەڵ ئینسانی بەد خوو تۆ مەفەوتێنە ژیانی خۆت

لە قامیشی حەسیر کێ تۆزێ شەکری توانی دەربێنێ

وەزیر بە خۆشیو ناخۆشی وتاری پادشای پەسەندکردو ئافەرینی لێ کرد. بەڵام وتی: بەڵێ ئەوەی پادشا فەرمووی وەهایە، ئەگەر لەگەڵ ئەو بەد سروشتانەی ڕابواردایە پەیڕەوی ئەوانی ئەکردو ئەبوو بە یەکێ لەوان. بەڵام ئەم کۆیلەیە هیواداره ئەگەر لەگەڵ ڕەوشت چاکانا ڕاگیرێتو ئاگاداری بکرێت، خووڕەوشتی هۆشیاران ئەگرێت. ئەمە هێشتا مناڵە، مێشکی بۆ وەرگرتنی چاکە بەتاڵە. سەرکەشی ئەو بەد سروشتانە دەماری تیادانەکوتاوە. حەدیس ئەفەرموێت: «كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، وَ اَبَواهُ يُهَوِّدانِهِ، اَوْ يُنَصِّرانِهِ اَوْ يُمَجِّسانِهِ» واتە: (هەموو مناڵێ لەسەرسروشتی ڕاستی لە دایك ئەبێ. باوكو دایکی یا ئەیکەن بە جوولەکە یا بە گاور یا بە ئاگرپەرست).

بوو بە هاوڕێی خراپەکەر کوڕی نووح      خانەدانی پەیامبەری فەوتان

سەگی یارانی غار چەند ڕۆژێ      کەوتە دوای چاکەکان بووە ئینسان

کە وەزیر ئەوەی وت، کۆمەڵێ لە هاونشینانی شا، یاریدەی وەزیریان داو بوون بە تکا کار لەگەڵیا. پادشا وتی: وا بەخشیم بە ئێوە، هەرچەند لەلام باش نەبوو.

چی بە ڕۆستەم وت ئەزانی پیرە زاڵ      سووكو بێچارە نەبێ دوژمن لەلات

ئاوی کانی وردە وردە زۆر ئەبێ      تا بەجارێ وشترو باری ئەبات

بەکورتی ئەم کوڕەیان بەناز پەروەردە کردو مامۆستایان بۆ ڕاگرت، وە بۆ ڕابواردنی ناو دیوانی پادشا چی پێویست بوو فێریان کرد، تا ئەندازەیەك لەلایەن گەورەیانەوە پەسەند کرا. ڕۆژێ وەزیر ڕەوشتی جوانو خووی بەرزی ئەم کوڕەی بۆ پادشا ئەگێڕایەوە، وتی: قوربان بە تەواوی خووی ئەوانی لێ دوور کەوتوەتەوەو، شێوەی چاکانی گرتووە. پادشا زەردە خەنەیەك گرتیو گوتی:

بێچوە گورگ هەرگیز نابێ بە بەشر      هەرچەند لەگەڵ پیاو ژین بەرێتە سەر

چەند ساڵێکی بەسەرا چوو. کۆمەڵێ لە دزو درۆزنانی گەڕەك لێی کۆبوونەوەو، بڕیاری هاوڕێیی و برادەرییان لەگەڵدا . تا لە هەلێکا وەزیرو هەردوو کوڕەکەیان کوشتو چی

بـــا فــرومایه روزگــار مــبر　　　　کز نیِ بوریا شکــر نــخوری

وزیر این سخن بشنید. طَوعاً و کَرهاً بپسندید و بر حُسنِ رای مَلِک آفرین خوانـد و گفت: آن‌چه خداوند، دَامَ مُلْکُهُ، فرمود عینِ مصلحت است و حقیقت که اگر در سِلکِ صحبتِ آن بَدان منتظم ماندی طبیعتِ ایشان گرفتی امّا بنده امیدوارست که به عشرتِ صالحان تربیت پذیرد و خوی خردمندان گیرد که هنوز طفل است و سیرتِ بغی و عنادِ این گروه در نهادِ او متمکّن نشده؛ و در حدیث است: **مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا وَ قَدْ يُولَدُ عَلَى اَلْفِطْرَةِ فَأَبَواهُ يُهَوِّدانِهِ أَو يُنَصِّرانِهِ أَو يُمَجِّسانِهِ.**

با بـدان یـار گشت هـمسرِ لوط　　　　خـــاندانِ نـــبوّتش گـــم شـــد
سگِ اصحابِ کهف روزی چـند　　　　پیِ نیکان گـرفت و مـردم شـد

این بگفت و طایفه‌ای از ندمای مَلِک با وی به شفاعت یار شدند تا مَلِک از سرِ خونِ او درگذشت و گفت: بخشیدم اگرچه مصلحت ندیدم.

دانی که چـه گـفت زال بـا رسـتمِ گُـرد　　　　دشـمن نـتوان حـقیر و بـیچاره شـمرد
دیدیم بسی، که آبِ سرچشـمه‌ی خُـرد　　　　چـــون بـیشتر آمـد شـتر و بـار بـبرد

فی الجمله پسر را به ناز و نعمت برآوردن گرفت و استادِ ادیب به تربیتِ او نصب کرد تا حُسنِ خطاب و رَدِّ جوابش درآموخت و سایرِ آدابِ خدمتِ ملوکش تعلیم کرد چنان که در نظرِ بزرگان پسند آمد. باری وزیر از شمایلِ او در حضرتِ سلطان شمّه‌ای می‌گفت که تربیتِ عاقلان در او اثر کرده است و جهلِ قدیم از جِبِلّتِ او به در برده. مَلِک را از این سخن تبسّم آمد و گفت:

عاقبت گـرگ‌زاده گـرگ شـود　　　　گر چه بـا آدمـی بـزرگ شـود

سالی دو بر این برآمد. طایفه‌ی اَوباشِ محلّت در او پیوستند و عقدِ مرافقت بستند تا به وقتِ فرصت وزیر و هردو پسرانش را بکشت و نعمتی بی‌قیاس برداشت و به مغاره‌ی

سامانی هەبوو هەموویان بردوو ڕوویان کردە لوتکەی شاخەکە. شوێنی جەردەکانیان گرتەوەو یاخی بوون. پادشا پەنجەی پەشیمانیی بە دان گەستو وتی:

لە ئاسن هیچ کەسێ شمشێری چاکی لێ نەگرتە دەس
بە زەبری تەربیەت کێ دیویە نا ئەهلێ ببێتە کەس
سروشتی پاکی باران لای هەموو دانایە ڕووناکە
لە خاکا لالە ئەڕوێنێو، لە شۆرە دڕکو داڵو بەس

* * *

زەمینی شۆرەکات گوڵ ناڕوێنێ    خەریك بوونت لەگەڵیا نارەوایە
لەگەڵ ئینسانی پیسا، چاکە، هەروەك    خراپە دەر حەقی چاکان وەهایە

## چیرۆك (٥)

سوپاسالار زادەیەکم لە سەرای ئوغلەمیش شا دا دی، بە فامو هۆشو تێگەیشتوو وریا. لە جوانی‌یا نموونەی زیرەکی‌و عەقڵ لە ناوچاوانیا ئەدرەوشایەوە.

لە بەر هۆشمەندی لە باڵای سەر    ستارەی بلندی بوو شوعلەوەر

بەکورتی لە بەر چاوی پادشاپەسەندهات، چونکە جوانی‌و شێوەو ڕەوشتی، هەردوکیان یەکیان گرتبوو. پیاوانی ژیر فەرموویانە: دەوڵەمەندی بەدڵە نەوەك بەماڵ، گەورەییش بە عەقڵە نەوەك بەساڵ.

هاوڕێیانی بەو پایە بەرزەی حەسەدیان بردو بە خەیانەت لەکەداریان کرد، وە بۆ بەکوشت دانی کۆششێکی گەورەیان نواند، [بەلام بێسوود بوو].

هەتاکوو دۆستی من وا میهرەبانە    چ باکم جرتو فرتی دوژمنانە

پادشا لێی پرسی: هۆی دوژمنایەتی ئەمانە چییە؟ وتی: لە سایەی دەوڵەتی پادشای گەورەوە، خوا موڵکی پایەدارکات، توانیومە دڵی هەموان بهێنمە جێ، حەسوودان نەبێ کە دڵیان بەجێ نایەت بە نەمانی نیعمەتی من نەبێت کە لە سایەی دەوڵەتی ئەو خاوەن شکۆیەدا هەر بمێنێ!

دزدان به‌جای پدر بنشست و عاصی شد. مَلِک دستِ تحیّر به دندان گزیدن گرفت و گفت:

شمشیرِ نیک از آهنِ بد چون کند کسی؟
ناکس به تربیت نشود، ای حکیم، کس
باران که در لطافتِ طبعش خلاف نیست
در باغ لاله روید و در شوره بوم خس

***

زمینِ شوره سنبل بر نیارد　　در او تخم و عمل ضایع مگردان
نکویی با بدان کردن چنان است　　که بد کردن به‌جای نیک‌مردان

## حکایت [۵]

سرهنگ‌زاده‌ای بر درِ سرایِ اِغْلَمِش دیدم که عقل و کیاستی و فهم و فِراستی زایدالوصف داشت، هم از عهدِ خُردی آثارِ بزرگی در ناصیه‌ی او پیدا.

بالای سرش ز هوشمندی　　می‌تافت ستاره‌ی بلندی

فی‌الجمله مقبولِ نظرِ سلطان آمد که جمالِ صورت و معنی داشت و حکما گفته‌اند: توانگری به هنرست نه به مال، و بزرگی به عقل است نه به سال. اَبنایِ جنسِ او بر منصبِ او حسد بردند و به خیانتی متّهم کردند و در کشتنِ او سعیِ بی‌فایده نمودند: دشمن چه زند چو مهربان باشد دوست؟

مَلِک پرسید که موجبِ خصمیِ اینان در حقِ تو چیست؟ گفت: در سایه‌ی دولتِ خداوندی، دامَ ظِلُّهُ، همگنان را راضی کردم مگر حسود را که راضی نمی‌شود الاّ به زوالِ نعمتِ من؛ و اقبال و دولتِ خداوند باد!

لە دەستم دێ نەڕەنجێنم دڵی کەس  بەڵام چ بکەم حەسوود خۆی کۆڵەوارە[1]
دە بمرە ئەی حەسوودا ڕزگاربی بەڵکو  هەتا نەمری، دڵت هەر پڕ جە خارە

* * *

بەد سروشتان کەی هەیانە ئارەزوو
هیچ کەسێ دەستی کەوێ سامانو جاە
شەمشەمەکوێرە ئەگەر نابینێ ڕۆژ
ڕۆژی ڕەخشان چی هەیە سووچو گوناە
سەد هەزار چاوی وەها کوێر بێتو نەك
ڕۆژی ڕوونـاك ون بکات پەردەی سیاە

## چیرۆك (٦)

لە پاشایەکی عەجەم ئەگێڕنەوە کە دەستی جەورو ستەمی بۆ ماڵی هۆزەکەی درێژ کردبوو، وە ئەوگەلە بەسەزمانەی بە جەورو ستەم داگیر کردبوو. هەتا ئەندازەیەك [کە] بۆ ڕزگاری دەستیان کرد بە چۆڵ کردنی وڵاتو ڕێگای دەربەدەری‌یان گرتەبەر. کاتێ دەغڵو دان ڕووی کردە کەمیو گەنجینەی پادشا بێ ماڵو بەتاڵ مایەوە دوژمنانی وڵات بەهەلیان زانی، لە هەرلاوە پەلاماریان هێنا.

کەسێ مەیلی هەیە فریاڕەسی بێ ڕۆژی جەنگو شەڕ
لە کاتی شێنەیی خزمەت بکا، چی ژێرە دەستانە
غولامی حەڵقەگوێی خۆت گەر نە لاوێنی ئەبێ یاخی
بە لاواندن ئەبێتە حەڵقەگوێی تۆ خێوو بێگانە

ڕۆژێ لە دیوانی پادشا نامەیان ئەخوێندەوە، باسیان لە زۆرداری زوحاكو دەوری فەرەیدوون ئەکرد. وەزیر لە پادشای پرسی: هیچ ئەتوانی بزانی فەرەیدوون کە گەنجو

---

(١) لە وەرگێڕانەکەی خۆما بۆ گولستان، لەم حەکایەتەدا ئەم دوو بەیتییەشم هێناوە:
هەڵو هەرزە هەڵو شاشە حەیایان  وەفا قاتە خەتا زاتە، لە لایان
بەزاتی خوا ئەوەن پەستو ڕەزیلن  تەڵو داون لەبەر پێی ئاشنایان، ـ«ك».

**تــوانــم آن کــه نــیازارم انـدرونِ کسـی**

**حسود را چه کنم کو ز خود بـه رنـج دَرست؟**

**بمیر تا برهی، ای حسود، کـاین رنـجی است**

**که از مشقّتِ آن جز بـه مـرگ نـتوان رست**

***

| | |
|---|---|
| **شــوربختان بـــه آرزو خـــواهـند** | **مُـــقبلان را زوالِ نـــعمت و جـــاه** |
| **گـر نـبیند بـه روز شب‌پـره چشـم** | **چشـــمه‌ی آفــتاب را چـــه گـناه؟** |
| **راست خواهـی، هـزار چشـم چـنان** | **کـــور بـــهتر کـــه آفــتاب سـیاه** |

## حکایت [۶]

یکی را از ملوکِ عجم حکایت کنند که دستِ تطاول به مالِ رعیّت دراز کرده بود و جور و اذیّت آغاز کرده تا به جایی که خلق از مکایدِ ظلمش به جهان برفتند و از کُربتِ جَورش راهِ غربت گرفتند. چون رعیّت کم شد ارتفاعِ ولایت نقصان پذیرفت و خزینه تهی ماند و دشمنان زور آوردند.

**هــرکه فـریادرسِ روزِ مـصیبت خـواهـد**

**گو در ایّامِ سلامت به جـوان‌مـردی کـوش**

**بــنده‌ی حــلقه بگـوش ار نـنوازی بـرود**

**لطف کن لطف که بیگانه شود حلقه بگوش**

باری، در مجلسِ او، کتابِ شاهنامه می‌خواندند در زوالِ مـملکتِ ضحّاک و عـهدِ فریدون. وزیر مَلِک را پرسید: هیچ توان دانست فریدون که گنج و مُلک و حَشَم نداشت

سامانی نەبوو ولاتی چۆن بۆ دامەزرا؟ پادشا وتی: وەکوو گوێت لێ بوو عالەمی لێ کۆ بوونەوەو پشتیوانییان کردو پادشایی دەسکەوت. وەزیر وتی: ئەی کە ئەزانی کۆ بوونەوەی عالەم پادشایی دەس ئەخات بۆچی عالەم لە خۆت ئەتەکێنێتەوەو دەربەدەریان ئەکەیت؟ هەڵبەت هیوای پادشایەتیت نییە.

وەها چاکە بیکەی سوپا پەروەری | کە پاشا بە لەشکەر ئەکا سەروەری

پادشا وتی: هۆی کۆکردنەوەی گەل و سوپا چییە؟ وەزیر وتی: سوپا لە پادشا بەخشش کۆ ئەبێتەوە، وە پادشا ئەبێ دڵنەرم و بە ڕەحم بێ هەتا لە ژێر سایەیا بە ئاسایش و دڵنیا بژین. تۆ ئەم دوانە هیچیانت نییە.

کەی ستەمکارییە لە سوڵتانی؟ | کێ بە گورگی سپاردووە شوانی؟[1]

پادشایەك درەختی جەوری ڕواند | پایەیی تەخت و تاجی خۆی رووخاند

ئەم ئامۆژگارییە ڕێکی سروشتی دروشتی پادشا نەبوو، لێی تووڕە بوو، فەرمانی دا بە وەزیرانی لە بەندیخانەیان توند کرد. زۆری پێ نەچوو ئامۆزایانی پادشا بۆ بەرامبەری کردنی پادشا ڕاست بوونەوە، داوای ولاتی لە باوك جێ ماوی خۆیان کرد. دەستە دەستە ئەوانەی لە ستەمی پادشا دەربەدەر بووبوون لێیان گرد بوونەوەو کۆمەکیان پێ کردن و ولاتیان بۆ داگیر کردن.

شەهێ زۆرو ستەم بێ خووی بەرامبەر ژێر دەستانی
لە جەنگا دۆستانی لێ ئەبێتە دوژمنی گیانی
ئەگەر ڕێك بی لەگەڵ گەل دڵنیابە تۆ لە هەر دوژمن
کە ئەو هۆزە سوپایی پادشایە ڕۆژی مەیدانی

## چیرۆك (٧)

پادشایەك لەگەڵ کۆیلەیەکی عەجەما لە پاپۆڕا دانیشتبوو، کۆیلە دەلیای نەدیبوو، وە سەغڵەتی ناو پاپۆڕی تاقی نەکردبوەوە. کەوتە شیوەن و زاری و هەموو لەشی هاتە لەرزین.

---

(١) گورگی کەڵبەتیژ کێ دێ لە بیری | لەگەڵ بەرخۆلە، پاك بوو بێ شیری
کارو ئیشی گورگ هەرقەساوی یە | چونکە ئەو پیشە پیشەی باوی یە، ـ«ك».

چگونه بر وی مملکت مقرّر شد؟ گفت: چنان که شنیدی خلقی بر او به تعصّب گرد آمدند و تقویت کردند و پادشاهی یافت. پس گفت: ای مَلِک، چون گرد آمدنِ خلقی موجب پادشاهی است تو مر خلق را پریشان برای چه می‌کنی؟ مگر سرِ پادشاهی کردن نداری؟

**همان به که لشکر به جان پروری — که سلطان به لشکر کند سروری**

مَلِک گفت: موجبِ گرد آمدنِ سپاه و رعیّت چه باشد؟ گفت: پادشه را کرم باید تا بر او رعیّت گرد آیند و رحمت تا در پناهِ دولتش ایمن نشینند و تو را این هردو نیست.

**نکند جوژ پیشه سلطانی — که نیاید ز گرگ چوپانی**
**پادشاهی که طرح ظلم افگند — پای دیوارِ مُلکِ خویش بکند**

مَلِک را پندِ وزیرِ ناصح موافقِ طبع نیامد. روی از این سخن در هم کشید و به زندانش فرستاد. بسی برنیامد که بنی‌عمّش به منازعت برخاستند و مُلکِ پدر خواستند. قومی که از دستِ تطاولِ او به‌جان آمده بودند و پریشان شده، بر ایشان گرد آمدند و تقویت کردند تا مُلک از تصرّفِ این به در رفت و بر آنان مقرّر شد.

**پادشاهی کو روا دارد ستم بر زیردست**
**دوستدارش روزِ سختی دشمنِ زورآورست**
**با رعیّت صلح کن وز جنگِ خصم ایمن نشین**
**زان که شاهنشاهِ عادل را رعیّت لشکرست**

## حکایت [۷]

پادشاهی با غلامی عجمی در کشتی نشست و غلام هرگز دریا ندیده بود و محنتِ کشتی نیازموده، گریه و زاری درنهاد و لرزه بر اندامش افتاد. چندان که ملاطفت کردند

پادشا ڕابواردنی لێ تاڵ بوو، دڵخۆشی‌یان ئەدایەوە، ئارامی نەئەگرت. ئەم حاڵە ڕێکی سروشتی ناسکی پادشا نەبوو تێ‌گەیشتوویەك لەو پاپۆڕەدا بوو، وتی: ئەی پادشا ئەگەر وازم لێ‌بێنن ڕێگەی بێ‌دەنگ بوونی ئەمە ئەزانم. پادشا وتی: پیاوەتی‌یەکی گەورەم لەگەڵ ئەکەیت. پیاوە داناکە کۆیلەکەی هەڵگرت و فڕێی‌دایە ناو دەلیاوە، دوو سێ جار نووقم بوو، ئەنجا مووی سەری گرت وهێنایە دەرێ و خستیەوە ناو پاپۆڕەکە. کۆیلەکە بێ‌دەنگ لە قوژبنێکا دانیشت، ئیتر هیچ دەنگی لێوە نەهات. پادشا لەم کردەوەیە سەرسام بوو، پرسیاری لێ کرد: ئەمە چی‌بوو؟ وتی: ئەی پادشا ئەم کۆیلەیە هێشتا ترس و سەغڵەت و نوقم بوونی دەلیای نەدیبوو، لە بەر ئەوە قیمەتی پاپۆڕی نەئەزانی. بەڵا دیدە قیمەتی سەلامەتی ئەزانێ و نەخۆش قیمەتی لەش ساغی.

کە تۆ تێری، لەلای تۆ نانی جۆ ناخۆش و بێ‌تامە

لەلای تۆ ناشیرینە ئەو کەسەی لای من دڵارامە

لەلای حۆری بەهەشت (ئەعراف) یەقین وەك دۆزەخ ئەنوێنێ

لەلای دانیشتوویی دۆزەخ بەهەشتە جێگەی ئیکرامە

* * *

چۆن ئەبێ یەکسان کەسێ گرتوویەتە باوەش نیگار

بۆ کەسێ چاوی لە بەر دەرگا بڕیوە چاوەنواڕ

## چیرۆك (٨)

لە هورمزیان پرسی: لە وەزیرەکانی باوکت چ تاوانێکت دی کە هەموویانت خستە بەندیخانە؟ وتی: تاوانێکی ئاشکرایان نەبوو، بەڵام دیم ترس و سامی من لە دڵیانا زۆر بوو، بە پەیمانی من دڵنیا نەبوون. ترسام بۆ ڕزگاریی خۆیان لەم ترس و هەراسەیان بۆ فەوتانم کۆشش بکەن. پەیڕەوی وتاری حەکیمانم کرد کە وتوویانە:

| | |
|---|---|
| بترسە لەوەی لێت ئەترسێ حەکیم | سەدی وا لەگەڵیا بچێتە نەبەرد |
| ئەبینی پشیلە کە قین بگرێ چون | پڵنگ کوێر ئەکا چاوی دێنێتە دەرد |
| لەوە ئەیگەزێ ئەژدەها قاچی شوان | لە ترسا کە کەللەی نەهاڕێ بە بەرد |

آرام نمی‌گرفت و مَلِک را عیش از او منغّص شد. چاره ندانستند. حکیمی در آن کشتی بود مَلِک را گفت: اگر فرمایی من او را خاموش کنم. گفت: غایتِ لطف باشد. بفرمود تا غلام را به دریا انداختند. باری چند غوطه خورد. مویش گرفتند و سوی کشتی آوردند. دست در خِطامِ کشتی زد. چون برآمد به گوشه‌ای بنشست و آرام یافت. مَلِک را پسندیده آمد گفت: در این چه حکمت بود؟ گفت: اوّل محنتِ غرقه شدن نچشیده بود و قدرِ سلامتِ کشتی نمی‌دانست. هم‌چنین قدرِ عافیت کسی داند که به مصیبتی گرفتار آید.

**ای سیر تو را نانِ جوین خوش ننماید**
**معشوقِ من است آن که به نزدیکِ تو زشت است**
**حورانِ بهشتی را دوزخ بوَد اَعراف**
**از دوزخیان پرس که اَعراف بهشت است**

***

**فرق است میانِ آن که یارش در بر — با آن که دو چشمِ انتظارش بر در**

## حکایت [۸]

هرمز را گفتند: از وزیرانِ پدر چه خطا دیدی که بند فرمودی؟ گفت: خطایی معلوم نکردم ولیکن دیدم که مهابتِ من در دلِ ایشان بی‌کران است و بر عهدِ من اعتمادِ کلّی ندارند ترسیدم از بیمِ گزندِ خویش قصدِ هلاکِ من کنند. پس قولِ حکما را کار بستم که گفته‌اند:

**ازان کز تو ترسد بترس ای حکیم — و گر با چنو صد برآیی به جنگ**
**ازان مار بر پای راعی زند — که ترسد سرش را بکوبد به سنگ**
**نبینی که چون گربه عاجز شود — برآرد به چنگال چشمِ پلنگ؟**

## چیرۆك (٩)

یەکێ لە پادشایانی عەجەم نەخۆش بوو، هیوای ژیانی نەمابوو، لەوکاتەدا سوارێ بە پڕ تاو هات مژدەی دایە کە لە سایەی پادشاوە فڵان قەڵامان گرت و هەموو دوژمنانمان بە دیل گرت. دانیشتووانی ئەو وڵاتە هەموو ئێستا گەردنکەچی فەرمانی پادشان. پادشا هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشاو وتی: ئەم مژدەیە بۆ من نییە، بەڵکوو بۆ دوژمنانی منە کە دوای من وڵاتیان ئەکەوێتە دەست.

| | |
|---|---|
| تەمەنی شیرین بەو هیوایەوە | داخی گرانم وا بڕایەوە |
| کاتێ ئەمدەنێ مژدە بە هیوا | تەمەنی شیرین ناگەڕێتە دوا |

* * *

تەپڵی بارکردن خەریکە لێئەدا دەستی ئەجەل

ئەی دوو چاوی من بکەن ئێوە دوعا خوازی لە سەر

دەست و بازوو قۆڵی من ئێوەیش دوعا خوازی بکەن

یەك لەگەڵ یەکتر ئەوا ئاکامی مەرگم گەییە سەر

مەرگی من بۆ کامی دوژمن دای بە سەرما دۆستان

سا وەرن یەك یەك بە بەرچاوما بکەن ئێوەیش گوزەر

من بە نادانیو نەفامی ڕۆزگارم چوو لە دەست

ئێوە ئاگاداری خۆتان بن ئەمانو ئەلحەزەر

## چیرۆك (١٠)

لە ژوور سەری مەرقەدی یەحیا پێغەمبەردا، سەلامی خوای لێبێ، لە ئیعتیکافا بووم لە شام یەکێ لە پادشایانی عەرەب کە بە بێئینسافی ناوی دەرکردبوو وا ڕێکەوت هاتە زیارەت، نوێژی کردو لە خوا پاڕایەوەو نیازی داوا کرد.

| | |
|---|---|
| کۆیلەی ئەم دەرەن هەژارو زەنگین[١] | بە نیازترن دەوڵەمەندترین[٢] |

---

(١) زەنگین: ساماندار، دەوڵەمەند، ئەم وشە وشەیەکی باکوورییە، ـ«ك».

(٢) لە کتێبی (لە هەر چیمەنێ دیمەنێ) تەرجمەی ئەم شیعرەی سەعدیم ئاوا کردەوە:

چون گەداو هەژار بێ خەرج و واجن — دەوڵەمەن زیاتر بە تۆ موحتاجن، ـ«ك»

## حکایت [۹]

یکی از ملوکِ عرب رنجور بود در حالتِ پیری و امید از زندگانی قطع کرده، که ناگه سواری از در درآمد و مژده آورد که فلان قلعه را به دولتِ خداوند گشادیم و دشمنان اسیر شدند و سپاه و رعیّتِ آن طرف به جملگی مطیعِ فرمان گشتند. مَلِک را نَفَسی سرد از سرِ درد برآمد و گفت: این مژده مرا نیست دشمنانم راست یعنی وارثانِ مملکت.

**در این امید به سر شد، دریغ! عمرِ عزیز**
**که آن‌چه در دلم است از درم فراز آید**
**امیدِ بسته برآمد ولی چه فایده زانک**
**امید نیست که عمرِ گذشته باز آید**

***

**کوسِ رحلت بکوفت دستِ اجل — ای دو چشمم وداعِ سر بکنید**
**ای کفِ دست و ساعد و بازو — همه تودیعِ یکدگر بکنید**
**بر منِ اوفتاده دشمن کام — آخر، ای دوستان، گذر بکنید**
**روزگارم بشد به نادانی — من نکردم شما حذر بکنید**

## حکایت [۱۰]

بر بالینِ تربتِ یحیی پیغامبر، علیه‌السّلام، معتکف بودم در جامعِ دمشق که یکی از ملوکِ عرب که به بی‌انصافی معروف بود به زیارت آمد و نماز و دعا کرد و حاجت خواست.

**درویش و غنی بندهٔ این خاکِ درند — و آنان که غنی‌ترند محتاج‌ترند**

ئەنجا بە منی وت: لەو شوێنە کە جێی هیممەتی دەروێشانەو ڕاستی کردەوەیانە منتان بە دڵا بێت، چونکە لە دوژمنێکی گران ئەترسم. پێم وت: بە گەلی بێ‌هێزت ڕەحم بکە هەتا لە دوژمنی بە هێز زەحمەت نەبینی

بـە دوو بـازووی تـەواناو بـە هـێزی پـەنجەیی دوو دەست
خــەتایە پــەنجەی بــێ‌هــێزو لاوازت کـە بشکـێنـێ
لە پــێ کــەتوو بــبینیو لێی نـەبووری دیـارە نـاترسی
لە پێ کەوت خۆی لە بۆ دەس گرتنی کەس دەستی بۆ بێنێ[1]
کەسێ تووی بەدی چـاندو تـەمای بـوو چـاکـە بـەرهەم بـێ
دەمـاغی بـڵحو بـێ کـەڵکـە خـەیاڵی پـووچ ئـەجوڵێنێ
لە گوێی خـۆت لۆکـە دەر بـێنـەو بـپرسە دادی ئـەم خـەڵکـە
ئـەگـەر نـەیپرسی دادڕەس بـۆ سـبەینێ تـۆڵەی ئـەستێنێ

* * *

ئـینسان ئـەندامـی لەشـی یـەکـترن — لە ئەسڵی سروشت لە یەك گەوهەرن
کـە ئـەندامـێکی ئـازار دا ڕۆزگـار — هـیچ ئـەندامـێ‌تـر نـایمێنـێ قـەرار
لە دەردی کـەسان کـەتۆ بـێ‌خـەمی — نــاشێ کـە نـاوت بـنێن ئـادەمی

## چیرۆك (١١)

دەروێشێکی دوعا قبووڵ لە بەغدادا پەیدا بوو. حەججاجی کوڕی یوسفیان ئاگـادار کرد، بانگی کردو پێی‌وت: دوعایەکی خێرم بۆ بکە. وتی: خوایە گیانی لێ وەرگرەوە. وتی: لەڕێی خودا ئەمە چ دوعایەك بوو؟! وتی: ئەمە دوعای خێر بوو بـۆ تـۆیش‌و بـۆ هـەموو موسڵمانان.

ئەی زەبەردەستی ژێر دەس بە ئـازار — تـاکـەی بـمێنـێ وا گـەرم بـازار؟
چ کەڵکـی هـەیە بـۆت جـیهان داری — بمری چـاکـە، نـەك مـەردوم ئـازاری

---

(١) مەکە ئازاری بێ هێزو لەپێ کەوتوو، نەکـا خـۆتـیش
لە پڕ بوویە گولۆڵەو کەس نەبێ دەستت لە بۆ بێنێ، ـ«ك».

آن‌گه مرا گفت: ازان جا که همّتِ درویشان است و صدقِ معاملتِ ایشان خاطری همراهِ ما کن که از دشمنِ صعب اندیشناکم. گفتمش: بر رعیّتِ ضعیف رحمت کن تا از دشمنِ قوی زحمت نبینی.

به بازوانِ توانا و قوّتِ سرِ دست
خطاست پنجه‌ی مسکینِ ناتوان بشکست
نترسد آن که بر افتادگان نبخشاید
که گر ز پای درآید، کسش نگیرد دست؟
هر آن که تخمِ بدی کشت و چشمِ نیکی داشت
دماغِ بیهده پخت و خیالِ باطل بست
ز گوش پنبه برون آر و دادِ خلق بده
و گر تو می‌ندهی داد، روزِ دادی هست

***

بنی‌آدم اعضای یکدیگرند — که در آفرینش ز یک گوهرند
چو عضوی به درد آورد روزگار — دگر عضوها را نماند قرار
تو کز محنتِ دیگران بی‌غمی — نشاید که نامت نهند آدمی

## حکایت [۱۱]

درویشی مستجاب‌الدّعوة در بغداد پدید آمد. حجّاجِ یوسف را خبر کردند بخواندش و گفت: دعای خیری بر من بکن. گفت: خدایا جانش بستان. گفت: از بهرِ خدا این چه دعاست؟! گفت: دعای خیرست تو را و جمله‌ی مسلمانان را.

ای زبردستِ زیردست آزار — گرم تا کی بماند این بازار؟
به چه کار آیدت جهانداری؟ — مردنت بهْ که مردم آزاری

## چیرۆك (١٢)

یەکێ لە پادشا بێ ئینسافەکان لە خواپەرستێکی پرسی: لە عیبادەتەکاناکامەیان پاداشی زۆرترە؟ وتی: بۆ تۆ خەوی نیوەڕۆ، تا لەو دەمەدا ئازاری کەس نەدەیت.

نیوەڕۆ زاڵمێکی نووستووم دی — وتم: ئەم فیتنەیە نووستنی چاکە
خەوت چاتر بوو گەر لە بێداری — ژینێ وا بەد بێ مـردنی چـاکـە

## چیرۆك (١٣)

بیستم یەکێ لە پادشایان شەوێکـی بـە ڕابـواردن ڕۆژ کـردەوە، لەوپـەڕی مـەستی‌یا ئەیوت:

لەم جیهانە خۆشترین کاتێ نییە بـۆم لەم دەمـە
نیمە ترسی چاك‌و بەد لەم عالەمە دڵ بێ غەمە

دەروێشێکی ڕووتی لە سەرمادا نووستوو [بیستی و] وتی:

ئــەی لە ئـیقباڵا کــە نـیتە وێنــەیەك لەم عــاڵەمــە
دڵ لە غەم خاڵی، لە عالەم، هەم لە ئێمەیش بێ غەمە؟

پادشا پێی خۆش بوو، پر یاسکەیەکی[1] هەزار دیناری لە کونێکەوە بۆ شۆڕ کردەوە خوارێ، وتی: داوێنت بگرە ئەی دەروێش. وتی: داوێن لە کوێ بێنم کراسم لەبەرا نـییە. پادشا بەزەیی پیاهاتەوە، بەراتێکی بۆ زیاد کردو بۆی نارد. دەروێش لە کاتێکی کەمدا ئەو پارەیەی خواردو بڵاوی کردەوەو هاتەوە.

کەسێ ئازادە مەردە مـاڵی نـامێنـێ لە دەس‌و چـنگ
وەکو سەبری دڵی عاشق، وەکوو ئاوێ لە ناو بێژنگ

لە کاتێکا پادشا ئەوەی بە دڵا نەئەهات تێیان گەیاند [کە فلان دەروێش ڕاوەسـتاوە]. پادشا هاتەوەیەك، ڕووی لێ وەرگێڕا. لێرەدا زیرەك‌و تـێ گـەیشتوان وتـوویانە لە تـیژی‌و پەلاماری پادشایان خۆت بپارێزە. لە کاتێکا هیممەتی گەورەی ئەوان پەیوەندی بە ئیش‌و کاری وڵاتەوە بێت باری خەڵکیان بۆ ناگیرێتە شان.

---

(١) پریسکە، وە پریاسکە، پیازکە: واتە: بەقەدەر پیوازێك، کیسە چکۆلەیێ پوول.ـ «ك».

## حکایت [۱۲]

یکی از ملوکِ بی‌انصاف پارسایی را پرسید که از عبادت‌ها کدام فاضل‌ترست؟ گفت: تو را خوابِ نیم‌روز تا در آن یک نَفَس خلق را نیازاری.

ظالمی را خفته دیدم نیمروز گفتم این فتنه‌ست خوابش بُرده به
وان که خوابش بهتر از بیداری است آن چنان بد زندگانی، مُرده به

## حکایت [۱۳]

یکی از ملوک شنیدم که شبی در عشرت روز کرده بود و در پایانِ مستی می‌گفت:

ما را به جهان خوش‌تر از این یک دم نیست

کز نیک و بد اندیشه و، از کس غم نیست

درویشی برهنه، به سرما، بیرون خفته بود بشنید و گفت:

ای آن که به اقبالِ تو در عالم نیست گیرم که غمت نیست، غمِ ما هم نیست؟

مَلِک را خوش آمد، صرّه‌ای هزار دینار از روزن بیرون داشت و گفت: دامن بدار ای درویش. گفت: دامن از کجا آرم که جامه ندارم. ملک را بر حالِ ضعیفِ او رقّت زیادت شد و خلعتی بر آن مزید کرد و پیشش فرستاد. درویش آن نقد و جنس را به اندک مدّتی بخورد و پریشان کرد و به طمع باز آمد.

قرار بر کفِ آزادگان نگیرد مال نه صبر در دلِ عاشق، نه آب در غربال

در حالتی که مَلِک را پروای او نبود عرضه داشتند که فلان درویش ایستاده است. به هم برآمد و روی در هم کشید. و از این جا گفته‌اند اصحابِ فطنت و خبرت که از حِدّت و سَورتِ پادشاهان برحذر باید بود که غالبِ همّتِ ایشان به معظماتِ امورِ مملکت متعلّق باشد و تحمّلِ ازدحامِ عوام نکند.

بـا حـەرامـی بـێ بـەخششی پاشا | کـەسێ کـاتی هـەل نـەکا تـەماشا
هـەتا جێ‌و شـوێنـی وتـەت نـەبینی | قەدرت بە بێ‌سوود بۆچ ئەدۆڕێنی[١]

پادشا وتی: ئەم سواڵکەرە سەرکەشە، ماڵ بەفیڕۆ دەرە کە ئەوەندە بەخششی بەم کاتە کەمە بڕاندەوە دەرکەن. گەنجی بەیتولماڵ پارووی هەژارانە نـەوەك خـواردنـی بـرایـانی شەیتان.

مۆمی کافووری بە ڕۆژی ڕوون کە شێتێ هەڵی‌کا
زوو ئەبینی کـاتی شـەو ڕۆنـی نـەماوە وا چـرای

یەکێ لە وەزیران بە ئامۆژگاری وتی: ئەی گەورە وا ڕێك ئەبینم ئـەم جـۆرە کـەسانە ئەوەندەی بەشیان بکات جیا جیا بۆیان بڕیار بدەیت هەتاکوو لە خەرج کردنا بە فیڕۆی نەدەن بەڵام ئەوەی فەرمووت هیچی نەدەنێ‌و لێی تووڕە بووی ئەوە ڕێ‌و ڕەوشتی خاوەن هیممەتان نییە کە یەکێ بە لوتف هیوادار کردن‌و دیسانەوە بە بێ هیوایی ڕەنجاندی.

لە ڕووی خۆت دەرگای هیوا کـردنەوە | زۆر ئـــاسان نـــییە لە داخســـتنەوە
کـەسێ نـەیدیوە تـینووەکـانی حیجاز | لەســەرئاوێ کـە پـێی بـڵێن شـوورە
کــانیی شـیرین لە جـێیـە بـوو، گـردە | لێی مـــەل‌و مـــەردمان‌و مـــێلـوورە

## چیرۆك (١٤)

یەکێ لە پادشایانی پێشین لە سەرو کاری وڵاتا سستیی ئەکرد. لەگەڵ سەربازانیا تیژ بوو، کە دوژمنێکی گران ڕووی تێ‌کرد، هەموو سوپا پشتیان کردەوە.

گــەنجت لە ســوپا دریغ بــزانـی | دەس نادەنە چەك ڕۆژی مەیدانی

* * *

چ بــنوێنــێ مـەردی دەمـی کـارزار؟ | کەسێ دەس بە تاڵ بێ هەموو ڕۆزگار

یەکێ لەوانەی ستەم لێ‌کراو بوو لەگەڵ منا دۆستایەتی هەبوو، سەرزەنشتم کردو وتم: لە گەورەی کۆن وەرگەڕان‌و حەقی بەخششی ساڵان لە بـیر بـردنەوە، بـەکـەم گـۆڕانـێ، پەستی‌و نشێوی‌و بێ‌سوپاسی‌و حەق نەناسینە. وتی: ببەخشەو بیانووم ببینە لەم شەڕەدا،

---

(١) تـا وەخـتێ قسـە ڕەوانـە بـێ بـۆت   هەرچەندە بدوێیت سووکییە بۆ خۆت،ـ«ك».

حـرامش بـوَد نـعمتِ پـادشاه — که هنگامِ فرصت نـدارد نگـاه
مجالِ سخن تا نـبینی ز پـیش — به بیهوده گفتن مبر قدرِ خویش

گفت: این گدای مبذّر را که چندان نعمت به چندین مـدّت بـرانداخت بـرانـید کـه خزینه‌ی بیت‌المال لقمه‌ی مساکین است نه طعمه‌ی اِخْوان‌الشّیاطین.

ابلهی کو روزِ روشـن شـمعِ کـافوری نـهد
زود باشد کش به شب روغن نبینی در چراغ

یکی از وزرای ناصح گفت: ای پادشاهِ روی زمین چنین کسان را وجهِ کفاف به تفاریق مُجری باید داشت تا در نفقه اسراف نکنند. امّا اشارت که فرمودی از زجر و منع، مناسبِ سیرتِ اربابِ همّت نیست یکی را به لطف امیدوار کردن و باز به ناامیدی خسته گردانیدن.

به روی خود درِ طمّاع بـاز نـتوان کـرد — چو باز شد، به درشتی فراز نـتوان کـرد

***

کس نبیند کـه تشـنگانِ حـجاز — بـه لبِ آبِ شـور گـرد آیـند
هر کجا چشـمه‌ای بـوَد شـیرین — مردم و مرغ و مـور گـرد آیـند

## حکایت [۱۴]

یکی از پادشاهانِ پیشین در رعایتِ مملکت سستی کردی و لشکر به سختی داشتی. لاجرم دشمنی صعب روی نمود همه پشت دادند.

چو دارند گنج از سـپاهی دریـغ — دریغ آیدش دست بردن به تـیغ

یکی را از آنان که غدر کردند با من دوستی بود ملامتش کردم و گفتم: دون است و بی‌سپاس و سفله و ناحق شناس که به اندک تغیّرِ حال از مخدومِ قدیم برگردد و حقوقِ نعمتِ سالیان درنوردد. گفت: اگر به کرم معذور داری شاید، که اسبم بی‌جو بود و نمدِ

ئەسپەکەم بێ جۆ بوو وە سەر زینەکەی لە بارمتەدا[1] بوو. پادشایەك لەگەڵ سوپادا بە پارە ڕژدی بکات، ناتوانرێ بەگیان لەگەڵیا جوانمەردی بکەرێت.

زەڕ بدە، سەرت بۆ دانێ سەرواز | زەڕ نەدەی لە سەرچون ئەهێنێ واز
إذا شَبِعَ الكَمِيُّ يَصُولُ بَطْشاً | وَ خاوِيَ الْبَطْنِ يَبْطِشُ بِالْفِرارِ
تێر بێ دلاوەر ئەدا پەلامار | سك برسی هەڵمەت ئەبا بۆ فیرار

## چیرۆك (١٥)

یەکێ لە وەزیرە لابراوەکان هاتە ڕیزی دەروێشانەوە، وە پیرۆزی هاوڕێیەتی ئەوان کاری تێ کرد، دڵی ڕووناك و کۆ بووەوە. پادشا جارێکی‌تر دڵی پێ خۆش کردو ئیشی پێ سپارد، وەری نەگرت و وتی: تەریکی لە خەریکی باشترە.

کەسێ لە کونجی عافیەت دانیشت | بەستی دوو دەمی بەدگۆو سەگی هار
قاقەزی دڕاند، قەڵەمی شکاند | لە دەم و دەستی بەدگۆ بوو ڕزگار

پادشا وتی: کەوا بوو خیرەدمەندێکم نیشان‌دە بۆ سەرەوکاری وڵات شایان بێت. وتی: ئەی پادشا نیشانەی خیرەدمەندی تەواو ئەوەیە لەشی خۆی نەخاتە ئەم جۆرە ئیشانە.

لەسەربالندە هوما گەورەیە | کە ئێسقان ئەخواو مەل نادا ئازار

لە ڕێوی‌یان پرسی: لە چ ڕوویەکە هاوڕێیەتی شێرت گرتە ئەستۆ؟ وتی: تا لە پاشماوەی نێچیری بخۆم، لە شەڕی دوژمنان لە پەنای شکۆهی ئەوا ژیان ڕابوێرم. ویتان: ئێستا کەوا هاتیتە سێبەری ئاگاداری ئەوەوەو، دان بە سوپاسی بە خشایشی ئەوا ئەنێیت بۆچی لێی نزیك‌تر نابیتەوە هەتا بتخاتە ڕیزی تایبەتییەکانیەوەو لە کۆیلە ڕاستەکانیا ژمارەت کات؟ وتی: لە بەر ئەوە کە لە پەلاماری ئەمین نیم.

ئاگر پەرستێ بسووتێنێ ئاگری سەد ساڵ

گەر تێی کەوێ بە ئانێ ئەسووتێ ئەبێتە کۆی زوخاڵ

ڕێ ئەکەوێ بۆ هامڕازی حەزرەتی پاشا زەڕی دەس کەوێت و ڕێ ئەکەوێت سەری تیا بڕوا. حەکیمان فەرموویانە ئەبێ لە سروشتی ڕەنگاو ڕەنگی پادشایان بە پارێز بین کە کاتێ

---

(١) بارمتە: گرێو، شل، گرەو، شتێ کە دادەنرێ لەلای یەکێك بۆ دڵنیایی لەبەرامبەر چتێکا،ـ«ك».

زین به گرو، و سلطان که به زر با سپاهی بخیلی کند به سر با او جوان‌مردی نتوان کرد.

زر بده مردِ سپاهی را تـا سـر بـنهد　　　و گرش زر ندهی سر بنهد در عـالَم

***

إذَا شَبِعَ ٱلْكَمِيُّ يَـصُولُ بَـطْشاً　　　وَ خَاوِی ٱلْـبَطْنِ يَـبْطِشُ بِـالْفِرارِ

## حکایت [۱۵]

یکی از وزرا معزول شد به حلقه‌ی درویشـان درآمـد. بـرکتِ صـحبتِ ایشـان در او سرایت کرد و جمعیّتِ خاطرش دست داد. مَلِک بارِ دیگر با وی دل خوش کرد و عمل فرمود و قبول نکرد و گفت: معزولی به نزدِ خردمندان به که مشغولی.

آنان که به کُـنجِ عـافیت بـنشستند　　　دندانِ سگ و دهـانِ مـردم بسـتند
کـاغذ بـدریدند و قـلم بشکسـتند　　　وز دست و زبانِ حرف‌گیران رسـتند

مَلِک گفت: هرآینه ما را خردمندی کافی باید که تدبیرِ مملکت را بشاید. گـفت: ای مَلِک نشانِ خردمندِ کافی جز این نیست که به چنین کارها تن درندهد.

همای بر همه مـرغان ازان شـرف دارد　　　که اسـتخوان خـورد و جـانور نـیازارد

سیه‌گوش را پرسیدند که ملازمتِ صحبتِ شیرت به چه وجه اختیار آمد؟ گفت: تا فضله‌ی صیدش می‌خورم و از شرِّ دشمنان در پناهِ صَولتش زندگانی می‌کنم. گفتند: اکنون که به ظِلِّ حمایتش درآمدی و به شکرِ نعمتش اقرار کردی چرا نـزدیک‌تر نـیایی تـا بـه حلقه‌ی خاصّانت درآرد و از بندگانِ مخلصت شمارد؟ گفت: از بطشِ او هم‌چنان ایمن نیستم.

اگر صد سال گـبر آتش فـروزد　　　چو یک دم اندر او افتد، بسوزد

افتد که ندیمِ حضرتِ سلطان را زر بیاید و باشد که سر برود و حکما گفته‌اند: از تلوّنِ طبعِ پادشاهان برحذر باید بود که وقتی به سلامی برنجند و وقتی بـه دشـنامی خـلعت

بە سەلامێ ئەڕەنجێن و کاتێ بە جنێوێ بەراتێ ئەدەن. گێڕاویانەتەوە کە وتەی نەستەقی[١] زۆر، بۆ هەمڕازان هونەرەو بۆ حەکیمان کەم و کوڕییە.

قەدرو قیمەتی خۆت بگرە بەردەم نەسەق و گاڵتە دانێ بۆ هەمدەم

## چیرۆك (١٦)

یەکێ لە هاوڕێیانم سکاڵای ڕۆزگاری ناهەمواری هێنایە لام کە ئەوە بەش بکات کەمەو ماڵ و مناڵ زۆر. توانای باری هەژاریم نییە، گەلێ جار بە دڵمادێت بگوێزمەوە بۆ وڵاتێکی تر هەتا لە هەر شێوەیەکا ژیان بەرمە سەر کەسێ ئاگای لە چاکی و خراپیم نەبێ.

زۆر برسی نووست و کەسێ نەی ناسی زۆر گیان گەییە لێو، کەس بۆی نەگریا

هەمدیسان لە تانووتی[٢] دوژمن ئەترسم کە لە دوای من بە تەشەرێم پێ کەنن و کووششی من بۆ ماڵ و مناڵ بخەنە سەر بێ مروەتی و بڵێن:

مەبینە هەرگیز بێ حەمییەتی نەیویست ببینی ڕووی خۆش بەختی[٣]

ڕێگەی ئاسانی بۆ خۆی دۆزیەوە ماڵو منالی جێ هێشت لە سەختی

وە لە عیلمی ژمارە ئەوەندە ئەزانم کە ئەگەر لەبەر قەدرو حورمەتی تۆ ئیشێکم بدرێتێ ببێتە هۆی کۆبوونەوەی دڵی پەرێشانم، چی لە ژیانم ماوە سوپاس گوزاری تۆم بۆ تەواو ناکرێت. وتم: ئەی برام ئیشی پادشا دوو سووچی هەیە: هیوای نان و ترسی گیان، جا ناڕێکی بڕیاری خیرەدمەندانە بەو هیوایە خۆت بخەیتە ئەو ترسەوە.

کەس نەهاتۆتە ماڵی دەروێشێ بۆ خەرجی زەوی وە یا خەرجی باغ

تۆ بە شێواوی و تاڵی ڕازی بە یا جگەر دانێ لە بەردەمی زاغ

وتی: ئەمەت ڕێکی حاڵی من نەوت و وەڵامی پرسیاری من نەبوو. ئەی نەت بیستووە کە وتوویانە هەرکەس خەیانەتی کرد دەستی لە حەسابا ئەلەرزێ.

ڕاســــتییە ڕێی ڕەزای دادڕەس قەت لە ڕێی ڕاستی نەبوو ون کەس

---

(١) نەسەق: قسەی ڕەق، ڕاست، دروست، نەسەق زل، بە دەعیەو دەمار، نەسەق، شۆخی.
(٢) تانووت: تانە، تەوس، تەشەر، توانج، پلار.
(٣) مەبە بە هاوەڵی بێ غیرەت و پەس خۆشی نەبینێ یاخوا هەتا هەس،-«ك».

دهند و آورده‌اند که ظرافتِ بسیار هنرِ ندیمان است و عیبِ حکیمان.

تو بر سرِ قدرِ خویشتن باش و وَقار        بازیّ و ظرافت به ندیمان بگذار

## حکایت [۱۶]

یکی از رفیقان شکایتِ روزگارِ نامساعد نزدیکِ من آورد که کفافِ اندک دارم و عیالِ بسیار و طاقتِ بارِ فاقه نمی‌آرم و بارها در دلم آمد که به اقلیمی دیگر نقل کنم تا در هر آن صورت که زندگانی کنم کسی را بر نیک و بدِ من اطلاع نباشد.

بس گرسنه خفت و کس ندانست که کیست
بس جان به لب آمد که بر او کس نَگَریست

باز از شماتتِ اعدا می‌اندیشم که به طعنه در قفای من بخندند و سعیِ مرا در حقِ عیال بر عدمِ مروّت حمل کنند و گویند:

مبین آن بی‌مروّت را که هرگز        نخواهد دید روی نیک‌بختی
که آسانی گزیند خویشتن را        زن و فرزند بگذارد به سختی

و در علمِ محاسبت چنان که معلوم است چیزی دانم اگر به جاهِ شما جهتی معیّن شود که موجبِ جمعیّتِ خاطر باشد بقیّتِ عمر از عهده‌ی شکرِ آن به در نتوانم آمد. گفتم: عملِ پادشاه دو طرف دارد: امید و بیم، یعنی امیدِ نان و بیمِ جان و خلافِ رای خردمندان باشد بدان امید در این بیم افتادن.

کس نیاید به خانه‌ی درویش        که خراجِ زمین و باغ بده
یا به تشویش و غصّه راضی شو        یا جگربند پیشِ زاغ بنه

گفت: این سخن موافقِ حالِ من نگفتی و جوابِ سؤال من نیاوردی. نشنیده‌ای که هرکه خیانت ورزد پشتش از حساب بلرزد.

راستی موجبِ رضای خداست        کس ندیدم که گم شد از رهِ راست

حەکیمان فەرموویانە: چوار کەس لە چوار کەس بەگیان ڕەنجان: جەردە لە سوڵتان، دز لە پاسەوان، فاسق لە قسەگێڕەوە، ئافرەتی خراپ لە داروغەی بازاڕ. کە سێ لە حسابا پاکە لە موحاسەبە بێ باکە.

ڕوو لە ئیش وەرمەگێڕە گەر ئەتەوێ کاتی بەرزیت مەجالی دوژمنی تەنگ
پاك‌بە پاکت لە کەس نەبێ. گازر جلی پیسە کە ئەیدەنە بەرسەنگ

وتم: چیرۆکی ئەو ڕێویە ڕێکی حاڵی تۆیە کە دی‌یان ڕای ئەکرد، ئەکەوت‌و هەڵئەسایەوە. کەسێ پێی‌وت: چ بەڵایەکە هۆی ئەم جۆرە ترسەیە؟ وتی: بیستومە حوشتر بە بێگار ئەگرن. ویتان: حوشتر کوێی لە تۆ ئەچێ‌و کوێی تۆ لە حوشتر ئەچی؟ وتی: بێ دەنگ‌بە ئەگەر حەسوودان لە قینێکەوە وتیان ئەمە حوشترە، کێ بۆ ڕزگاریم غەمی منیەتی هەتا بە حاڵی منا چاو بگێڕن. تا تریاق لە عیراقەوە دێت مارپێوەداو ئەمرێت. تۆ وەکوو ئەڵێیت فەزڵ و ئایینی لە خواترسان‌و ئەمنیەتت هەیە، بەڵام حەسوودان لە بۆسەدان. داواکاران لە گۆشەدا دانیشتوون. ئەگەر ئەو جوان ڕەوشتییەی تۆیان پێچەوانە بۆ پادشا گێڕایەوە ئەتوانی بەربەرەکانێ لەگەڵ پادشادا بکەیت؟ وە کێ ڕێی گفتوگۆی هەیە؟ وا بە ساز ئەبینم، موڵکی قەناعەت پاسەوانی بکەیت‌و واز لە سەرداری بێنی.

دەلیا پڕە لە دوڕی سوودمەند بەبێ ژمار
گەر ئارەزوت لە سەلامەتییە ڕووکەرە کەنار

هاوڕێم ئەم وتەیەی بیست‌و هاتەوە یەك‌و رووی لەم چیرۆکە وەرگێڕاو کەوتە وتنی ڕەنجان ئامێز کە ئەمە چ عەقڵ‌و فامێکەو چ شایستەیی‌و تێ‌گەیشتنێکە. وتاری حەکیمان ڕاست هات کە وتوویانە دۆستان لە بەندیخانەدا بەکاردێن‌و، لەسەرخوان هەموو دوژمنان بە دۆست ئەنوێنن.

بە دۆستی مەگرە کەسێ لە نیعمەت لێ ئەدا لافی هاوڕێیی‌و یاری
ئەو کەسە دۆستە دەستی دۆست ئەگرێ لە پەرێشانی‌و کاتی ناچاری[1]

دیتم کە تێك چووەو ئامۆژگاری بەقینەوە وەرئەگرێ. نزیك بوومەوە لە خاوەن دیوان،

---

(١) ئەبێ وریا بی دۆستی سەر سفرە لە دەرسی عەشقا هەمیشە سفرە،«ك».

و حکما گفته‌اند: چهار کس از چهار کس به‌جان برنجند: حرامی از سلطان، و دزد از پاسبان، و فاسق از غَمّاز، و روسپی از مُحتَسب؛ و آن راکه حساب پاک است از محاسبه چه باک است؟

**مکن فراخ روی در عمل، اگر خواهی**
**که وقتِ رفعِ تو باشد مجالِ دشمن تنگ**
**تو پاک باش و مدار، ای برادر، از کس باک**
**زنند جامه‌ی ناپاک گازران بر سنگ**

گفتم: حکایتِ آن روباه مناسبِ حالِ تو است که دیدندش گریزان و بی‌خویشتن، افتان و خیزان. کسی گفتش: چه آفت است که موجبِ چندین مخافت است؟ گفت: شنیدم شتر را به سُخْره می‌گیرند. گفتند: ای شیفته‌ی لایعقل شتر را با تو چه مناسبت و تو را با او چه مشابهت؟ گفت خاموش! که اگر حسودان به غرض گویند شترست و گرفتار آیم که را غمِ تخلیصِ من باشد تا تفتیشِ حالِ من کند؟ و تا تریاق از عراق آورده باشند مارگزیده مرده باشد. هم‌چنین تو را فضل است و دیانت و تقویٰ و امانت، امّا متعنّتان در کمینند و مدّعیان گوشه‌نشین. اگر آن‌چه حُسنِ سیرتِ تو است به خلاف تقریر کنند و در معرضِ خطابِ پادشاه افتی که را در آن حالت مجالِ مقالت باشد؟ پس مصلحت آن می‌بینم که مُلکِ قناعت را حراست کن و ترکِ ریاست گویی.

**به دریا دَر منافع بی‌شمارست　　　و گر خواهی سلامت، بر کنارست**

رفیق این سخن بشنید و به هم برآمد و روی در هم کشید و سخنانِ رنجش‌آمیز گفتن گرفت که این چه عقل است و کفایت و فهم و درایت؟ قولِ حکما درست آمد که گفته‌اند: دوستان در زندان بکار آیند که بر سفره همه دشمنان دوست نمایند.

**دوست مشمار آن که در نعمت زند　　لافِ یاریّ و برادرخواندگی**
**دوست آن دانم که گیرد دستِ دوست　　در پریشان‌حالی و درماندگی**

دیدم که متغیّر می‌شود و نصیحت به غرض می‌شنود. به نزدیکِ صاحب دیوان رفتم،

بە ناسیاوییەکی ڕابردوو کە لە نێوانمانا هەبوو حاڵەتیم پێوتو شایستەییم تێگەیاند، تا لە ئیشێکی بچوکدا دایان مەرزاند ئەوەندەی بەسەرا نەهات کە پاکی سروشتو جوانی ڕاوێژو بڕیاری پەسەند کرا.ئیشی لەوە تێپەڕی، لە پایەیەکی بەرزتر جێگیر بوو هەروەها ئەستێرەی کامەرانی لە بەرز بوونەوەدا بوو هەتا گەیشتە ئەوجی ئارەزوو. لە حوزوری سوڵتاندا ئیشارەتی بۆ ئەکراو بوو بە پاڵ پشت. بۆ سەلامەتی حاڵی شادمانیم نواندو وتم:

لە کارێ بەسترابێ تۆ مەترسە لێی دڵت نەشکی
کە سەرچاوەی ژیانی کەوتۆتە چۆڵیو تاریکستانی

اَلاٰ لا تَحْزَنْ اَخا الْبَلِيَّة
فَلِلرَّحْمٰنِ اَلْطافٌ خَفِيَّة(١)

بەلا دیدە مەبە دڵتەنگ، ئەزانی
لە لای ڕەحمان هەیە ڕەحمی نیهانی

* * *

لە گەردشی زەمانە مەبە ترش ڕوو کە سەبر
هەرچەند تاڵە خۆ بەری شیرین ئەخاتە دەر

لەو نزیکانە لەگەڵ کۆمەڵی یاران سەفەرێکمان بۆ ڕێك کەوت. کە لە زیارەتی مەککە هاتمەوە دوو قۆناغ هات بەپیریمەوە. کە دیمەنی دەریم دی پەرێشان وا لە شێوەی دەروێشانا، بە فەراسەت زانیم لە کارخراوە. دۆستانی دیوانی کاتی بەتاڵی دیداری دۆستانیان هەیە کە لە کار دانەمێنن.

کاتی گەورەیی لە بگرەو بەردە نیانە کاتێ بۆ ئاشنایان
کاتێ پەکیان کەوت ئەبن بە دەروێش دەردی دڵ دێنن بۆلای دۆستان

حاڵم لێ پرسی، وتی: ئەوەی تۆ وتت. کومەڵێ حەسوودان حەسوودییان پێ بردم، وە خەیانەتیان دایە پاڵم. پادشا، خوا موڵکی بەردەوامکا، بۆ دەرکەوتنی ڕاستی نەگەڕا، وە دۆستانی دێرینم لە وتنی ڕاستی بێدەنگ بوونو هاوڕێیەتی کۆنیان فەرامۆش کرد.

---

(١) لە هەندێ نووسخەدا لە باتی (لا تحزنن) نووسراوە: (لا يَجْأَرَنَّ)، «ك».

به سابقه‌ی معرفتی که میانِ ما بود، و صورتِ حالش بیان کردم و اهلیّت و استحقاقش بگفتم تا به کاری مختصرش نصب کردند. روزی چند بر این برآمد لطفِ طبعش بدیدند و حسنِ تدبیرش بپسندیدند کارش ازان درگذشت و به مرتبه‌ای برتر ازان مُمَکَّن شد. هم‌چنین نجمِ سعادتش در ترقّی بود تا به اوجِ ارادت برسید و مقرّبِ حضرتِ سلطان و مشارٌاِلَیْه و مُعْتَمَدٌ عَلَیْه گشت. بر سلامتِ حالش شادمانی کردم و گفتم:

ز کارِ بسته مـیندیش و دل شکسـته مـدار
که آبِ چشمه‌ی حیوان درونِ تاریکی است

***

اَلاٰ لاٰیَـجْأَرَنَّ اَخُـو اَلْـبَلِیَّة　　　فَـلِلرَّحْمٰنِ اَلْـطافٌ خَـفِیَّة

***

منشین تُرُش از گردشِ ایّـام کـه صـبر　　　تــلخ است ولیکــن بــرِ شـیرین دارد

مرا در آن قُربت با طایفه‌ای یاران اتفاقِ سفر افتاد. چون از زیارتِ مکّه بـازآمـدم دو منزلم استقبال کرد. ظاهرِ حالش دیدم پریشان و در هیأتِ درویشان. گفتم: حال چیست؟ گفت: چنان که تو گفتی طایفه‌ای حسد بردند و به خیانتم منسوب کـردند و مَـلِک، دامَ مُلْکُهٗ، در کشفِ حقیقت آن استقصا نفرمود و یارانِ قدیم و دوستانِ حمیم از کلمه‌ی حق خاموش شدند و صحبت دیرین فراموش کردند.

ئـەبینی بـەرامـبەر بـە خـاوەندی جـاه لەسـەرسینە دەستو سـتایش ئـەڵێن
زەمانە ئەگەر خستی هـەر ئـەو کـەسە هەموو دێنو دوو پێی لەسەرسەر ئەنێن

بەکورتی دوچاری هەموو جۆرە سزایەك بووم تا لەم حەفتەیەدا کە مژدەی سەلامەتی حاجیان گەیشت لە بەندی گران ڕزگاریان کردم وە موڵکی واریسیمیان دامەوە. وتم: ئەو جارە وتاری منت وەرنەگرت کە وتم: ئیشی پادشایان وەکوو سەفەری دەلیایە بەترسو بە کەڵکە، یاگەنجی ئەگری، یا بە تەلیسمی ئەمری.

یا بە هەر دوو دەستی زەڕ دێنێتە ناو داوێنی خۆی
یـا بـە مـردوویی شـەپۆلێ ڕۆژێ ئـەیخاتە کـەنار
سوودی دەلیا باشە گەر ترسی شـەپۆلی تـیا نـەبێ
گوڵ لە باخەڵتا چ خۆشە گەر نەبێ ترست لە خار

ڕێکم نەدی زیاتر برینی دەروونی بە تانووتو تەشەر بتاشمو خوێی تێ هەڵسووم. بەم دوو شیعرە کورتم کردەوە.

بـــزانـــە پـــێی لە پـــێوەنـدا ئـەبینی لە پەندی مەردومان هەرکەس بە ڕەنجە
ئـــەگـــەر نـیتە ئـیتر تـوانـایی ئـازار نـەخەیتە نـاو کـونی دووپشك، پـەنجە

## چیرۆك (١٧)

چەند کەسێ هاوڕێم بوون، دیمەنی دەرەوەیان بە چاکی ڕازابـوەوە یـەکێ لە پیاوە گەورەکان بەرامبەر بەم کۆمەڵە باوەڕێکی جوانی گەورەی هەبوو وە مووچەیەکی بۆ دیاری کردبوون، تا یەکێ کردەوەیەکی لێ دەرکەوت ڕێکی حاڵی دەروێشان نەبوو. باوەڕی ئەو پیاوە تێکچوو، بازاری ئەمان بێ ڕەواج بوو، ویستم لە ڕێـیـەکی بـەجێوە [مـووچەی] هـاوڕێکـانم ڕزگـار بکـەم، ڕۆیشـتم بـۆ خـزمەتی قـاپیەوان، نـەیانهێشتم وە دووریـان خـستمەوە، بیانوویان هەبوو چونکە وتوویانە:

بـــەبێ ڕابـــەری مـــەسووڕێرەوە لە قـاپیی مـیرو وەزیـرو سـوڵتـان
سـەگو قـاپیەوان کـەغەریبیان دی ئەم یەخەی ئەگرێ، ئەویتر دامـان[1]

---

(١) دەرگـاوانو سـەگ هـەڵە وەڕێکـن دژی غـــەریبن هـــەربەد فـەڕێکـن
ئەم یـەخەی ئـەگرێ، ئـەویان داوێنـی هەر دوو بە هیوای لاکە وەڕێکن،-«ك».

نبینی کـه پـیشِ خـداونـدِ تـخت | تواضع کـنان دست بـر بـر نـهند
چو بـینند کـارش ز دست اوفـتاد | همه عـالَمَش پـای بـر سـر نـهند

فی‌الجمله به انواعِ عقوبت گرفتار بودم تا در این روزها که مژده‌ی سلامتِ حُجّاج برسید از بندِ گرانم خلاص کردند و مِلکِ موروثم خاص. گفتم: آن نوبت اشارتِ من قبول نکردی که گفتم عملِ پادشاه چون سفرِ دریاست خطرناک و سودمند یا گنج برگیری یا در طلسم بمیری.

یا زر به هردو دست کند خـواجـه در کـنار
یـا مـوج روزی افگـندش مـرده بـر کـنار

مصلحت ندیدم از این بیش ریشِ درونش را به ملامت خراشیدن و نمک پاشیدن. بدین دو کلمه اختصار کردم:

ندانستی که بینی بـند بـر پـای | چو در گوشَت نیامد پـندِ مـردم
دگر ره گر نـداری طـاقتِ نـیش | مـبر انگشت در سـوراخِ کـژدم

## حکایت [۱۷]

تنی چند به صحبتِ من بودند ظاهرِ ایشان به صلاح آراسته و یکی از بزرگان حُسنِ ظنّی بلیغ در حقِ این طایفه داشت و ادراری معیّن کرد. مگر[۱] یکی از اینان حرکتی کرد نه مناسبِ حالِ درویشان. ظنِّ آن شخص فاسد شد و بازارِ اینان کاسد. خواستم تا به طریقی کفافِ یاران مستخلص کنم. آهنگِ خدمتش کردم. دربانم رها نکرد و جفا کرد. معذورش داشتم که شنیده بودم که لطیفان گفته‌اند:

درِ مـــیر و وزیـــر و ســـلطان را | بـــی‌وسیلت مگـــرد پـــیرامـــن
سگ و دربان چـو یـافتند غـریب | ایـــن گـریبانش گـیرد، آن دامـن

---

۱. اتفاقاً.

کاتێ نزیکانی ئاستانی ئەو گەورەیە بە حاڵ منیان زانی بە ئیکرام بردمیانو جێیەکی بەرزتریان بۆ دیاری کردم، بەڵام خۆم گرت وە لە نزمتر دانیشتمو وتم:

لێم گەڕێن من کۆیلەیێکم کەمترین  با لە ڕیزی کۆیلەکان بم هەمنشین

وتی: الله الله! کەی شوێنی ئەم وتارەیە؟

بۆ سەر سەروچاو گەر تەشریف بێنی  نازت ئەکێشین کە نازەنینی

بەکورتی دانیشتم، وە لە هەر دەرێکەوە دەستم کرد بە وتار تا باسی بێنەوایی یارانم هێنایە ناوو وتم:

چ تاوانێکی دی ئەو خاوەنی بەخشینی دێرینە
کە کۆیلەی خۆی لە بەرچاوا بووە وا سووكو بێقیمەت؟
خوایی و گەورەیی و فەرمانڕەوایی بۆ کەسێ ڕێکە
لە کۆیلەی سووچ ئەبینێ و بەردەوامە نانو نیعمەت

حاکم ئەم وتە گەورەیەی لا پەسەند بوو، وە فەرمانی‌دا مووچەی یاران وەکوو جاران ئامادە کەنەوە، وە مووچەی زەمانی پێشوویشیان بدەنێ، سوپاسی بەخشایشیم کردو زەمینی ئاستانم ماچ کردو، بیانووی بێپەروایی‌یم داواکرد، وە لە کاتی هاتنە دەرەوەدا وتم:

کە کەعبە بوو بە قیبلە بۆ نیازان
لە ڕێگای دوورەوە بۆی چوون بەسەر سەر
ئەبێ توانات هەبێ بۆ چەشنی ئێمە
کە کەس بەرد ناگرێتە داری بێبەر

## چیرۆك (١٨)

شازادەیەك سامانێکی زۆری لە باوکەوە بە میرات دەسکەوت. قاپی بەخششی کردەوەو بانگی سەخاوەتی بڵند کردەوە. بە بێ دریغی بەخشش و نیعمەتی بەسەر سوپاو گەلدا ڕژاند.

لە قوتوا بۆنی عوود نایەت بە لووتا  بە ئاگر چەشنی عەنبەر بۆنی دێنێ
سەرۆکیت پێ ئەوێ بەخشەندەیی کە  بڵاوی تا نەکەی توو نای ڕوێنێ

چندان که مقرّبانِ حضرتِ آن بزرگ بر حالتِ من وقوف یافتند، به اعزاز و اکرام درآوردند و برتر مقامی معیّن کردند. به تواضع فروتر نشستم و گفتم:

**بگذار که بندهٔ کمینم تا در صفِ بندگان نشینم**

گفت: اللّٰه اللّٰه! چه جای این سخن است؟

**گر بر سر و چشمِ من نشینی بارت بکشم که نازنینی**

فی‌الجمله بنشستم و از هر دری سخن درپیوستم تا حدیثِ زَلّتِ یاران در میان آمد و گفتم:

**چه جُرم دید خداوندِ سابقُ اَلْأَنعام؟ که بنده در نظرِ خویش خوار می‌دارد**
**خدای راست مسلّم بزرگواری و لطف که جُرم بیند و نان برقرار می‌دارد**

حاکم این سخن عظیم بپسندید و اسبابِ معاشِ یاران فرمود تا به قاعده‌ی ماضی مهیّا دارند و مؤونتِ ایّامِ تعطیل وفا کنند. شکرِ نعمت بگزاردم و زمینِ خدمت ببوسیدم و عذرِ جسارت بخواستم و در وقتِ بیرون آمدن گفتم:

**چو کعبه قبله‌ی حاجت شد از دیارِ بعید**
**روند خلق به دیدارش از بسی فرسنگ**
**تو را تحمّلِ امثالِ ما باید کرد**
**که هیچ‌کس نزند بر درختِ بی‌بر سنگ**

## حکایت [۱۸]

مَلِک زاده‌ای گنجِ فراوان از پدر میراث یافت. دستِ کَرَم برگشاد و دادِ سخاوت بداد و نعمتِ بی‌دریغ بر سپاه و رعیّت بریخت.

**نیاساید مشام از طبله‌ی عود بر آتش نِه که چون عنبر ببوید**
**بزرگی بایدت بخشندگی کن که دانه تا نیفشانی نروید**

یەکێ لە هەمنشینانی بێ ڕاوێژ ئامۆژگاری دەس پێکرد پادشایانی ڕابردوو کە ئەم نیعمەتەیان بە کۆشش پێکەوە ناوە و بۆ ڕۆژگاری کارسازیان داناوە، دەست لەم جوولانەوەیە کورت کەرەوە لێ قەومان لە پێشەوەیەو دوژمنان لە پشتەوە. نوەك لە [کاتی] پێویستییا دابمێنی.

ئەگەر گەنجێ بکەی دابەخشی عالەم ـــــ ئەگاتە هەر کوێخا دەنکە برنجێ

لە هەرکەس دەنکە جۆیەك زیو بسێنی ـــــ لە بۆت کۆمەڵ ئەبێ هەر ڕۆژە گەنجێ

شازادە لەم وتەیە ڕووی هێنایەوە یەك، ڕێکی سروشتی نەبوو، لێی تووڕە بوو وتی: خوای بڵند، ئێمەی کردووە بە خاوەنی ئەم وڵاتە کە بیخۆین و ببەخشین، نەوەك پاسەوان و ئاگاداری بکەین.[1]

بە گەنجی پڕ لە چل خانوو، قارووون کەوا فەوتا نەما

نەمرد نەوشیرەوان وا ناوی چاکی خۆی لە دوا جێ ما[2]

## چیرۆك (١٩)

ئەگێڕنەوە کەوا نەوشیرەوانی بەداد لە ڕاوگەیەکا نێچیریان بۆ ئەکرد بە کەباب، خوێ نەبوو کۆیلەیەکیان نارد بۆ دێیەك هەتا خوێ بهێنێ نەوشیرەوان وتی: خوێ بەکڕین بێنە، هەتا نەبێ بە شێوەو دەستوور وە دێ وێران نەبێ. ویتان: لە وەندە چ خراپەیەك ڕوو ئەدا؟ وتی: بنچینەی خراپی لە پێشا کەمێ بوو هەرکەس شتێکی لێ زیاد کرد هەتا گەیشتە ئەم ڕادەیە.

لە باغی گەل ئەر سێوێ بخوا شەهێ ـــــ بچووکان درەختانی بن کەن ئەکەن

بە پێنج هێلکە پادشا ڕەوای دی ستەم ـــــ سوپایان هەزار مر[3] لە شیش توند ئەکەن

---

(١) پاسەوان نیم تا ئاگادری بکەم. فارسییەکەی: نەپاسبانم تا نگە دارم ـ ع.

(٢) بە گەنجی پڕ لە چل خانوو نەما قاروون وەلی هێما

ئەژی نەوشیرەوان ئێستەش، کە ناو چاکیی لەدوو جێما.ـ «ك».

(٣) مر: مریشك، مامر، باڵندە «ك».

یکی از جلسای بی‌تدبیر نصیحتش آغاز کرد که ملوکِ پیشین این نعمت را به سعی اندوخته‌اند و برای مصلحت نهاده. دست از این حرکت کوتاه کن که واقعه‌ها در پیش است و دشمنان در پس. نباید که به وقتِ حاجت در مانی.

**اگر گنجی کنی بر عامیان بخش　　رسد هر کدخدایی برنجی**
**چرا نستانی از هریک جوی سیم　　که گرد آید تو را هر روز گنجی**

مَلِک روی از این سخن در هم کشید و او را زجر فرمود و گفت: مرا خدای، عزّوجلّ، پادشاهِ این مملکت گردانیده است تا بخورم و ببخشم، نه پاسبانم که نگه دارم.

**قارون هلاک شد که چهل خانه گنج داشت**
**نوشیروان نمرد که نامِ نکو گذاشت**

## حکایت [۱۹]

آورده‌اند که انوشروانِ عادل در شکارگاهی صیدی کباب کرده بود و نمک نبود. غلامی را به روستا فرستاد تا نمک حاصل کند. گفت: زینهار تا نمک به قیمت بستانی تا رسمی نگردد و دیه خراب نشود. گفتند: این قدر چه خلل کند؟ گفت: بنیادِ ظلم در جهان اوّل اندک بوده است و به مزیدِ هرکس بدین درجه رسیده است.

**اگر ز باغِ رعیّت مَلِک خورد سیبی　　برآورند غلامانِ او درخت از بیخ**
**به پنج بیضه که سلطان ستم روا دارد　　زنند لشکریانش هزار مرغ به سیخ**

## چیرۆك (٢٠)

وەزیرێکی بێ‌هۆشم بیست کە ماڵی گەلی وێران ئەکرد بۆ ئەوەی گەنجینەی پادشا ئاوەدان کاتەوە، بێ ئاگا لەوە کە حەکیمان وتوویانە هەرکەسێ دڵی خوای بەرزو بڵند ئازار بدا، بۆ ئەوەی دڵی کە سێ بێنێتە دەست، خوای بڵند هەر ئەو کەسەی بەسەرا زاڵ ئەکا تا دەماری لە ڕۆزگار بێنێتە دەرێ.

ئاگری گڕ بە بخووری ناکا          ئەوە دوودی دڵی غەمبار ئەیکا

ئەڵێن سەرکردەی گیان لەبەران شێرەو کەمترینیان گوێدرێژە، بە بڕیاری هەموان گوێدرێژی باربەر چاترە لە شێری پیاو هەڵدڕ.

کەری بەسەزمان گەر بێ تەمیزە          چونکە بار ئەبا لامان عەزیزە

گا و کەر چاترن ئەگەر بەرن بار          لە ئادەمیزادێ پیاو بدا ئازار

هاتینەوە سەر چیرۆکی وەزیری بێ‌هۆش پادشا سووچێکی لە ڕەوشتی ناپەسەندی بۆ دەرکەوت کێشایە ئەشکەنجەوە، بە سزای جۆر جۆر کوشتی.

دەستت ناکەوێ ڕەزای پادشا          ڕانەگری دڵی بچووکەکانی

لە خواوە ئەگەر بەخشینت ئەوێ          چاك بە بۆ خەڵکی هەتا ئەتوانی

گێڕاویانەتەوە کە یەکێ لە ستەم لێ‌کراوەکانی بەلایا تێپەڕی، لە قەلافەتی[1] ورد بووەو وتی:

وەنەبێ بە هێزی بازوو، یا پایەیەك ئەگەر بوو

بە گەزاف ماڵی عالەم بخورێ بەبێ موتاڵا

ئەتوانی ئێسکێکی زل لە قوڕگت کەی سەرەو خوار

بەڵام گیر بوو لە ناوك ورگت ئەکا یەکاڵا

* * *

ئەفەوتێ ستەمکاری بەد ڕۆزگار          ئەمێنێ لە بۆی لەعنەتی پایەدار

---

(١) قەلافەت: قەدو باڵای گیاندار.

## حکایت [۲۰]

غافلی را شنیدم که خانه‌ی رعیّت خراب کردی تا خزینه‌ی سلطان آبادان کند، بی‌خبر از قولِ حکما که گفته‌اند: هرکه خدای را، عزّوجلّ، بیازارد تا دلِ خلقی به دست آرد ایزد تعالیٰ همان خلق را بر او بگمارد تا دَمار از روزگارش برآرد.

آتشِ سوزان نکند با سپند — آن‌چه کند دودِ دلِ دردمند

سرجمله‌ی حیوانات گویند شیرست و کمترینِ جانوران خر و به اتفاقِ خردمندان: خرِ باربر بِهْ که شیرِ مردم‌در.

مسکین خر اگرچه بی‌تمیزست — چون بار همی برد عزیزست
گاوان و خرانِ رنج بُردار — بِه ز آدمیانِ مردم‌آزار

باز آمدیم به حکایتِ وزیرِ غافل. مَلِک را طرفی از ذمایمِ اخلاقِ او معلوم شد. در شکنجه کشیدش و به انواعِ عقوبت بکُشت.

حاصل نشود رضای سلطان — تا خاطرِ بندگان نجویی
خواهی که خدای بر تو بخشد — با خلقِ خدای کن نکویی

آورده‌اند که یکی از ستمدیدگان بر او بگذشت و در حالِ تباهِ او نظر کرد و گفت:

نه هرکه قوّتِ بازوی منصبی دارد
به سلطنت بخورد مالِ مردمان به گزاف
توان به حلق فرو بردن استخوانِ درشت
ولی شکم بدرد چون بگیرد اندر ناف

***

نماند ستمگارِ بد روزگار — بماند بر او لعنتِ پایدار

## چیرۆك (٢١)

ئەگێڕنەوە مەردوم ئازارێ بەردێکی کێشا بەسەر پیاوچاکێکا. دەروێش ئەوکاتە شوێنی تۆڵە سەندنی نەبوو، بەردەکەی هەڵگرت تا کاتێ پادشا لەو سوپایی‌یە قینی هەڵسا فرێی دایە زیندانەوە. دەروێش هات بەردەکەی کێشاوە بە سەریا. وتی: تۆ کێیتو ئەم بەردەت بۆچ دا بەسەرما؟ وتی: من فلانمو ئەمە ئەو بەردەیە فلان ڕۆژ کێشات بە سەری منا. وتی: ئەم هەموو ڕۆژانە لەکوێ بوویت؟ وتی: لە پایەکەت ئەترسام. ئێستا لە چاڵاتۆم دی، هەلم بە تالان زانی.

| | |
|---|---|
| نـــاشایستەیان کـــە دی بـــەختیار | عاقلان تـەسلیم ئـەکـەن ئـیختیار |
| نـینۆکـی تـیژو دڕەنـدەت نـیە | لەگەڵ خراپان دەس‌بـازیت چـییە |
| لە پـۆڵا بـازوو بـدەی سـەرپەنجە | قـۆڵی زیـوینت ئـەخەیتە ڕەنـجە |
| لێی گەڕێ دەستی بەستێ ڕۆژگار | بە ئامانجی دۆست بێنەدەر دەمار |

## چیرۆك (٢٢)

یەکێ لە پادشایان نەخۆشییەکی سامناکی بوو کە دووبارە کردنەوەو ناوهێنانی باش نەبوو.[١] دەستەیەك لە حەکیمانی یۆنان کۆبوونەوە بڕیاریان‌دا کە ئەم دەردە دەرمانێکی نییە مەگەر زراوی ئادەمیزادێك کە چەند نیشانەیەك هەیە تیابێ. پادشا فەرمانی دا بیدۆزنەوە. کوڕە فەللاحێکیان بەو نیشانانەی حەکیمەکان وتبوویان دۆزیەوە. باوكو دایکیان بانگ کرد بە بەخشایشێکی زۆر خۆش‌حاڵیان کردن، وە قازی فتوای دا کە خوێنی یەکێك لە گەل ڕشتن بۆ سەلامەتی پادشایەك ڕەوایە. جەللاد ڕووی تێ کرد بۆ کوشتن. کوڕە سەری بۆ لای ئاسمان هەڵبڕی، زەردەخەنەیەك گرتی. پادشا لێی پرسی: کەی ئەمە جێگەی پێکەنینە؟ وتی: نازی منالان لەسەرباوكو دایکەو دەعوا بۆ لای قازی ئەبرێتو داوای داد لە پادشا ئەکرێت. باوكو دایکم بۆ ماڵی بێ‌نرخی جیهان منیان بە خوێن سپاردو، قازی فتوای بە کوشتنم داو پادشا کار سازی خۆی لە فەوتانی منا ئەبینێ. خوای بەرزو بڵند نەبێ پەنایەکی‌تر نابینم.

(١) کە ناو نەهێنانی باشترە. فارسییەکەی: «کە اعادتِ ذکر آن ناکردن اولیٰ»ـع.

## حکایت [۲۱]

مردم‌آزاری را حکایت کنند که سنگی بر سرِ صالحی زد. درویش را مجالِ انتقام نبود. سنگ را با خود همی داشت تا وقتی که مَلِک را بر آن لشکری خشم آمد و او را در چاه کرد. درویش درآمد و سنگش در سر انداخت. گفتا: تو کیستی و مرا این سنگ چرا زدی؟ گفت: من فلانم و این همان سنگ است که در فلان تاریخ بر سرِ من زدی. گفت: چندین وقت کجا بودی؟ گفت: از جاهت می‌اندیشیدم. اکنون که در چاهت دیدم فرصت غنیمت شمردم.

| | |
|---|---|
| ناسزایی را چو بینی بخت یار | عاقلان تسلیم کردند اختیار |
| چون نداری ناخنِ درّنده تیز | با دَدان آن به که کم‌گیری ستیز |
| هرکه با پولاد بازو پنجه کرد | ساعدِ مسکینِ خود را رنجه کرد |
| باش تا دستش ببندد روزگار | پس به کامِ دشمنان مغزش برآر |

## حکایت [۲۲]

یکی از ملوک را مَرَضی هایل بود که اعادتِ ذکرِ آن ناکردن اَولیٰ. طایفه‌ی حکمای یونان اتّفاق کردند که مر این رنج را دوایی نیست مگر زهره‌ی آدمی به چندین صفتِ موصوف. بفرمود تا طلب کردند. دهقان پسری یافتند بدان صفت که حکما گفته بودند. پدرش را و مادرش را بخواند و به نعمتِ بی‌کران خشنود کرد و قاضی فتویٰ داد که خونِ یکی از آحادِ رعیّت ریختن سلامتِ نفسِ پادشاه را رواست. جَلاّد قصدِ کُشتن کرد. پسر سر سویِ آسمان کرد و تبسّم کرد. مَلِک پرسید که در این حالت چه جای خندیدن است؟ گفت: نازِ فرزندان بر پدر و مادر باشد و حکومت برِ قاضی برند و داد از پادشاه خواهند. اکنون پدر و مادر به علّتِ حُطامِ دنیا مرا به خون درسپردند و قاضی به کُشتنم فتویٰ داد و پادشاه راضی شد به ریختنِ خونم. در این حال جز خدای پناه نیست.

بــیبەمە لای کــێ لە دەست تـۆ فـریاد　　لای خۆت لە دەس خۆت داوا ئەکەم داد

پادشا لەم وتارە دڵی هاتەوە یەك و ئاو لە چاویا گەڕاو وتی: فەوتانی مـن چـاکـترە لە خوێنی بێ گوناهێکی وا ڕژاندن. سەرو چاوی ماچ کردو گرتیە باوەش و بـەخشایشێکـی بێ ئەندازەی دایە. ویتان: هەر لەو حەفتەیەدا شیفای دەس کەوت.

دێتە بیرم هەروەها شیعرێکـی وت　　فیلەوانێ بوو لە گوێی دەلیایی نـیل
حاڵی مێلـوورە لە ژێر پـێتـا وەکـوو　　حاڵی تۆ وایە لە ژێر دوو قاچی فیل

## چیرۆك (٢٣)

یەکێ لە کۆیلەکـانی عـەمری لەیس ڕای کـردبوو، پیاوان دوای کـەوتن هـینایانەوە. وەزیرێ قینی لێ بوو فەرمانی بە کوشتنیدا تا کۆیلەکانی تر ئەم کـردەوەیە ڕەوا نـەبینن. کۆیلە لە بەردەمی عەمرا سەری نایە زەوی و وتی:

هەرچیم بەسەر بێ، تۆ پەسەندی کەی لەلام ڕەوایە
بـەرامـبەر حـوکمی ئـەو سـەردارمـە نـیمە داوایـە

بەڵام بە هۆی ئەوەوە کە پەروەردەی بەخشایشی ئەم خانەدانەم نامەوێ لە دواڕۆژا بە خوێنی من دوچار ببیت بفەرموو هەتا لە ڕێگای شەرعەوە بکوژرێم.

پادشا وتی: چۆن؟ وتی: لێم گەڕێن وەزیر بکوژم هەتا لە خوێنی ئەوا خوێنم بڕێژنەوە، ئەوسا بەناحەق نامکوژی. پادشا پێکەنین گرتی و ئاوڕی دایەوە بەلای وەزیراو وتی: چۆن ڕێك ئەبینی؟ وەزیر وتی: ئەی خاوەنی جیهان لە ڕێی‌خوادا ئەم چاو بێ پەروایە بکە بە ساقەی گۆڕی باوکت، ئازادی فەرموو هەتا منیشی لە بەڵایەکەوە نەئاڵاندووە. سووچ لە منەوەیە کە وتاری حەکیمانەم لە گوێ نەگرتووە کە وتوویانە:

کـە تـۆ چـوویتە شـەڕ بـۆ کـولۆ هـاوێژ　　سەری خۆت شکاند ئەی نەفامی گـێژ
کە تیرت هـاویشت بـەرامـبەر دوژمـن　　دامــــەنیشە لێی خــۆتــی لێ کــە ون

## چیرۆك (٢٤)

زەوزەن پادشا مامۆستایەکی هەبوو نەفسێکی کەریم و شێوەیـەکـی جـوانـی هـەبوو

**پیشِ کـه بـرآورم ز دسـتت فـریاد؟ — هم پیشِ تو از دستِ تو گر خواهم داد**

سلطان را از این سخن دل به هم برآمد و آب در دیده بگردانید و گفت: هلاکِ من اولی‌تر که خونِ بی‌گناهی ریختن. سر و چشمش ببوسید و در کنارش گرفت و نعمتِ بی‌کران داد و آزاد کرد و گویند هم در آن هفته شفا یافت.

**هم‌چنان در فکرِ آن بیتم که گفت — پیل‌بانی بر لبِ دریای نیل**
**زیرِ پایت گر بدانی حالِ مور — هم‌چو حالِ تست زیرِ پای پیل**

## حکایت [۲۳]

یکی از بندگانِ عَمرو لَیث گریخته بود. کسان در عقبش برفتند و باز آوردند. وزیر را با وی غَرَضی بود. به کشتنش اشارت کرد تا دیگر بندگان چنین حرکت روا ندارند. بنده پیشِ عمرو سر بر زمین نهاد و گفت:

**هرچه رود بر سرم، چون تو پسندی رواست**
**بنده چه دعوی کند؟ حکم خداوند راست**

امّا به موجبِ آن که پرورده‌ی نعمتِ این خاندانم نخواهم که در قیامت به خونِ من گرفتار آیی. اگر بی‌گمان این بنده را بخواهی کُشت به تأویلی شرعی بکُش تا در قیامت مأخوذ نباشی. گفت: تأویل چگونه است؟ گفت: اجازت فرمای تا وزیر را بکُشم آن‌گه فرمای تا مرا به قصاص بکُشند تا به حق کشته باشی. مَلِک بخندید. وزیر را گفت: چه مصلحت می‌بینی؟ گفت: ای پادشاه، از بهرِ خدای، به صدقه‌ی گورِ پدرت این شوخ دیده را رها کن تا مرا در بلایی نیفگند. گناه از من است که قولِ حکما معتبر نداشتم که گفته‌اند:

**چو کردی با کلوخ انداز پیکار — سرِ خود را به دستِ خود شکستی**
**چو تیر انداختی در روی دشمن — حذر کن کاندر آماجش نشستی**

## حکایت [۲۴]

مَلِک زوزَن را خواجه‌ای بود کریم‌النّفس، نیک محضر که هم‌گنان را در مواجه خدمت

هەموان لە ڕوو خزمەتیان ئەکرد. لە پاشملەیش باشیان ئەوت.[1] واڕێکەوت کردارێکی نواند لای پادشا پەسەند نەبوو، فەرمانیدا بە گرتنی، سەرهەنگانی پادشا لەبەر ئەوە بەخشایشی ڕابردوویان لەبەرچاو بوو، وە خۆیان بە بارمتەی سوپاسی ئەزانی. لە کاتی چاودێریانا نەرمییان نواند، وە تووڕەیی و سزادانیان ڕەوا نەدی.

گەر لەگەڵ دوژمن بە ڕێکی حەزئەکەی ئەو پاشملە

عەیبی تۆ با هەر بڵێ تۆ مەدحی کە وەك هەمدەمی

خۆ وتاری هەر لە دەم دێتە دەرێ پیاوی خراپ

گەر وتەی تاڵ ئارەزوو ناکەی دە شیرین کە دەمی

ئەوەی پادشا لێی دەویست هەندێکی لە ئەستۆ داماڵی، لە باتی ئەوەی مابوو لە زیندانا مایەوە. یەکێ لە پاشایانی دەورو پشت [بە پەنهانی] پەیامی بۆ نارد کە پادشایانی ئەو دەورە قەدری گەورەی وایان نەزانی و بەبێ حورمەتی تەماشایان ئەکرد. ئەگەر بڕیاری شیرینی فڵان ـ خوا ڕزگاری کات ـ ڕوو لە ئێمە بێت بۆ ئاگاداری دڵی هەرچی کۆششی تەواوتر بێت بەجێ دێت. گەورە پیاوانی ئەم وڵاتە پێویستیان هەیە بە دیداری، وە بۆ وەڵام چاوەنواڕی ئەکەن.

مامۆستا کە ئەمەی زانی کەوتە ترسەوە، کوتووپڕ وەڵامێکی کورتی دایەوە، ئەگەر دەرکەوێت نەبێتە بەڵا، لە پشتی نامەکە نووسیی و ڕوانەی کردەوە. دەس و پێوەند پێیان زانی، پادشایان تێگەیاند کە فڵان کە تو بەندت کردووە لەگەڵ پادشایانی دەورو پشت کاغەزو کاغەزکاری هەیە. پادشا هاتەوە یەك. بۆ دەرخستنی ئەم هەواڵە فەرمووی پەیامبەریان گرت و نامەیان خوێندەوە نووسرابوو: باوەڕی جوانی گەورەپیاوان لە زانایی ئێمە زیاترە، هاتنی ئێمەتان قەبووڵ فەرمووە لە وزەی بەندەدا نییە لەبەر ئەوەی پەروەدەی نیعمەتی ئەم خانەدانەم بەکەم مایەیەکی گۆڕانی دڵێ بێوەفایی لەگەڵ ئەم خاوەن نیعمەتی دێرینەم ناتوانم بکەم، [کە بێ وەفایی کردن کاری عاقڵان نییە].

---

(١) لە ڕوو خزمەتی هەموانی ئەکرد و لە پاشملەیش باسی چاکیی هەموانی ئەوت. دەقە فارسییەکەی بەردەست ئێمە: «همگنان را در مواجهه خدمت کردی و در غیبت نیکویی گفتی»، ـع.

کردی و در غیبت نکویی گفتی. اتفاقاً حرکتی از او در نظرِ سلطان ناپسند آمد. مصادره کرد و عقوبت فرمود. سرهنگانِ مَلِک به سوابقِ اِنعامِ او معترف بودند و به شکرِ آن مُرتَهَن. در مدّتِ توکیلِ او رفق و ملاطفت کردندی و زجر و معاقبت روا نداشتندی.

**صلح با دشمن اگر خواهی هر گه که تو را**
**در قفا عیب کند، در نظرش تحسین کن**
**سخن آخر به دهان می‌گذرد موذی را**
**سخنش تلخ نخواهی دهنش شیرین کن**

آن‌چه مضمونِ خطابِ مَلِک بود از عهده‌ی بعضی به در آمد و به بقیّت در زندان بماند. یکی از ملوکِ نواحی در خُفیه پیغامش فرستاد که ملوکِ آن طرف قدرِ چنان بزرگواری ندانستند و بی‌عزّتی کردند. اگر رایِ عزیزِ فلان، اَحْسَنَ اللّٰهُ خَلاَصَهُ، به جانبِ ما التفات کند در رعایتِ خاطرش هرچه تمامتر سعی کرده شود و اعیانِ این مملکت به دیدارِ او مُفتَقِرند و جوابِ این حروف را منتظر.

خواجه بر این وقوف یافت و از خطر اندیشید. در حال جوابی مختصر، چنان که مصلحت دید، بر قفای ورق بِنِشت و روان کرد.

یکی از متعلّقانِ مَلِک که بر این واقف بود مَلِک را اعلام کرد که فلان را که حبس فرموده‌ای با ملوکِ نواحی مراسله دارد. مَلِک به هم برآمد و کشفِ این خبر فرمود. قاصد را بگرفتند و رسالت را بخواندند. نِبشته بود که حُسنِ ظَنِّ بزرگان در حقِ این ضعیف بیش از فضیلتِ اوست و تشریفِ قبولی که ارزانی فرموده‌اند بنده را امکانِ اجابتِ آن نبوَد، به حکمِ آن که پرورده‌ی نعمتِ این خاندانم و به اندک مایه تغیّرِ خاطر با ولی‌نعمت بی‌وفایی کردن نه کارِ خردمندان است.

پیاوێ لە سەرت هەبێ لە هەردەم کەرەمێ

بیانووی بدەرێ گەر کردی لە عومری ستەمێ

پادشا ڕەوشتی حەق ناسینی پێ خۆش بوو، خەڵاتی کردو بەخشایشی تازەی دایەوە، عوزر خواهی کرد کە تۆم بێ سووچو تاوان ئازار داوە وتی: ئەی خاوەنم من هیچ هەڵەیەك بۆ خاوەنم نابینم، بەڵێ بڕیاری خوا وابوو کە بەندە تووشی ناخۆشی ببم، جا بە دەستی تۆ چاکترە کە بەخشایشی ڕابردووت لەسەر ئەم کۆیلەیە هەیە، وە بەخشایشی شایانی شانازیت هەیە. حەکیمان وتوویانە:

| | |
|---|---|
| کەسێ پێوەدایت لێی مەبە بەڕەنج | پێت ناگا لە کەس حەسانەوەو ڕەنج[١] |
| هەر لە خواوەیە دوژمنیو دۆستی | دڵی هەردوولا کەوا بە دەستی |
| گەرچی دەر ئەچێ تیر لە کەمانا | لە خاوەن کەمان ئەبینێ دانا |

## چیرۆك (٢٥)

بیستم یەکێ لە پادشایانی عەرەب بە فەرمانبەرانی دیوانی وت: کە مووچەی فڵان ئەوەندەی هەیە دووچەندانەی کەن کە هەمیشە وا لە دەرگاو چاوەڕوانی فەرمانە. خزمەت گوزارەکانی تر بە گاڵتەو یاری کردنەوە خەریکن، وە لە بەجێ هێنانی خزمەتا سستی ئەکەن. خاوەن دڵی بیستی، هاواری کرد، وە جۆشێ لە دەروونیەوە هاتەدەر. لێیان پرسی: چیت دی؟ وتی: پایەی کۆیلەکان لە دەرقاپیی خوادا بەم چەشنەیە.

| | |
|---|---|
| دوو بەیان کەسێ بێتە خزمەت شا | سێهەم ئەبینێ لێی لوتفو نیگا |
| بۆ خواپەرستی ڕاستییە هیوا | کە بێ بەش نەبی لە خزمەت خوا |

* * *

| | |
|---|---|
| بەرزی وا لە ناو فەرمان جێ هێنان | بێ هیوایی یە فەرمان واز هێنان[٢] |
| کەسێ نیشانەی ڕاستی تێدایە | سەری خزمەتی لە بەر دەرگایە |

---

(١) کەسێ دای پێتۆ، لێی مەبە دڵڕەنج بەدەس کەس نییە، نەڕەنجو نە گەنج،-«ك».

(٢) کاری هیوا دار ئەوین دارییە بێ ئەمری دڵبەر گوناباریە،-«ك».

آن را که به‌جای تست هر دم کَرَمی　　عذرش بنه ار کند به عمری ستمی

مَلِک را سیرتِ حق‌شناسی از او پسند آمد و خلعت و نعمت بخشید و عذر خواست که خطا کردم که تو را بی‌گنه بیازردم. گفت: ای مَلِک من تو را در این که کردی خطایی نمی‌بینم بلکه تقدیرِ باری، عَزَّاسْمُهُ، چنان بود که مرا مکروهی رسد. پس به دستِ تو اولی‌تر که حقوقِ سوابقِ نعمت داری و اَیادیِ منّت و حکما گفته‌اند:

گر گزندت رسد ز خلق مرنج　　که نه راحت رسد ز خلق و نه رنج
از خدا دان خلافِ دشمن و دوست　　که دلِ هردو در تصرّفِ اوست
گر چه تیر از کمان همی گذرد　　از کماندار بیند اهلِ خرد

## حکایت [۲۵]

یکی از ملوکِ عرب شنیدم متعلّقانِ دیوان را فرمود که مرسومِ فلان را چندان که هست مضاعف کنید که مُلازِمِ درگاه است و مترصّدِ فرمان و سایرِ خدمتگاران به لهو و لعب مشغول و در ادای خدمت مُتَهاوِن. صاحب‌دلی بشنید و گفت: علّوِ درجاتِ بندگان به درگاهِ حق تَعالیٰ همین مثال دارد.

دو بامداد اگر آید کسی به خدمتِ شاه　　سیُم هرآینه در وی کند به لطف نگاه
امید هست پرستندگانِ مخلص را　　که ناامید نگردند از آستانِ الٰه

***

مهتری در قبولِ فرمان است　　ترکِ فرمان دلیلِ حرمان است
هرکه سیمای راستان دارد　　سرِ خدمت بر آستان دارد

## چیرۆك (٢٦)

ئەگێڕنەوە ستەمکارێك داری هەژارانی ئەکڕی بەستەمو بە دەوڵەمەندانی ئەفرۆشت بە کەم. پیاو چاکێ بە لایا تێپەڕیو وتی:

بۆچی ماری هەر کەسێکت دی ئەبێ تۆ پێوەدەی؟

کونەبوویت نیشتی بە هەر جێوە ئەبێ وێرانی کەی؟

* * *

| | |
|---|---|
| لە ئێمە بڕوا زۆرت، بە لای خوا | ناڕوا، زانایە خوا بە پەنهان |
| زۆرداری مەکە لە ئەهلی زەمین | دوعایان ئەچێ هەتا ئاسمان |

زاڵم لە وتەی ڕەنجاو لە ئامۆژگاری ڕووی هێنایەوە یەك. ئاوڕی لێ نەدایەوە. ﴿وَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ﴾[1] هەتا شەوێك ئاگر لە چێشتخانەوە لە لێژانەدار بەربوو، چی موڵکی هەبوو پێوە سووتا، لە دۆشەکی نەرمەوە لەسەرخۆڵەمێشی گەرم دابنا. وا ڕێکەوت هەر ئەو پیاوە بەلایا ڕابووردکە لەگەڵ هاوڕێیانا ئەیوت: نازانم ئەم ئاگرە لەکوێوە هات بۆ خانووی من؟ فەرمووی لە دووکەڵی دڵی دەروێشانەوە.

| | |
|---|---|
| لە ئاهی دڵی دەردمەند دوور کەوە | برینی دەروون خۆی نومایان ئەکا |
| دڵی کەس مەڕەنجێنە گەر بۆت کرا | کە ئاهێ جیهانێ پەرێشان ئەکا |

(وردی) لە تاقی هەیوانی کەیخوسرەو نووسرابوو:

تەمەنهای درێژ ساڵەهای ساڵ

بەسرمانا دێن ئێمە واین لە چاڵ

وەکو دەس بە دەس موڵکمان هاتە دەس

هەروا ئەچێتە دەسی گەڵێ کەس

## چیرۆك (٢٧)

یەکێك لە زۆران بازیا هەڵکەوتبوو، سێ سەدو شەست چەشنی بە نرخی ئەزانی، هەر ڕۆژێ بە جۆرێ لەوانە زۆرانی ئەگرت. مەگەر گوشەیەکی دڵی لەگەڵ جەماڵی یەکێ لە

---

(١) غیرەتی گوناحی جۆشا، دەسەڵاتی گوناح گرتی، سەرکەشی بەرەو گوناح بردی ـك.

## حکایت [۲۶]

ظالمی را حکایت کنند که هیزمِ درویشان خریدی به حیف و توانگران را دادی به طرح. صاحب‌دلی بر او بگذشت و گفت:

**ماری تو که هر که را ببینی بزنی ‌ ‌ یا بوم که هر کجا نشینی بکَنی**

***

**زورت ار پیش می‌رود با ما ‌ ‌ با خداوندِ غیب‌دان نرود**

**زورمندی مکن بر اهلِ زمین ‌ ‌ تا دعایی بر آسمان نرود**

حاکم از این سخن برنجید و روی از نصیحتِ او درهم کشید و بر او التفاتی نکرد، **اَخَذَتْهُ اْلعِزَّةُ بِالْإِثْمِ**، تا شبی آتشِ مطبخ در انبارِ هیزمش افتاد و سایرِ املاکش بسوخت و از بسترِ نرمش به خاکسترِ گرم نشاند. اتفاقاً همان شخص در گذار بود و شنید که با یاران می‌گفت: ندانم این آتش از کجا در انبارِ هیزم افتاد. گفت: از دودِ دلِ درویشان.

**حذر کن ز دودِ درون‌های ریش ‌ ‌ که ریشِ درون عاقبت سر کند**

**به هم بر مکن تا توانی دلی ‌ ‌ که آهی جهانی به هم برکند**

بر تاجِ کی‌خسرو شنیدم که نِبشته بود:

**چه سال‌های فراوان و عمرهای دراز**
**که خلق بر سرِ ما بر زمین بخواهد رفت**
**چنان که دست به دست آمده‌ست مُلک به ما**
**به دست‌های دگر هم‌چنین بخواهد رفت**

## حکایت [۲۷]

یکی در صنعتِ کُشتی گرفتن سرآمده بود چنان که سیصد و شصت بندِ فاخر بدانستی و هر روز به نوعی کشتی گرفتی. مگر گوشه‌ی خاطرش با جمالِ یکی از

شاگردەکانیا مەیلی هەبوو، سێ‌سەدو پەنجاو نۆ چەشنی فێرکرد مەگەر چەشنێکی نەبێ لە فێرکردنیا خۆی دوور ئەگرت‌و دووای ئەخست. کوڕە لە هێزو پیشەی زۆران بازی‌یا هەڵکەوت. لەوکاتەدا کەسێ نەبوو لە زۆران بازی‌یا بەرانبەری بکات تا ئەندازەیەك لای پادشای ئەو ڕۆژە وتبووی، وەستام ئەگەر لە من زیاتر بێ لە ڕووی گەورەیی‌و پەروەردەی منەوەیە،[1] ئەگینا بە هێز لەوکەمتر نیم، وە بە پیشەو چەشن لەگەڵیا بەرابەرم.

پادشا ئەم وتە[بی ئەدەبانە]ی لاگران بوو، وتی: ئەبێ زۆران بگرن. شوێنێکی فراوانیان ڕێك‌خست ئەنجا هاوکارانی دەوڵەت‌و بە ڕواڵەتەکانی دیوان‌و زۆرئاوەران کۆکرانەوە. کوڕە وەکوو فیلی مەست هات بە هەڵمەتێ ئەگەر کێوی ئاسن بوایە لە بنی هەڵ ئەکەند، وەستا زانی نەوجوان بە هێز لەو زیاترە، بەو چەشنە سەیرە کە لێی پەنهان کردبوو لەگەڵیا تێ‌هەڵچوو. کوڕە نەیتوانی ئەو فێڵە لە خۆی دوور خاتەوە، هاتەوەیەك، وەستا لە زەمینی هەڵگرت بە هەردوو دەست بردیە سەرسەری‌و دای بەزویدا. گرمە لە خەڵك هەڵسا. پادشا خەڵات‌و بە خششی دا بە وەستاو لە کوڕە تووڕە بوو، وە تانووتی لێ‌دا کە لەگەڵ یەکێ کە پەروەردەی کردووی داوای بەرانبەریت کردو نەیشت بردە سەر. وتی: ئەی پادشای ڕووی زەمین بە زۆرئاوەری بە سەر منا دەستی نەبوو، بەڵکە لە پیشەی زۆرانا وردی‌یکی[2] مابوو کە لە هەموو عومرا لە من درێغی کرد. ئەمڕۆ بەو وردییە بەسەر منا زاڵ بوو. وەستا وتی: بۆ ڕۆژێکی وەهام ئاگاداری ئەکرد، چونکە زیرەکان وتوویانە ئەوەندە هێز مەدە بە دۆست بتوانێ دوژمنایەتیت لەگەڵ بکا. نەت بیستووە ئەو کەسەی لە پەروەردەکراوی خۆی جەفای دی چی وتوە؟:

| | |
|---|---|
| یــا وەفــا نــەبوە خــۆی لە عــالەما | یا هیچ کەس نەی کردە خۆ لەم زەمانە |
| کەس نەبوو فێر بێ عیلمی تیر لە مـن | مـەگـەر دوایـی مـنی کـرد بـە نـیشانە |

(١) ئەگەر بـڵێین: لە ڕووی گەورەیی‌و پەروەردە کـردنی مـنەوەیە، بـە دەقـە فـارسییەکـەوە نزیکترە.«ك».

(٢) ورد: شتێکە دروشت نە بێ، واتە: مـامۆسـتاکـەم فـێڵ‌و چـەشنێکی زۆر بـاریك‌و کـەس پێ‌نەزانی مابوو، پێ نەوتم.«ك».

شاگردان میلی داشت. سیصد و پنجاه و نُه بندْ وی را درآموخت مگر یک بند که در تعلیمِ آن دفع انداختی و تهاون کردی. فی الجمله پسر در قوّت و صنعت سرآمد و کس را با او مجالِ مقاومت نبود تا به حدّی که پیشِ مَلِکِ وقت گفته بود: استاد را فضیلتی که بر من است از روی بزرگی است و حقِ تربیت وگرنه به قوّت از او کمتر نیستم و به صنعت با او برابرم.

مَلِک را این ترکِ ادب ناپسند آمد. بفرمود تا مصارعت کنند. مقامی متّسع ترتیب کردند و ارکانِ دولت و اعیانِ حضرت و زورآورانِ اقلیم گرد آمدند. پسر چون پیلِ مست درآمد به صدمتی که اگر کوهِ آهنین بودی از جا بکندی. استاد دانست که جوان از او به قوّت‌ترست به آن یک بندِ غریب که از وی نهان داشته بود با او درآویخت. پسر دفعِ آن ندانست به سر درآمد. استاد از زمینش برداشت، به بالای سر برد و فرو کوفت. غریو از خلق برآمد. مَلِک فرمود استاد را نعمت و خلعت دادند و پسر را زجر و ملامت کردند که با پرورانندهٔ خود دعوی کردی و به سر نبردی. گفت: ای خداوند به زورآوری بر من دست نیافت بلکه مرا از علمِ کُشتی دقیقه‌ای مانده بود و از من دریغ می‌داشت. امروز بدان دقیقه بر من دست یافت. گفت: از بهرِ چنین روزی نگاه می‌داشتم که حکما گفته‌اند: دوست را چندان قوّت مده که اگر دشمن گردد بر تو غالب شود. نشنیده‌ای که چه گفت آن که از پروردهٔ خویش جفا دید:

یا وفا خود نبود در عالَم — یا مگر کس در این زمانه نکرد

کس نیاموخت علمِ تیر از من — که مرا عاقبت نشانه نکرد

## چیرۆك (٢٨)

دەروێشێ بە تەنیا لە گۆشەی دەشتێ دانیشتبوو. پادشایەك بە لایا ڕۆیشت. دەروێش لەو شوێنە کە بێ خەیاڵە لە موڵکی قەناعەتا ڕووی بە لایا وەرنەگێڕا. پادشا کە شوێن هەڵمەتی دەسەڵاتی سوڵتانییە، ڕەنجاو وتی: ئەم هۆزی خەرقە پۆشانە وەکوو حەیوانات وانە شایستەی ئادەمیزاد نین. وەزیر هاتە نزیکیەوە پێی‌وت: ئەی جوانمەرد پادشای ڕووی زەمین بەلاتا ڕابوورد خزمەتت نەکردو مەرجی ڕەوشتو شێوەت بەجێ نەهێنا. وتی: بە پادشا بڵێ: چاوەڕوانی خزمەتی کەسێ بێت کە چاوی لە بەخششیەتی، وە ئەوەیش بزانێ پادشایان بۆ پاسەوانی گەلن، نەوەك گەل بۆ گەردن کەچی پادشایان.

| | |
|---|---|
| پادشا پاسەوانی دەروێشە | گەرچی ئارامی وا بە دەوڵەتی ئەو |
| خزمەتی شوان نەویستراوە لە مەڕ | شوان ئەگیرێ بکا کە خزمەتی ئەو |

(پارچە)

| | |
|---|---|
| گەر کەسێکت بە کامەران دی | یەکێکی‌تر لە کۆششا دڵڕێش |
| لێی‌گەڕێ چەند ڕۆژێ تا ئەیخوا | خاك مێشکی سەری خەیاڵ‌ئەندێش |
| شاهی‌و کۆیلە یی لە ناو هەڵەسێ | سەرنویشتی خوا کە هاتە پێش |
| گەر کەسێ خاکی مردوێك لادا | کەی ئەزانێ غەنی بووە یا دەروێش |

پاشا وتاری دەرویشی لا پتەو بوو، وتی: شتێك لە من داوا بکە، وتی: ئەوەم ئەوێت جارێکی‌تر زەحمەت بە من نەدەیت. وتی: سا پەندێکم بدەرێ. وتی:

| | |
|---|---|
| چنگی‌خە ئێستا نیعمەتت لا هەس | ئەم موڵك‌و ماڵە ئەڕوا دەس بە دەس |

## چیرۆك (٢٩)

یەکێ لە وزیران چووە لای ذوالنونی میسری هیممەتی لێ خواست کە شەوو ڕۆژ خەریکی خزمەتی پادشام‌و بە چاکەی هیوادارم‌و لە سزای لە ترسام. ذوالنون گریا، فەرمووی ئەگەر من خوای گەورەم ئەوەندە بپەرستایە کە تۆ پادشا ئەپەرستی، بێ گومان لە ڕێزی سدیقان ئەبووم.

| | |
|---|---|
| نەبوایە هیوای حەسانەوەو ڕەنج | دەروێش هەردوو پێی ئەگەییە فەلەك |
| وەزیر گەر لە خوا هێند بترسیایە | وەکوو لە پادشا، ئەبووە مەلەك |

## حکایت [۲۸]

درویشی مجرّد به گوشه‌ی صحرایی نشسته بود. یکی از پادشاهان بر او بگذشت. درویش ازان جا که فراغِ مُلکِ قناعت است سر برنیاورد و التفاتی نکرد. سلطان ازان جا که سَطْوَتِ سلطنت است به هم برآمد و گفت: این طایفه‌ی خرقه‌پوشان امثالِ حیوانند و اهلیّت و آدمیّت ندارند. وزیر نزدیکش آمد و گفت: ای درویش، پادشاهِ وقت بر تو بگذشت چرا سر برنیاوردی و شرایطِ ادب به تقدیم نرسانیدی؟ گفت: مَلِک را بگوی که توقّعِ خدمت از کسی دار که توقّعِ نعمت از تو دارد. دیگر بدان که ملوک از بهرِ پاسِ رعیّتند، نه رعیّت از بهرِ طاعتِ ملوک.

پادشه پاسبانِ درویش است | گرچه نعمت به فرِّ دولتِ اوست
گوسفند از برایِ چوپان نیست | بلکه چوپان برای خدمتِ اوست

***

یکی امروز کامران بینی | دیگری را دل از مجاهده ریش
روزکی چند باش تا بخورد | خاک، مغزِ سرِ خیال اندیش
فرقِ شاهی و بندگی برخاست | چون قضای نِبِشته آمد پیش
بالله ار خاکِ مرده باز کنند | ننماید توانگر از درویش

مَلِک را گفتارِ درویش استوار آمد، گفت: چیزی از من بخواه. گفت: می‌خواهم که دیگر زحمتِ من ندهی. گفت: مرا پندی بده. گفت:

دریاب کنون که نعمتت هست به دست
کاین نعمت و مُلک می‌رود دست به دست

## حکایت [۲۹]

یکی از وزرا پیشِ ذوالنّونِ مصری آمد و همّت خواست که روز و شب به خدمتِ سلطان مشغولم و به خیرش امیدوار و از عقوبتش ترسان. ذوالنون بگریست و گفت: اگر من خدای را چنان پرستیدمی که تو سلطان را، از جمله‌ی صدّیقان بودمی.

گر نبودی امیدِ راحت و رنج | پای درویش بر فلک بودی
ور وزیر از خدا بترسیدی | همچنان کز مَلِک، مَلَک بودی

## چیرۆك (٣٠)

پادشایەك فەرمانی کوشتنی بێگوناهێکی دا، وتی: ئەی پادشا بە هۆی ڕقێ لە منتە خۆت ئازاری خۆتت نەوێ، چونکە ئەم سزایە بە یەك هەناسە بەسەر منەوە ئەچێتە سەر، وەگوناهی جاویدانی لەسەرتۆ ئەمێنێ.

وەکوو بای دەشتی دەورانی بەقا چوو | لە تاڵیو خۆشی جوانی و ناشیرین ڕوو
ستەم کارێ ئەگەر کردی ستەم لێم | لە ئەستۆی مایەوە لاچوو لە من زوو

پادشا ئامۆژگاری ئەوی لاپەسەند بوو، لە کوشتنی چاوپۆشی کرد.

## چیرۆك (٣١)

وەزیرانی ئەنەوشیرەوان لە ئیشێکی گرنگی وڵات لە ترسابوون، هەریەکە بیرو باوەڕێکی خستە ڕوو. نەوشیرەوانیش بڕیاری خۆی خستە ڕوو. بوزورجمیهر بیروباوەڕی نەوشیرەوانی پەسەندکرد. بە نهێنی پێیان وت: لە بیرو بڕیاری پادشادا چ زیادییەکت دی بەسەر بیرو بڕیاری ئەم هەموو حەکیمانەدا؟ وتی: بە هۆی ئەوەوە ئەنجامی ئیش دیار نییە، وە بیرو باوەڕی هەموان بەستەی ئارەزووی خوایە ئایا ڕێك دێت یا هەڵە. جا ڕێکی بۆ بیرو بڕیاری پادشا باشترە ئەگەر ڕێکی ڕاستی نەبوو بە پەیرەویی ئەو لە سزا دڵنیا ئەبم.

لەگەڵ بڕیاری شادا پێچەوانە
ئەبێ دەس شۆیت لە خوێنو پێت نەوێ ژین
ئەگەر پادشا بە ڕۆژی وت شەوە، تۆ
بڵێ هەڵهاتووە وا مانگو پەروین

## چیرۆك (٣٢)

فریودەرێك مووی سەری هۆنییەوە کە من لە نەتەوەی عەلیم، لەگەڵ کاروانی حیجازدا هاتە شارێك وتی: لە حەج هاتوومەتەوە، وە قەسیدەیەك شیعری بردە لای پادشا وتی: من وتوومە، بەخششی دایەو دڵنەوایی کردو حورمەتی زۆری گرت. یەکێ لە هاونشینانی پادشا ئەو ساڵە لە سەفەری دەلیا هاتبووە وتی: ڕۆژی جەژنی قوربان ئەمەم لە

## حکایت [۳۰]

پادشاهی به کشتنِ بی‌گناهی فرمان داد. گفت: ای پادشاه به واسطه‌ی خشمی که تو را بر من است آزارِ خود مجوی. گفت: به چه معنی؟ گفت: از برای آن که این عقوبت بر من به یک نَفَس به سر آید و بزه‌ی آن جاوید بر تو بماند.

دورانِ بقا چو بادِ صحرا بگذشت　　تلخی و خوشی و زشت و زیبا بگذشت
پنداشت ستمگر که جفا بر ما کرد　　در گردنِ او بماند و بر ما بگذشت

مَلِک را نصیحتِ او سودمند آمد و از سرِ خونِ او برخاست.

## حکایت [۳۱]

وزرای نوشیروان در مهمّی از مصالحِ مملکت اندیشه همی کردند و هریک رایی همی زدند و مَلِک هم‌چنین تدبیری اندیشه همی کرد. بزرجمهر را رایِ مَلِک اختیار آمد. وزیران در خُفیه پرسیدند که: رایِ مَلِک را چه مزیّت دیدی بر فکرِ چندین حکیم؟ گفت: به موجبِ آن که انجامِ کار معلوم نیست و رایِ هم‌گنان در مشیّت است که صواب آید یا خطا. پس موافقتِ رایِ مَلِک اولی‌ترست تا اگر خلافِ صواب آید به علّتِ متابعت او از معاتبت ایمن باشم.

خلافِ رایِ سلطان رای جُستن　　به خونِ خویش باشد دست شُستن
اگر خود روز را گوید شب است این　　بباید گفتن اینک ماه و پروین

## حکایت [۳۲]

شیادی گیسوان بافت که من عَلَویَم و با قافله‌ی حجاز به شهر در رفت که از حج همی آیم و قصیده‌ای پیشِ مَلِک برد یعنی خود گفته‌ام. نعمتِ بسیار فرمودش و اکرام کرد. تا یکی از ندیمانِ مَلِک که در آن سال از سفرِ دریا آمده بود گفت: من او را عیدِ اَضْحیٰ در بصره دیدم حاجی چگونه باشد؟! دیگری گفت: من او را می‌شناسم. پدرش نصرانی بود

بەسرە دیوە چۆن بوو بە حاجی؟ یەکێکی تر وتی: ئەمە باوکی لە "ملتیە"[١] گاور بوو چۆن بوو بە نەتەوەی عەلی؟ شیعرەکانیشیان لە دیوانی ئەنوەریدا دۆزییەوە. پادشا وتی: لێی دەن‌و دووری خەنەوە، ئەم هەموو درویەی بۆچ کرد؟ وتی: ئەی خاوەنی ڕووی زەمین وتەیەکم ماوە بیڵێم لە خزمەتتا ئەگەر ڕاست نەبوو بە هەر سزایە ئەفەرموون شایستەم. وتی: چییە؟ وتی:

غەریبێ ئەگەر ماستی هێنا لە بۆت　　دوو پێوانە ئاوە لەگەڵ کەچکێ دۆ

مەڕەنجە لە من گەر درۆم کرد لەلات　　جیهان دیدە ئەیڵێ بە زۆری درۆ

پادشا پێکەنین گرتی، وتی: لەمە ڕاستترت لە تەمەنی خۆتا نە وتوە، وتی: چی هیوایە بۆی ئامادە کەن با بە خۆشی بڕوا.

## چیرۆك (٣٣)[٢]

وەزیرێك بەزەیی بە ژێر دەستانا ئەهاتەوەو بۆ چاکەیان تێ ئەکۆشا، وا ڕێکەوت کە بە فەرمانی پادشا گیرا، هەموو لا بۆ بەردانی کەوتنە کۆشش و ئەوانەی سزادانی ئەمیان پێ سپێرابوو، بە نەرمی‌و جوانی لەگەڵیا جووڵانەوەو پیاوە گەورەکان ستایشی کرداری باشیان کرد، تا پادشا چاوی لە هەڵەو سووچی پۆشی، پیاو چاکێك ئاگای لەم کارە بوو وتی:

تا دڵی دۆستان بهێنیتە دەست　　باغی میراتی باوکت بفرۆشە

وازبێنە ماڵت هەموو بسوتێ　　بۆ مەنجەڵی دۆست کەوا لە جۆشە

بۆ بەدیش چاك بە، دەمی سەگ گرتن　　بە پاروویە نان، کاری بە هۆشە

## چیرۆك (٣٤)

یەکێ لە کوڕانی هارون الرشید هاتە لای باوکی بە قینەوە وتی: کە فڵان سەر سوپازادە جنێوی بە دایکم داوە. هاڕون بە پایەکانی دەوڵەتی وت: سزای کەسێکی وا ئەبێ چی بێ؟ یەکێ ئیشارەتی کرد بە کوشتنی، یەکێ زمان بڕینی، یەکێ بە ماڵ داگیر کردنی‌و دوور

---

(١) ملتیە: لەو سەردەمەدا ناوی شارۆچکەیەك بووە لە ئاسیای چکۆلە لە نزیکی شام دا،ـ «ك».

(٢) ئەم چیرۆکە لە دەسنووسەکەی خوالێخۆشبووی باوکما نەبوو وا من کردم بە کوردی هیوادارم لە شێوەکەی ئەو لام نەدابێ ـ «ع.م»

در مَلَطیه پسر، عَلَوی چگونه باشد؟ و شعرش را همان روز در دیوانِ انوری یافتند. مَلِک بفرمود تا بزنندش و نفی کنند تا چندین دروغ درهم چرا گفت. گفت: ای مَلِک یک سخنِ دیگر در خدمت بگویم اگر راست نباشد به هر عقوبت که خواهی سزاوارم. گفت: بگوی تا چیست. گفت:

غریبی گرت ماست پیش آورد　　دو پیمانه آب است و یک چمچه دوغ
گر از بنده لَغوی شنیدی ببخش　　جهاندیده بسیار گوید دروغ

مَلِک را خنده گرفت، گفت: از این راست‌تر سخن تا عمرِ تو بوده است نگفته‌ای. فرمود تا آن‌چه مأمولِ اوست مهیّا دارند تا به دلخوشی برود.

## حکایت [۳۳]

یکی از وزرا زیردستان را رحمت آوردی و صلاحِ هم‌گنان را به خیر توسطّ کردی. اتفاقاً به خطابِ مَلِک گرفتار آمد. هم‌گنان در استخلاصِ او سعی کردند و گماشتگان در عقوبتش ملاطفت نمودند و بزرگان ذکرِ سیرتِ خوبش به افواه بگفتند تا مَلِک از سرِ خطابِ او درگذشت. صاحب‌دلی بر این سخن مطّلع گشت و این بیت بگفت:

تا دلِ دوستان به دست آری　　باغ و مِلکِ پدر فروخته به
پختنِ دیگ نیک‌خواهان را　　هرچه رختِ سراست سوخته به
با بداندیش هم نکویی کن　　دهنِ سگ به لقمه دوخته به

## حکایت [۳۴]

یکی از پسرانِ هارونُ الرّشید پیشِ پدر آمد خشمناک که فلان سرهنگ‌زاده مرا دشنامِ مادر داد. هارون جلسای حضرت را گفت: جزای چنین کس چه باشد؟ یکی اشارت به کشتنش کرد و دیگری به زبان بریدن و دیگری به مصادره کردن و نفی. هارون پسر را

خستنەوەی لە وڵات. هارون وتی: کوڕم کەرەم ئەوەیە لێی ببووریت، و ئەگەر ناتوانی تۆیش جنێوێ بدەیتەوە بە دایکی ئەوەندەی لە سنوور دەر نەچێ ئەگینا لە پاشان ستەم لە لایەنی تووە ئەبێ‌و داوا لە لایەن دوژمنتەوە.

لەلای ئەهلی عەقڵ کەی مەردە پیاوێ — لەگەڵ فیلی دەمانا بێتە پەیکار
کەسێ مەردە لە پیاوانا بە ڕاستی — کە قینی گرت نەڵێ باتڵ لە گوفتار[1]

## چیرۆك (٣٥)

لەگەڵ دەستەیەك لە گەورە پیاوان لە پاپۆڕا دانیشتبووم لە دوامانەوە بەلەمێ نوقم بوو. دوو برا کەوتبوونە گێژاوێکەوە. یەکێ لە گەورەکان بە مەلەوانی وت: ئەم دوانە بگرەوە بە هەر یەکێکیان پەنجا دینارت ئەدەمێ. هەتا یەکێکیانی گرتەوە ئەویان فەوتا. وتم: ماوە نەما بوو بۆ ژیانی بۆیە لە گرتنەوەی ئەویان دواکەوتی. مەلەوانەکە پێکەنی‌و وتی: ئەوەی تۆ وتت ڕاستەو هۆیەکی هەبوو. وتم: ئەوە چییە؟ وتی: ئارەزووی دڵی من لە ڕزگار کردنی ئەمەیان زۆرتر بوو. کاتێ لە بیابان ماندوو بووبووم ئەمەیان لەسەرحوشترەکەی سواری کردم، وە لە دەستی ئەویان قامچی‌یەکم خواردبوو لە منالّیدا. وتم: صَدَقَ اللّٰهُ الْعَظِيم، خوای گەورە ڕاستی فەرمووە ﴿مَنْ عَمِلَ صالِحاً فَلِنَفْسِهِ وَ مَنْ اَساءَ فَعَلَيْهَا﴾ (یانی: کەسێ کردەوەی چاك بکا بۆ نەفسی خۆیەتی‌و کەسێ خراپەی کرد لەسەرخۆیەتی).

چی ئەکەی تۆ دەروونی کەس مەکە ڕێش
چونکە لەم ڕێیە دڕکی زۆرت ئەبێ تووش
ئیشی دەروێشی بێ‌نەوا بکە تۆ
چونکە ئیشت ئەبێ بە زۆری تۆش

---

(١) لە چیرۆکی ژمارە ٣۴ دا تەرجەمەی دوو شیعر لە بیر چووە، هیوادارم تەرجەمەکەی «کۆلیل»تان بە دڵ بێ:

جنێوی دا بە چاکی، نالەبارێ — قبوولی کردو فەرمووی گیانە ئارێ
خراوتر زۆر لەوانەم، تۆ ئەڵێی پێم — کەمت وت بۆ منێکی شەرمەزارێ،- «ك».

گفت: ای پسر کرم آن است که عفو کنی و اگر به ضرورت انتقام خواهی تو نیزش دشنامِ مادر دِه، نه چندان که انتقام از حد بگذرد که آن‌گه ظلم از طرفِ تو باشد و دعوی از قِبَلِ خصم.

نه مردست آن به نزدیکِ خردمند | که با پیلِ دمان پیکار جوید
بلی مرد آن کس است از روی تحقیق | که چون خشم آیدش باطل نگوید

***

یکی را زشت‌خویی داد دشنام | تحمّل کرد و گفت: ای خوب فرجام
بتر زانم که خواهی گفتن آنی | که دانم عیبِ من چون من ندانی

## حکایت [۳۵]

با طایفه‌ی بزرگان به کشتی در، نشسته بودم. زورقی در پیِ ما غرق شد. دو برادر به گردابی درافتادند. یکی از بزرگان ملاّح را گفت: بگیر این هردو را تا صد دینارت بخشم. ملاّح در آب افتاد تا یکی برهانید دیگری مرده بود. گفتم: بقیّتِ عمرش نمانده بود از این سبب در گرفتنِ او تأخیر کرد و در آن دیگر تعجیل. ملاّح بخندید و گفت: آن‌چه تو گفتی یقین است. دیگر آن که میلِ خاطرِ من به رهانیدنِ این یکی بیشتر بود که وقتی در راه مانده بودم و مرا بر شتری نشاند و از دست آن یکی تازیانه خورده بودم در طفولیّت. گفتم: صَدَقَ اللّٰهُ: مَن عَمِلَ صالِحاً فَلِنَفْسِهِ وَ مَنْ أَساءَ فَعَلَيْها.

تا توانی درونِ کس مخراش | کاندر این راه خارها باشد
کارِ درویش مستمند برآر | که تو را نیز کارها باشد

## چیرۆك (٣٦)

دوو برا بوون یەکێکیان خزمەتی پادشای ئەکرد، ئەویان لە کۆششی بازووی خۆی ئەخوارد. جارێك دەوڵەمەند بە دەروێشی وت: بۆچی خزمەت ناکەیت هەتا لە ڕەنجی ئیشکردن ڕزگار ببیت؟ وتی: تۆ بۆچی ئیش ناکەیت هەتا لە سووکی خزمەتکردن ڕزگاریت دەسکەوێت هۆشیاران وتوویانە نانی جۆ خواردنو دانیشتن چاکترە لە پشتێنی زەڕین بەستنو لە خزمەت وەستان.

بەدەست ئاسنی گەرم پێ بکەی بە هەویر     نەوەك دەس لەسەر سنگو بەردەم ئەمیر

* * *

عومری گرانم لە دەس چوو لەوەی     هاوین چی بخۆم چی بەرکەم زستان

ئەی سکی بێشەرم دەنانێ بەس بێ     دووتا ئەکەی پشت لەلای ئەمیران

## چیرۆك (٣٧)

کەسێ موژدەی برد بۆ نەوشیرەوانی بەداد، وتی: بیستوومە کە فلان دوژمنی تۆ خوای گەورە هەڵی گرت. وتی: ئەی هیچت بیستووە لە ئێمەی وازهێنابێ؟

بەمەرگی دوژمن نابین شادمان     کە ئێمە دوای ئەو نابین جاویدان

## چیرۆك (٣٨)

کۆمەڵێ لە حەکیمان لە بارەگای کیسرادا لە کارسازییەك ئەدوان. بوزورجمیهر کە بچووکتریان[1] بوو بێدەنگ بوو. پرسییان لەم باسە بۆچی هیچ نادوێیت؟ وتی: وەزیران بە چەشنی پزشکانن، پزیشك دەرمان نادا بە نەخۆش نەبێ. جا بینیم بڕیاڕی ئێوە پێکاوە، وتنی من لە سەری کەڵکی نییە.

ئەگەر ئیش بێ وتاری من بەجێبێ     وتاری من ئیتر لەو ئیشە ناشێ

وەگەر دیم کوێرو چاڵێ وا لەلامە     ئەگەر بێدەنگ بیم ئەوسا حەرامە

---

(١) لە فارسییەکەدا بەم شێوەیە: «بزرجمهر کە مهتر ایشان بود» یانی: «بوزورجمیهر کە گەورەی ئەوان بوو»،ـع.

## حکایت [۳۶]

دو برادر یکی خدمتِ سلطان کردی و دیگر به سعیِ بازو نان خوردی. باری توانگر گفت درویش را: چرا خدمت نکنی تا از مشقّتِ کار کردن برهی؟ گفت: تو چرا کار نکنی تا از مذلّتِ خدمت رهایی یابی؟ که حکما گفته‌اند: نانِ خود خوردن و نشستن به از کمرِ زرّین به خدمت بستن.

به دست آهنِ تفته کردن خمیر　　　به از دست بر سینه پیش امیر

***

عمرِ گران‌مایه در این صرف شد　　　تا چه خورم صیف و چه پوشم شتا

ای شکمِ خیره به نانی بساز　　　تا نکنی پشت به خدمت دوتا

## حکایت [۳۷]

یکی مژده آورد پیشِ انوشروانِ عادل که: خدای تعالیٰ فلان دشمنت برداشت. گفت: هیچ شنیدی که مرا فرو گذاشت؟

اگر بمُرد عدو، جای شادمانی نیست　　　که زندگانیِ ما نیز جاودانی نیست

## حکایت [۳۸]

گروهی حکما در حضرتِ کسریٰ به مصلحتی در سخن می‌گفتند و بزرجمهر که مهترِ ایشان بود خاموش بود. گفتند: چرا با ما در این بحث سخن نمی‌گویی؟ گفت: وزرا بر مثالِ اطبّااند و طبیب دارو ندهد جز سقیم را. پس چون می‌بینم که رایِ شما بر صواب است مرا بر سرِ آن سخن گفتن حکمت نباشد.

چو کاری بی‌فضولِ من برآید　　　مرا در وی سخن گفتن نشاید

وگر بینم که نابینا و چاه است　　　اگر خاموش بنشینم گناه است

## چیرۆك (٣٩)

کاتێ هارونالرشید وڵگەی[١] میسری دەسکەوت، وتی: بە پێچەوانەی ئەو سەرکەشەکە بە سەرکەشی وڵاتی میسر لافی خوایەتیی لێدا ئەم وڵاتە نابەخشم مەگەر بە کەمترینی کۆیلەکان. ڕەشێکی هەبوو (خەسیب) ناو بە هەرزانی وڵگەی میسری دایە. ئەگێڕنەوە کە تێگەیشتنی لە ڕادەیەکا بوو کە کۆمەڵێ لە خاوەن کشتو کاڵ شکایەتیان هێنایە لا، کە پەموومان لە کەناری نیل چاندبوو، بارانی ناکاو هاتو پەمووی فەوتاندین. وتی: ئەبوایە خوریتان بچاندایە هەتا نەفەوتایە. خاوەنەکەی[٢] بیستیو وتی:

ڕزقو مووچە بە دانش ئەر ئەبوو زۆر تەنگ دەستی لە کوێ ئەبوو؟ لە نەفام

بە نەفەهمان بە جۆری مووچە ئەدا گەلێ دانای کە تیا ئەبێ سەرسام

* * *

کەی بەختو دەوڵەت بە ئیش زانییە بەڵکە بە هێزی ئاسمانییە

کیمیاگەر ئەمرێ بە سەغڵەتو ڕەنج شێت لە وێرانە تووشی ئەبێ گەنج

لەم جیهانەدا کەوتوون بێشومار گەورەو عاقڵان پەستو سووكو خوار

## چیرۆك (٤٠)

یەکێ لە پادشایان کەنیزەکێکی چینی هێنا. لە حاڵی مەستی‌یا ویستی لەگەڵی دروست بێ. کەنیزەك خۆی نەدا بە دەستەوە. پادشا قینی هەڵسا، بەخشی بە ڕەشێك کە لچی ژووری لە پەردەی لووتی تێپەڕیبوو، وە لچی ژێرووی بە یەخەیا شۆڕ بووبووەوە هەیکەلێکی بوو کە سەخری جنۆکە لە شێوەی ئەسڵەمی‌یەوە، وە سەرچاوەی قەتران لە بن باخەڵی ئەتکا.

ڕوو ناشیرینیت وەها ئەزانی بۆ ئەو ئەویەڕیەو بۆ یوسف جوانی[٣]

* * *

(١) وڵگە: وڵات، سەرزەمین. وڵگە بە زمانی هەورامی: جوانترین کچی پاشا. «گیو موکریانی».
(٢) لە زۆربەی نووسخە فارسییەکاندا نووسراوە: «دانشمندی درویش» یانی: زانایەکی هەژار-ع.
(٣) کاڵای زبرو زشت بە بەریا بریا هەروەك چۆن یوسف جوانی پێ بریا.-«ك».

## حکایت [۳۹]

هارون‌الرّشیدرا چون مُلکِ مصر مسلّم شد گفت: به خلافِ آن طاغی که به غرورِ مُلکِ مصر دعویِ خدایی کرد نبخشم این مُلک را مگر به خسیس‌ترین کسی از بندگان. سیاهی داشت خَصیب نام، مُلکِ مصر به وی ارزانی داشت. و گویند عقل و درایتِ آن سیاه تا به حدّی بود که وقتی طایفه‌ای حُرّاثِ مصر شکایت آوردندش که: پنبه کاشته بودیم در کنارِ نیل و بارانِ بی‌وقت آمد و تلف شد. گفت: پشم بایستی کاشت تا تلف نشدی. دانشمندی درویش این سخن بشنید و گفت:

اگر دانش به روزی در فزودی　　ز نادان تنگ‌روزی‌تر نبودی
به نادانان چنان روزی رساند　　که دانا اندران عاجز بماند

***

بخت و دولت به کاردانی نیست　　جز به تأییدِ آسمانی نیست
اوفتاده‌ست در جهان بسیار　　بی‌تمیزِ ارجمند و، عاقلِ خوار
کیمیاگر به غصّه مُرده و رنج　　ابله اندر خرابه یافته گنج

## حکایت [۴۰]

یکی را از ملوک کنیزکی چینی آورده بودند. خواست تا در حالتِ مستی با وی جمع شود. دختر ممانعت کرد. مَلِک در خشم رفت و او را به سیاهی بخشید که لبِ زَبَرینش از پرّه‌ی بینی درگذشته بود و زیرین به گریبان فرو هشته. هیکلی که صَخْرٱلْجِنّ از طلعتش برمیدی و عَینٱلْقِطْر از بغلش بدمیدی.

تو گفتی تا قیامت زشت‌رویی　　بر او ختم است و بر یوسف نکویی

***

دیـــمەن بـــەدی ئـــەو وا نـــەبوو لەوا    بـــتوانـــی بـــاس کـــەیت نـاشیرینی وا
بۆنی بـن دەسـتی هـەر پـەنا بـە خـوا    وەك لاكـــی مـــردار لەبـــەر هـــەتاوا

گێڕاویانەتەوە کە لەو کاتەدا نەفسی داوای لێ کرد وە هـەوەسی بـە سـەریا زاڵ بـوو، خۆشەویستی جووڵاو دەعبای هەڵبڕی هەتا بەیانی. بـەیانی پادشا کـەنیزەکـەی ویست دەستی نەکەوت، بۆیان گێڕایەوە کەچی ڕوویـداوە، قـینی هـەڵسـا، فـەرمانی دا ڕەشـەو کەنیزەك پێکەوە ببەستن‌و لە سەربانی کۆشکەوە فڕیان دەنە ناو خـەندەقەوە. یـەکـێ لە وەزیرانی چاك ڕەوشت سەری تکاکاری نایە سەر زەمین‌و وتی: ڕەشی بێچارە تاوانێکی نییە. کۆیلەکانی‌تر بە لاواندنی خاوەنیانەوە ڕاهاتوون. وتی: ئەگەر لە ڕیکەوتنیا شەوێکی دوابخستایە چی ئەبوو کە من زیاتر لە نرخی ئەو کەنیزەکەم پێ ئـەبەخشی. وتـی: ئـەی گەورە ئەوی فەرمووت دیارە ئەی نەت بیستووە کە حەکیمان لەم مەبەستەدا فەرموویانە:

تینوێکی سووتاو بۆ ئاوی حەیات    مـەزانـە تـرسی فـیلی دەمـان بـێ
خانووێکی چۆڵ خوانێکی تـیابێ    خوا نەناس باکی لە ڕەمـەزان بـێ

پادشا ئەم وتە وردەی لا پەسەند هات، وتی: ئێستە وا ڕەشـەم بە تـۆ بـەخشی، ئـەی کەنیزەکە کە چی لێ بکەم؟ وتی: کەنیزەکە کەیش بە ڕەشەکە ببخشە چونکە نیوە خۆری سەگ هەر شایانی سەگە.

لات پەسەند نەبێ بۆ دۆستی هەرگیز    کەسێ ڕووی کردە شوێنی نـاپەسەن
تـــــینوێیك ئـــاوی زولاڵی نـــاوێ    کـــە پـاشماوە بـێ لە دەمـی بـۆگـەن

## چیرۆك (٤١)

لە لە ئەسکەندەری ڕۆمی‌یان پرسی: وڵاتی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتت بەچی گرت، خـۆ پـادشایانی پـێشـین گـەنج‌و تـەمەن‌و مـوڵك‌و سـوپایان لەمـە زۆرتـر هـەبوو کـەچی ئـاوا وڵاتگیری بۆیان سەری نەگرت. وتی: بە یاریدەی خوای بـە دەسـەڵات‌و گـەورە هـەر وڵاتێکم گرت گەلم تیا نەڕەنجاندو شێوەو چاکـەی پـێشـینانم بـەتاڵ نـەکـردەوەو نـاوی پادشایانم نەبرد مەگەر بە چاکی.

شخصی نه چنان کریه منظر | کز زشتیِ او خبر توان داد
وانگه بغلی، نَعُوذُ بِاللّٰه | مُردار به آفتابِ مرداد

آورده‌اند که سیاه را در آن مدّت نفْس طالب بود و شهوتْ غالب. مِهرش بجنبید و مُهرش برداشت. بامدادان که مَلِک کنیزک را جُست و نیافت حکایت بگفتند. خشم گرفت و فرمود تا سیاه را باکنیزک دست و پای استوار ببندند و از بامِ جوسق به قعرِ خندق اندازند. یکی از وزرای نیک محضر روی شفاعت بر زمین نهاد و گفت: سیاهِ بیچاره را در این خطایی نیست بلکه سایرِ بندگان و خدمتگاران به بخشش و اِنعامِ خداوندی مُتَعَوِّدند. گفت: اگر در مفاوضتِ او شبی تأخیر رفتی چه شدی که من او را به قیمتِ کنیزک بیش نوازش کردمی. گفت: ای پادشاه نشنیده‌ای که گفته‌اند:

تشنه‌ی سوخته در چشمه‌ی روشن چو رسید
تو مپندار که از پیلِ دمان اندیشد
ملحدِ گرسنه در خانه‌ی خالی بر خوان
عقل باور نکند کز رمضان اندیشد

مَلِک را این لطیفه پسند آمد و گفت: سیاه را به تو بخشیدم کنیزک را چه کنم؟ گفت: کنیزکْ سیاه را بخش که نیم خورده‌ی او، هم او را شاید.

دستِ سلطان دگر کجا بیند | چون به سرگین در اوفتاد ترنج
تشنه را دل نخواهد آبِ زلال | کوزه بگذشت بر دهانِ شُکُنج

## حکایت [۴۱]

اسکندرِ رومی را پرسیدند که دیارِ مشرق و مغرب به چه گرفتی که ملوکِ پیشین را خزاین و عمر و لشکر بیش از این بود و چنین فتحی میّسر نشد؟ گفت: به عَونِ خدای، عزَّوجلَّ، هر مملکت راکه بگرفتم رعیّتش نیازردم و نامِ پادشاهان جز به نیکی نبُردم.

عــاقڵ بـە گـەورە کـەسێ دانـانێ		ناوی گـەورەکـان نـاشیرین بـێنـێ

❋ ❋ ❋

ئـــەم شـــتانە گشــتی هــیچو ڕۆیــیوە		بەختو تەختو ئەمرو نەهیو گـیرو دار
نــاوی چــاکــان تــۆ مــەفەوتێنــە هـەتا		نــاوی چــاکــی تـۆیش بـمێنـی پایەدار
نـــاوی چــاکــی لێ بــمێنــێ ئــادەمی		چاکە، نەك دوای خۆی سزایی ڕۆزگار[1]

---

(١) لە هەندێ نووسخەدا ئەم شیعرە هەیە:
وتەی سەعدی بەجێبێنی ڕەوایە		کە کارسازی وڵاتەو بیرو ڕایە،ـو.

بەندی دووەم:

# ڕەوشتی دەروێشان

## چیرۆك (١)

یەکێ لە گەورەکان بە خواپەرستێکی وت: چی لە فلان خواپەرست ئەڵێیت کە کەسانی‌تر دەربارەی بە تانووت ئەدوێن. وتی: لە دیمەنی دەرەوەیدا خراپی نابینم‌و دەروونیشی پەنهان ئەبینم، [و نهێنی نازانم]

لەبەر هەرکەس کراسی عابیدیت دی

بە عابید سەیری کەو مەردی بەکردار

ئەگەر دیوی دەروونی پێ نەزانی

بە دیوی ناوی کەی بووی موحتەسیب کار[١]

## چیرۆك (٢)

دەروێشێکم دی سەری لە ئاستانەی کەعبە هەڵ ئەسوو، ئەی ناڵاندو ئەیوت: ئەی لێ‌خۆش بوو بەڕەحم تۆ ئەزانی لە ستەمکارو نەزان چی‌ئەوەشێتەوە.

عوزری ستیم هێناوەتە خزمەت نەك بە تاعەت کە خۆم بکەم ئیزهار

لە گوناه عاسیان ئەکەن تۆبە عاریفان بۆ عیبادەت ئیستیغفار

---

(١) موحتەسیب: زەمانی زوو، چاودێری خراپانیان کردووە،ـو.

باب دوم:

# در اخلاق درویشان

## حکایت [۱]

یکی از بزرگان پارسایی را گفت: چه گویی در حقِ فلان عابد که دیگران در حقِ او به طعنه سخن‌ها گفته‌اند؟ گفت: بر ظاهرش عیب نمی‌بینم و در باطنش غیب نمی‌دانم.

هـرکه را جـامه پـارسا بـینی　　　پـارسا دان و نـیک‌مرد انگـار
ور ندانی کـه در نـهادش چـیست　　　محتسب را درونِ خانه چـه کـار؟

## حکایت [۲]

درویشی را دیدم سر بر آستانِ کعبه نهاده همی نالید که: یا غفور، یا رحیم! تو دانی که از ظَلومِ جَهول چه آید.

عذرِ تـقصیرِ خـدمت آوردم　　　که ندارم به طاعت استظهار
عاصیان از گناه تـوبه کـنند　　　عارفان از عـبادت استـغفار

خواپەرستان پاداشی خواپەرستی‌یان ئەوێت‌و بازرگانان قیمەتی کووتاڵ. منی کۆیلە هیوام هێناوە نە خواپەرستیم هێناوەتە دەرگات وە بە گەدایی هاتووم‌و بۆ تیجارەت نە هاتووم. (اِصْنَعْ بِی ما أَنْتَ اَهْلُهُ وَ لا تَفْعَلْ بِنا ما نَحنُ بِأَهْلِهِ). (ئەوەمان لەگەڵ بکە کە تۆ پێی شایانی، ئەوەمان لێ مەکە کە ئێمە پێی شایانین).

ئەمکوژی وە یا سووچم ئەبەخشی — ڕووم لە قاپییەو ئەم ئاستانە
کۆیلە هیچ‌کاتێ نەی بووە فەرمان — مـن هەرووەهامە چۆنت فەرمانە

* * *

لە قاپیی کەعبە هەژارێکم دی — ئەگریاو ئەیوت بە خۆشی‌و بە غەم
ناڵێم تاعەتم لێ قەبووڵ فەرموو — لەسەرگوناهم ڕاکێشە قەڵەم

## چیرۆك (٣)

عبدالقادری گەیلانی‌یان دی ،ڕەحمەتی خوای لێ‌بێ، لە حەوشی بەیت ڕووی لەسەر وردە بەردەکان دائەناو ئەیوت: ئەی خوایە بم‌بەخشە، وە ئەگەر شایانی سزام لە قیامەت بە کوێری هەڵم سێنە تا لە ڕووی چاکانا شەرمەزار نەبم.

ڕوو لەسەرخاکی بێ‌نەوایی ئەڵێم — هەر بەیانێ کە سروە بایەك دێ
ئەی لە یادم کە دەرنەچوویت هەرگیز — هیچت لەم کۆیلەیە بە یادا دێ

## چیرۆك (٤)

دزێ هاتە ماڵی خواپەرستێ، زۆر گەڕا هیچی چنگ نەکەوت. دڵ تەنگ بوو، خواپەرست لە خەو بێدار بوو، گلیمێك کە لە سەری نووستبوو لەسەرڕێی دزدا دانا، هەتا بێ‌بەش نەبێ.

بیستم مەردانی ڕێگای خودایی — دوژمنانیشیان کە ناکەن دڵ‌تەنگ
کەی ئەم پایەیە بۆ تۆ سەر ئەگرێ — لەگەڵ دۆستانیش کە تۆ هەتە جەنگ

خۆشەویستانی دڵ‌ڕووناکان وە نەبێ لە پاشملە کەم‌و کووڕیت بڵێن‌و لە ڕوو بۆت بمرن.

هەرکەسێ هێنای بۆت عەیبی کەسان — بێ‌گومان عەیبت ئەباتە لای ئەوان

عابدان جزای طاعت خواهند و بازرگانان بهای بضاعت. منِ بنده امید آورده‌ام نه طاعت، به دریوزه آمده‌ام نه به تجارت. **إِصْنَعْ بی ما أَنْتَ أَهْلُهُ.**

**گر کُشی ور جُرم بخشی روی و سر بر آستانم**
**بنده را فرمان نباشد، هرچه فرمایی بر آنم**

***

**بر در کعبه سایلی دیدم — که همی گفت و می‌گرستی خوش**
**می‌نگویم که طاعتم بپذیر — قلمِ عفو بر گناهم کش**

## حکایت [۳]

عبدالقادرِ گیلانی را، رَحْمَةُ اللهِ عَلَیه، در حرمِ کعبه دیدند روی بر حَصْبا نهاده همی گفت: ای خداوند ببخشای! و گر هرآینه مستوجبِ عقوبتم در قیامتم نابینا برانگیز تا در رویِ نیکان شرمسار نشوم.

**روی بر خاکِ عجز، می‌گویم — هر سحرگه که باد می‌آید:**
**ای که هرگز فرامُشت نکنم — هیچت از بنده یاد می‌آید؟**

## حکایت [۴]

دزدی به خانه‌ی پارسایی درآمد. چندان که جُست چیزی نیافت. دلتنگ شد. پارسا را خبر شد. گلیمی که در آن خفته بود برداشت و در راهِ دزد انداخت تا محروم نشود.

**شنیدم که مردانِ راهِ خدای — دلِ دشمنان را نکردند تنگ**
**تو را کی میسّر شود این مَقام — که با دوستانت خلاف است و جنگ؟**

مودّتِ اهلِ صفا، چه در روی و چه در قفا؛ نه چنان که از پَسَت عیب گیرند و پیشت بیش میرند.

**در برابر، چو گوسفندِ سلیم — در قفا، هم‌چو گرگِ مردم‌خوار**

پاشملە چەشنی گورگی پیاو هەڵدڕ　　ڕوو بە ڕوو وەك مەڕێكی بەستەزمان

## چیرۆك (٥)

چەند كەسێ لە وانەی گەردشیان ئەكرد كۆبوونەوە بۆ گەڕانو سیاحەتو هاوبەشی ڕەنجو ڕاحەت. ویستم هاوڕێی‌یان بكەم، ڕێك نەكەوتن لەگەڵما وتم: ئەمە لە ڕەوشتی گەورەكانا تازە پەیدا بووە كە ڕوو لە هاوڕێی دەروێشان وەرگێڕنو سوودی لێ دریغ بكەن. من لە خۆما ئەوەندە هێزو سووك بەدەنی ئەبینم كە لە خزمەت مەردانا یارێكی گورجو گۆڵ بم، نە وەك بار بەسەر دڵیانەوە.

اِنْ لَمْ اَكُنْ راكِبَ الْمَواشِی　　اَسْعَیٰ لَكُمْ حامِلَ الْغَواشِی

(ئەگەر سواری وڵاغ نەبم سەر زینیان بۆ هەڵئەگرم).

یەكێ لەناویانا وتی: لەو وتەیە كە بیستت دڵتەنگ مەبە، لەم ڕۆژانەدا دزێ لە شێوەی دەروێشان هاتبوو، وە خۆی خستە هەوای هاوڕێیەتی ئێمە.

كەسێ چوزانێ كێی تیایە كراس　　نووسەر ئەزانێ لە نامەدا باس

لەبەر ئەوە دەروێشان سەلامەتی حاڵیان هەیە، گومانی خراپیان پێ‌نەبردو بە هاوڕێیی وەریان گرت.

نیشانەی عارفانە خەرقە پۆشی　　بەسەر ڕوویان لە خەڵكەو دڵ پەرۆشی
بپۆشە چیت ئەوێو كۆشش كە بۆ كار　　لەسەر تاجو لە شان ئاڵایی زەڕكار
فڕێدانی هەوایەو واز لە دنیا　　پەرستش نەك كراسی كۆن لە بەریا
زاهیدی نییە پۆشینی پەلاس　　زاهیدی پاكییەو ئاوریشم كراس[1]

ڕۆژێ هەتا شەو ڕۆیشتبووین، لە كاتی شەوا لە سایەی دیوارێ نووستبووین. دزی بێ هیممەت مەسینەی هاوڕێی برد گویا بۆ ئاودەست ئەچێ، بە تاڵانەوە ڕۆیشت.

سەیرە خواپەرست خەرقەی كردەبەر　　كراسی كەعبەی كردە جلی كەر[2]

---

(١) لە هەندی نووسخەدا ئەم شیعرەش هەیە:
زڕێی ئاوریشم با بپۆشی مەرد　　نیرەمووك ناشێ بۆی چەكی نەبەرد،.و.
(٢) بە زاهیر سپی وینەی چۆری شیر　　لە دەروونتۆ پیس وەكوو گورگی پیر،.«ك».

هرکه عیبِ دگران پیشِ تو آورد و شمرد
بی‌گمان عیبِ تو پیشِ دگران خواهد بُرد

## حکایت [۵]

تنی چند از روندگانْ متّفقِ سیاحت بودند و شریکِ رنج و راحت. خواستم تا مرافقت کنم موافقت نکردند. گفتم: از کرم و اخلاقِ بزرگان بدیع است روی از مصاحبتِ مسکینان تافتن و فایده دریغ داشتن که من در نفسِ خود این قدر سرعت و قوّت می‌شناسم که در خدمتِ درویشان یارِ شاطر باشم نه بارِ خاطر.

إنْ لَمْ أَكُنْ رَاكِبَ اَلْـمَواشِـي　　　أَسْعىٰ لَكُمْ حامِلَ اَلْـغَواشِـي

یکی ازان میان گفت: از این سخن که شنیدی دل تنگ مدار که در این روزها دزدی به صورتِ صالحی برآمد و خود را در سِلکِ صحبتِ ما مُنْتَظَم کرد.

چه دانند مردم که در جامه کیست　　　نویسنده داند که در نامه چیست

و ازان جا که سلامتِ حالِ درویشان است گمانِ فضولش نبردند و به یاری قبولش کردند.

ظاهرِ حالِ عارفان دلق است　　　این قَدَر بس، چو روی در خلق است
در عمل کوش و هرچه خواهی پوش　　　تاج بر سر نه و عَلَم بر دوش
ترکِ دنیا و شهوت است و هوس　　　پارسایی، نه ترکِ جامه و بس
در قزاگند مرد باید بود　　　بر مخنّث سلاحِ جنگ چه سود؟

روزی تا به شب رفته بودیم و شبانگه به پای حصاری خفته که دزدِ بی‌توفیق ابریقِ رفیق برداشت که به طهارت می‌روم و خود به غارت می‌رفت.

پارسا بین که خرقه در بر کرد　　　جامه‌ی کعبه را جُلِ خر کرد

ئەوەندەی لە چاو دەروێشان ون بوو چووە بورجێ خورجێکی دزی. کە ڕۆژ رووناك بووەوە ئەو تاریك دڵە ئەندازەیەك ڕێگە ڕۆیی بوو. هاوڕێیانی بێ گوناه نووستبوون بەیان هەموانیان هێنایە قەڵاوەو خستنیانە زیندانەوە. لەو ڕۆژەوە وازم لە هاوڕێیی هێناو ڕێگەی تەنیاییم گرتە بەرکە (السَّلامَةُ فِي الْوَحْدَةِ وَ الآفَةُ بَيْنَ الإِثْنَيْنِ) سەلامەتی لە (تەنیاییدایەو بەڵا لە نێوان دوانا).

لە هـۆزێ یـەکێ کـردی نـەفامی بە گەورەو بچووك نامێنی حورمەت

نـــابینی گـــایەك كـــەوتە لە وەڕگـا تـێوە ئـەئاڵێ گـای دێ جـەمعیەت

وتم: شانازیو سوپاس بۆ خوا کە لە فەزڵو پیرۆزیی دەروێشان بێبەش نەبووم، ئەگەرچی بە لەش لە هاوڕێیان تەنیا کەوتم، بەڵام بەم چیرۆکە کەڵك وەرگر بووم بۆ ئەوانەی وێنەی منن لە هەموو تەمەنا بەکاردێت.

ئەگەر درشتێ بوو لە ئەنجومەن ئـەڕەنجێ دڵی گـەلێ هـۆشـمەن

ئەگەر حەوزێکت پڕ کرد لە گوڵاو سەگێ تێی کەوێ پێ ئەبێ گـڵاو

## چیرۆك (٦)

زاهیدێ میوانی پادشایەك بوو، کە دانیشتە سەر خواردن کەمتری لە پێوستی خوارد، وە کە هەڵسان بۆ نوێژ زۆرتری لە پیشەی جارانی نوێژ کرد هەتا زۆر گومانی چاکی پێبەرن.

عەرەب ئەترسم نەگەییە کەعبە ڕێیەك پیا ئەڕۆی بۆ تورکستانە

کاتێ هاتەوە قۆناغی خۆی بانگی کرد خوانی بۆ بێنن هەتا شتێك بخوا، کوڕێکی تێگەیشتووی بوو وتی: ئەی بابە لە ئەنجومەنی پادشا نانت نەخوارد؟ وتی: لەبەرچاوی ئەوان هیچیوام نەخوارد کە بەکار بێت. وتی: سا نوێژەکەشت بگێڕەوە، نوێژێکی وات نەکردووە بەکاربێت.

ئەی هونەر دانەر لەسەر بەری دەست لە بـــن بـــاخەڵا عـــەیبت داپـۆشـی

چۆن بە پارەی قەڵب ئەتوانی سەرکەش چشـــتێ بکـــڕی وە یـا بـفرۆشـی[1]

(١) لە هەندێ نووسخەدا ئەم دوو شیعرەش نووسراون:

چندان که از نظرِ درویشان غایب شد به بُرجی بر رفت و دُرجی بدزدید. تا روز روشن شد آن تاریک مبلغی راه رفته بود و رفیقانِ بی‌گناه خفته. بامدادان همه را به قلعه درآوردند و بزدند و به زندان کردند. ازان تاریخ ترکِ صحبت گفتیم و طریقِ عزلت گرفتیم که: اَلسَّلامَةُ فِی اَلْوَحْدَةِ.

چو از قومی یکی بی‌دانشی کرد — نه کِهْ را منزلت مانَد، نه مِهْ را
ندیدستی که گاوی در علف‌خوار — بیالاید همه گاوانِ دِه را

گفتم: سپاس و منّت خدای را که از برکتِ درویشان محروم نماندم. اگرچه به صورت از صحبت وحید افتادم بدین عبرت مستفید گشتم و مرا همه عمر این نصیحت به‌کار آید.

به یک ناتراشیده در مجلسی — برنجد دلِ هوشمندان بسی
اگر برکه‌ای پر کُنی از گُلاب — سگی در وی افتد، شود منجلاب

## حکایت [۶]

زاهدی مهمانِ پادشاهی بود. چون به طعام بنشستند کمتر ازان خورد که ارادتِ او بود و چون به نماز برخواستند بیش ازان کرد که عادتِ او بود تا ظنِّ صلاح در حقِّ او زیادت کنند.

ترسم نرسی به کعبه، ای اعرابی — کاین ره که تو می‌روی به ترکستان است

چون به مَقامِ خویش بازآمد سفره خواست تا تناولی کند. پسری داشت صاحب فِراست. گفت: ای پدر، باری به دعوتِ سلطان طعام نخوردی؟ گفت: در نظرِ ایشان چیزی نخوردم که به‌کار آید. گفت: نماز را هم قضا کن که چیزی نکردی که به‌کار آید.

ای هنرها نهاده بر کفِ دست — عیب‌ها برگرفته زیرِ بغل
تا چه خواهی خریدن، ای مغرور، — روزِ درماندگی به سیمِ دغل؟

## چیرۆك (٧)

لەبیرمە کە لە منالّی‌یا خواپەرست بووم، شەو نەئەنووستم‌و شەیدای زوهدو پارێز بووم، هەتا شەوێك لە خزمەتی باوکما، ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ، دانیشتبووم‌و هەموو شەو چاوم نەنابووە سەر یەك، قورئانی خۆشەویستم لە باوەشا [بوو] کۆمەڵی دەورو پشتمان نووستبوون. بە باوکم وت: لەم کۆمەڵە یەکیّ سەری هەڵنەبڕی دوو ڕکات نوێژ بکات، وەها نووستوون ئەڵێی مردوون. وتی: ئەی گیانی باوك ئەگەر تۆیش بنووستیتایە چاکتر بوو لەوەی بکەویتە سەرو پێستی خەڵك.

گەزافی، خۆی نەبیّ نابینیّ هیچ کەس     کە پەردەی خود پەسەندیی وا لەبەر دەس
ئەگەر چاوی خوابینی بدەن پێت     لە خۆت بیّ کارەتر نابینی هیچ‌کەس

## چیرۆك (٨)

یەکیّ لە گەورەکان لە ئەنجومەنێکا بە شانو باڵیا ئەهاتن، وە لە شێوە جوانەکانی زیاتریان بەیان ئەکرد. سەری بڵند کردو وتی: من ئەوەم کە خۆم ئەزانم.

كَفَيْتَ اَذىً يامَنْ تَعُدُّ مَحاسِني     عَلانِيَتِي هٰذا وَلَمْ تَدْرِ باطِني[1]

(ڕەنج کێشانت بەسە ئەی کەسیّ ژمارەی جوانییەکانم ئەکەیت، ئەوە دیوی دەرەوەمەو لە دیوی ناوەم نازانی).

شێوەم لە چاوی خەڵکی بەڵیّ جوانە دیمەنی
سەرشۆڕی پیسی ناوەوە شەرمەندەم‌و حەزین
تاوس بە نەخش‌و ڕەنگی بە جوانی ئەزانیّ خەڵك
خۆیشی چ شەرمەزارە لە دوو قاچی ناشیرین

---

کلیلی قاپیی دۆزەخ ئەبیّ نوێژ     لە بەر چاوی خەڵك تەواو بیّ‌و درێژ
ڕووی پەرستنت گەر لە خودایە     گەر پشتت کەویّ جوبریل ڕەوایە.-«و».

(١) ئەو شیعرە زۆر بەو شوێنە ئەخوات:
با بە قول کردن هەر کاری زووە     قەساوی پێس‌کەن دەمی پڕ فووە
هەرکەس بەو فووە هەڵبماسێنیّ     بە چەشنی حەیوان پێسی دەر ئێنیّ.-«ك».

## حکایت [۷]

یاد دارم که در ایّامِ طفلی متعبّد بودمی و شب‌خیز و مولعِ زهد و پرهیز. شبی در خدمتِ پدر، عَلَیْهِ آلرَّحْمة، نشسته بودم و همه شب دیده بر هم نبسته و مُصْحَفِ عزیز در کنار گرفته و طایفه‌ای گردِ ما خفته. پدر را گفتم: یکی از اینان سر برنمی‌دارد که دوگانه‌ای بگزارد. چنان خوابِ غفلت بُرده‌اند که گویی نخفته‌اند که مرده‌اند. گفت: جانِ پدر تو نیز اگر بخفتی بِهْ که در پوستینِ مردم افتی.

نبیند مدّعی جز خویشتن را — که دارد پرده‌ی پندار در پیش
گرت چشمِ خدابینی ببخشند — نبینی هیچ‌کس، عاجزتر از خویش

## حکایت [۸]

بزرگی را در محفلی همی ستودند و در اوصافِ جمیلش مبالغه می‌نمودند. سر از جیبِ تفکّر برآورد و گفت: من آنم که من دانم.

کُفَیْتَ أَذیً یا مَنْ یَعُدُّ مَحاسِنی — عَلانِیَتی هٰذا وَ لَمْ تَدْرِ ما بَطَنْ

***

شخصم به چشمِ عالمیان خوب منظرست
وَز خُبثِ باطنم سرِ خجلت فتاده پیش
طاووس را به نقش و نگاری که هست خلق
تحسین کنند و او خجل از پای زشتِ خویش

## چیرۆك (٩)

یەکێ لە پیاو چاکانی لوبنان کە پایەی بەرزی لەناو خەڵکا ناوی هەبوو، وە بە کەرامەت ناوی دەر کردبوو هاتە مزگەوتی شام لە گوێ ئاودەسخانە دەسی بە ئاو گەیاند کەوتە حەوزەکەوە بە ڕەنجێکی زۆر هەتا ڕزگاریان کرد. کاتێ لە نوێژ بوونەوە یەکێ لە یارانی پێی وت: گرێیەك لە دڵمایە. وتی: چییە؟ وتی: دێتە یادم کە شێخ بە سەر دەلیای ڕۆژئاوادا ڕۆیشت پێی تەڕ نەبوو ئیمڕۆ چ حاڵێ بوو کە لە باڵا پیاوێ ئاوا بە فەوتان هیچی وای نەمابوو؟ شێخ سەری بردە باخەڵی بیر کردنەوە، دوای تێوڕد بوونەوەیەکی زۆر سەری هێنایە دەرێو فەرمووی نەت بیستووە کە گەورەی عالەم، سەلاتو سەلامی خوای لێ‌بی، فەرمووی «لِي مَعَ اللّٰهِ وَقْتٌ لايَسَعُني فيهِ مَلَكٌ مُقَرَّبٌ وَ لا نَبِيٌّ مُرْسلٌ» (یانی هەیە بۆ من لەگەڵ خوادا کاتێ وەها کە لەگەڵما نە فریشتەی نزیكو نە پێغەمبەرە ڕەسولەکان تیا دەرنابەن). نەی فەرموو هەمیشە، کاتی وای هەبوو جوبرەئیلو میکائیل نەیان ئەتوانی لەگەڵی ڕابوێرن، وە کاتی وای هەبوو لەگەڵ حەپسەو زەینەبەدا ڕای ئەبوارد «مُشاهَدَةُ الْاَبْرارِ بَينَ التَّجَلّي وَ الْاِستِتارِ» (یانی: دیدەنی چاکان بۆ خوا وا لە نێوانی دەرکەوتنو نیهانی‌یا). خۆی ئەنوێنێو خۆی ون ئەکات.

گەه ئەکەی پارێزو، گەه ئەنوێنی تۆ دیداری خۆت

ئاگری ئێمە ئەکەی تیژ هەروەکو بازاری خۆت

اُشاهِدُ مَنْ اَهْوىٰ بِغَيرِ وَسيلَةٍ

فَيَلْحِقُني شَأْنٌ اَضَلُّ طَريقاً

يُهَيِّجُ ناراً ثُمَّ يُطْفِئُ بِرَشَّةٍ

لِذاكَ تَرانِي مُحْرِقاً وَ غَريقاً[1]

بێ پێچو پەنا یارم ئەبینم

جارجاریش چاوم ڕێگە نابینێ

---

(١) ئەم دوو دێڕەی سەعدی بە عەرەبی وتویە، لە دەسنووسەکەدا وەك خۆی بوو، هەوڵمدا بەم جۆرە بیانکەم بە کوردی. «ع.م».

## حکایت [۹]

یکی از صُلَحای لبنان که مقاماتِ او در دیارِ عرب مذکور بود و کرامات مشهور، به جامعِ دمشق در آمد و در کنارِ برکه‌ی کَلاّسه طهارت می‌ساخت. پایش بلغزید و به حوض درافتاد و به مشقّتِ بسیار ازان جا رهایی یافت. چون از نماز بپرداخت یکی از یاران گفت: مرا مشکلی هست. گفت: آن چیست؟ گفت: یاد دارم که شیخ بر روی دریای مغرب برفت و قدمش‌تر نشد. امروز چه حالت بود که در این یک قامت آب از هلاک چیزی نمانده بود؟ زمانی تفکّر کرد و گفت: نشنیدی که سیّد المُرسَلین، عَلَیه‌السَّلام، فرمود که: «**لِی مَعَ اللّٰهِ وَقْتٌ لا یَسَعُنی فیهِ مَلَکٌ مُقَرَّبٌ وَ لا نَبیٌّ مُرسَلٌ**» و نگفت: **عَلَی ٱلدَّوام**. وقتی چنین که فرمود به جبرئیل و میکائیل نپرداختی و دیگر وقت با حَفْصه و زینب درساختی. **مُشاهَدَةُ ٱلْأَبْرارِ بَیْنَ ٱلتَّجَلّی وَ ٱلْإِسْتِتارِ**. می‌نمایند و می‌رُبایند.

دیدار می‌نمایی و پرهیز می‌کنی　　بازارِ خویش و آتشِ ما تیز می‌کنی

***

أُشاهِدُ مَنْ أَهْویٰ بِغَیْرِ وَسیلَةٍ　　فَیَلْحَقُنی شَأْنٌ أَضَلُّ طَریقاً

یُؤَجِّجُ ناراً ثُمَّ یُطْفی بِرَشَّةٍ　　لِذاكَ تَرانی مُحْرَقاً وَ غَریقاً

***

یکی پرسید ازان گم کرده فرزند　　که ای روشن گهر پیرِ خردمند

ز مصرش بوی پیراهن شنیدی　　چرا در چاهِ کنعانش ندیدی؟

بگفت: احوالِ ما برقِ جهان است　　دمی پیدا و دیگر دم نهان است

تـــاوێك دێ کـــڵپـەی ئـاگـر خـۆش ئـەکـا

تــــاوێك بــە خـــورژم ئـــاو ئـــەڕژێنـــێ

نـــــابینێ کــــــەوا ئـــەم ئـــاگـــرو ئـــاوە

گـــا ئـــەمخنکێنـــێ گـــا ئـــەمسووتێنـــێ

## چیرۆکی هۆنراوە

یەکێ پرسی لە کوڕ ون کردووی پیر / کە ئەی ڕووناك سروشتی گەورەیی ژیر

لە میسرا چۆن بوو بۆنت کرد کراسی / کەچی لەو چاڵی کەنعانەت نەناسی

وتی: حاڵەت وەکوو بەرقی جیهانە / گەهێ پەیدایە گاهێ تر نیهانە

بەرزتر تارمە گەهە لێی ئەنیشم / کە نابینم گەهێ پشت قاچی خۆیشم

ئەبوو، دەرویش لەسەرحاڵی بمایە / لە دوو عالەم دەسی خۆی بەر بدایە

## چیرۆك (١٠)

لە مزگەوتی بەعلەبەك کاتێ وتارێکم ئەوت لە ڕێگای ئامۆژگاریو وەعزەوە لەگەڵ کۆمەڵێ دڵکوژراوی دڵمردوو، لە عالەمی شێوە ڕێ بە مەعنا نەبردوو. دیتم کە نەفەسم ناگەڕێتەوەو ئاگرم لە داری تەڕیان کاریگەر نابێ. پەروەردە کردنی ئێستراناو ئاوێنە ڕاگرتنم لە گەڕەکی کوێران لا دریغ بوو. بەڵام دەرگای مەعنا کرابووەو هەودای وتار درێژ بووبوو، وە لە مەعنای ئەم ئایەتە ﴿وَ نَحْنُ أَقْرَبُ اِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾. وتەم گەیاندبوە شوێنێك کە ئەموت:

دولبەر نزیكتر لە خۆم بە خۆمە / سەیر ئەوەیە کەمن لەو دوورم

چیبکەم لەگەڵ کێ ئەتوانم بڵێم / یارم لە باوەش، من لێی مەهجوورم

من بە شەرابی ئەم وتارە مەستو زیادە پیاڵەم وا لە دەست، ڕێبوارێك بە تەنیشت ئەنجومەنەکەدا تێپەڕی، دەور پاشان لەو کاری کرد، زریکەیەکی وەهای کرد کە ئەوانی تریش ڕێکی ئەو کەوتنە خرۆشو خاوەندانی ئەنجومەن هاتنە جۆش. وتم: (سبحان الله) دوورانی ئاگادار لە حوزوورو نزیکانی نابینا دوور.

گـــهی بـــر طـارَمِ اعـلیٰ نشـینم | گهی در پـیشِ پـای خـود نـبینم
اگـــر درویش در حـالی بـماندی | سـرِ دست از دو عالم برفشـاندی

## حکایت [۱۰]

در جامعِ بَعْلَبَک وقتی کلمه‌ای چند به طریقِ وعظ می‌گفتم با قومی افسرده‌ی دل‌مُرده و راه از صورت به معنی نبُرده. دیدم که نَفَسم در نمی‌گیرد و آتشم در هیزمِ تر اثر نمی‌کند. دریغ آمدم تربیتِ ستوران و آینه‌داری در محلّتِ کوران، ولیکن درِ معنی باز بود و سلسله‌ی سخن دراز، در معنی این آیت: وَ نَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ. سخن به جایی رسانیده بودم که می‌گفتم:

دوست نزدیک‌تر از مـن بـه مـن است | ویــنْت مشکـل کـه مـن از وی دورم!
چـه کـنم؟ بـا کـه تـوان گـفت کـه او | در کــــنارِ مــن و مــن مــهجورم؟!

من از شرابِ این سخن سرمست و فضله‌ی قدح در دست که رونده‌ای در کنارِ مجلس گذر کرد و دورِ آخر در او اثر کرد. نعره‌ای چنان بزد که دیگران به موافقتِ او در خروش آمدند و خامانِ مجلس به جوش. گفتم: سُبْحانَ اللّٰه! دورانِ باخبر در حضور و نزدیکانِ بی‌بصر دور.

تا گوێ‌گر نەکا فامی گفتگۆ — هێز لە وتەبێژ داوا مەکە تۆ
مەیدانی پانی ئارەزوو دەرخە — پیاوی وتە بێژ تا بدا لە گۆ

## چیرۆك (١١)

شەوێك لە بیابانی مەككە لە بێ خەوی‌یا پێی ڕۆیشتنم نەمابوو، سەرم نایەوە. بە حوشترەوانم وت: دەست لە من هەڵگرە.

پێ‌پیادەی هەژار ئەبێ چەند بڕوا — حوشتر لە ڕۆیین کە نەما توانای
هەتاکوو قەڵەو لەشی ئەبێ لەڕ — لەڕ ئەبێ بمرێ لە سەختی‌و سزای

وتی: ئەی برادەر حەرەمی مەككە لە پێشەوەیەو جەردە لە دوواوە، ئەگەر ڕۆیشتی بردتەوەو، ئەگەر نووستی مردی. نەت بیستووە کە وتوویانە:

لە ڕێگەی بادیە خۆشە لە ژێر داری موغەیلان[١] خەو
بەڵام پێویستە وازبێنی لە گیانی خۆت، لە کۆچی شەو

## چیرۆك (١٢)

خواپەرستێکم دی لە گوێ دەلیا برینی پڵنگی پێوە بوو بە هیچ دەرمانێ چاك نەئەبووە کاتێکی زۆر پێوە دەردەدار بوو، هەمیشە سوپاسی خوای بەرزو بڵندی ئەکرد. لێیان پرسی: سوپاسی چی ئەکەیت؟ وتی: سوپاسی ئەوە بە دەردێ گرفتارم، نەك بە گوناهێ.

ئەگەر ئەو یارە ئازیزە بە زاری من بە کوشتن دا
نەڵێ تا لەو دمە بۆ گیانی سەیری وا هەیەتی غەم
ئەڵێم لەم کۆیلە بێ‌دەستە ئەبێ درکەوتبێ سووچێ
کە دڵ ئازووردەیە یارم هەمە هەر بۆ ئەوە ماتەم

بەڵێ پیاوانی خوا دەردیان لا، لە گوناه باشترە. نابینی کە یوسفی ڕاست لەو حاڵەدا چی وت: ﴿رَبِّ السِّجْنُ اَحَبُّ اِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي اِلَيْهِ﴾ (یانی پەروردگارا زیندانم لا باشترە لەوەی بانگم ئەکەن بۆی یانی لە زینا).

---

(١) موغەیلان، یا موغیلان: دارێکی دڕکاوییە کە دڕکەکانی کەچ‌و گەورەن بەرەکەی وەکوو باقلە لە ناو کالانایەو هەرکامی پەنج دانەی واتیا.

فهمِ سخن چون نکند مستمع    قوّتِ طبع از متکلّم مجوی
فُسْحَتِ میدانِ ارادت بیار    تا بزند مردِ سخنگوی گوی

## حکایت [۱۱]

شبی در بیابان مکّه از بی‌خوابی پای رفتنم نماند سر بنهادم و شتربان را گفتم: دست از من بدار.

پای مسکین پیاده چند رود؟    کز تحمّل ستوه شد بُختی
تا شود جسمِ فربهی لاغر    لاغری مرده باشد از سختی

گفت: ای برادر حرَم در پیش است و حرامی از پس. اگر رفتی بردی و اگر خُفتی مُردی.

خوش است زیرِ مغیلان به راهِ بادیه خُفت
شبِ رحیل ولی ترکِ جان بباید گفت

## حکایت [۱۲]

پارسایی را دیدم بر کنارِ دریا که زخمِ پلنگ داشت و به هیچ دارو بِهْ نمی‌شد. مدّت‌ها در آن رنجور بود و شکرِ خدای، عَزَّوَجَلّ، عَلَی الدّوام گفتی. پرسیدندش که شکرِ چه می‌گویی؟ گفت: شکرِ آن که به مصیبتی گرفتارم نه به معصیتی.

گر مرا زار به کُشتن دهد آن یارِ عزیز
تا نگویی که در آن دم غمِ جانم باشد
گویم: از بنده‌ی مسکین چه گنه صادر شد
که دل آزرده شد از من؟ غمِ آنم باشد

## چیرۆك (١٣)

دەروێشێك پێویستێكی ڕووی دا، گلێمێكی لە ماڵی هاوڕێیەكی دزی، حاكم فەرمووی تا دەستی ببڕن. خاوەن گلیم تكای بۆ كرد كە من ئازادم كردووە. وتی: بە تكای تۆ خۆ واز لە شەرعی خۆی ناهێنێ. وتی: ئەوەی تۆ وتت وایە، بەڵام هەركەسێ لە ماڵی وەقف دزی بكات دەس بڕینی ناوێ. بێنەوا ماڵی نییە، هەرچی هەیە هی دەروێشانە وە وەقفی كەم دەستانە. حاكم دەستی لێ هەڵگرت و تانووتی لێ دا كە جیهان لەسەر تۆ ئەوەندە تەنگ بوو هەتا دزی لە ماڵی هاوەڕێیەكی وەها بكەیت؟ وتی: ئەی گەورە نەت بیستووە كە وتوویانە: ماڵی دۆستان تاڵانكەو لە قاپیی دوژمنان مەدە.

كاتی داماوی لە سەختی، لەش بە داماوی مەدە

دوژمنان پێستیان گرۆو دۆستان لە بەریان فەروەیان

## چیرۆك (١٤)

یەكێ لە پادشایان بە خواپەرستێكی وت: هیچتان لە ئێمە بە یاد دێت؟ وتی: بەڵێ كاتێ كە خوامان لە بیر بچێت.

خول ئەخوا هەركەسی دەركرد لەبەر دەرگانەی خۆی خوا

كەسێ بانگی كاتە لای خۆی نایەڵی بۆ لایەتر بڕوا

نعم الأَمیرُ عَلی بابِ الفَقیرِ

بِئْسَ الْفَقِیرُ عَلی باب الأَمیرِ

چاكە میر لە قاپیی هەژار

خراپە هەژار لە قاپیی ئەمیر

## چیرۆك (١٥)

یەكێ لە پیاوچاكان پادشایەكی لە خەوا دی لە بەهەشتا وەستاوەو خواپەرستێ لە دۆزەخا. پرسی: هۆی بەرزی پایەی ئەوو هۆی فەوتانی ئەم چییە؟ پیاو بە پێچەوانەی ئەم حاڵە خەیاڵ ئەكات. دەنگێ هات كە ئەم پادشایە بە هەواخواهی دەروێشان وا لە بەهەشتاو ئەم خواپەرستە بە نزیك خستنەوە لە پادشایان وا لە دۆزەخا.

## حکایت [۱۳]

درویشی را ضرورتی پیش آمد. گلیمی از خانه‌ی یاری بدزدید. حاکم فرمود که دستش ببُرند. صاحبِ گلیم شفاعت کرد که من او را بِحِل کردم. گفتا: به شفاعتِ تو حدِّ شرع فرو نتوان گذاشت. گفت: آن چه فرمودی راست گفتی ولیکن هرکه از مالِ وقف چیزی بدزدد قطعش لازم نیاید وَٱلْفَقِيرُ لا يَمْلِكُ. هرچه درویشان راست وقفِ محتاجان است. حاکم دست از او بداشت، پس ملامت کردن گرفت که جهان بر تو تنگ آمده بود که دزدی نکردی الاّ از خانه‌ی چنین یاری!؟ گفت: ای خداوند، نشنیده‌ای که گفته‌اند: خانه‌ی دوستان بروب و درِ دشمنان مکوب.

**چون فرو مانی به سختی تن به عجز انـدر مـده**
**دشـمنان را پـوست بـرکن، دوسـتان را پـوستین**

## حکایت [۱۴]

یکی از پادشاهان پارسایی را دید، گفت: هیچت از ما یاد می‌آید؟ گفت: بلی، هر وقت که خدای را فراموش می‌کنم.

**هر سو دَوَد آن کش ز برِ خویش بـرانـد        وان را که بخوانـد بـه درِ کس نـدوانـد**

## حکایت [۱۵]

یکی از جمله‌ی صالحان به خواب دید پادشاهی را در بهشت و پارسایی در دوزخ. پرسید که موجبِ درجاتِ این چیست و سببِ دَرَکاتِ آن؟ که مردم به خلافِ این همی پنداشتند. ندا آمد که این پادشاه به ارادتِ درویشان در بهشت است و این پارسا به تقرّبِ پادشاهان در دوزخ.

خــەرقەوو تــەزبێحو بــەرگی پینەپیناوی بــە تــۆ

سوودێ نابەخشێ لە کرداری ڕیا بـە ئـاگـەدار

نیتە پێویستی کڵاوی تووکی حوشتر کەی لەسەر

شێوە دەروێش بەو بنێرە سەر کـڵاوی شـەهریار

## چیرۆك (١٦)

پیاوێکی سەروپێ ڕووت لەگەڵ کاروانی حیجاز لە کووفە هاتە دەرەوە بوو بە هاوڕێی ئێمە. تەماشام کرد پارەیەکی پێ نەبوو، خەرامان ئەڕۆیشت ئەیوت:

نە لە حوشترێ سوارم، نە حـوشتری بـە بـارم

نە خاوەنی ڕەعـیەت، نـە کـۆیـلەی شـەهریارم

نە غەمم نەبوونو بوونە، ئەوەندە لەم دەروونە

هــەناسەیێ ئــەدەم مـن وەهـا تـەمەن گـوزارم

حوشتر سوارێ پێیوت: ئەی دەروێش بۆ کوێ ئەچیت، لە سەختییائەمریت. نەی بیست، پێی نایە بیابانو ڕۆیشت. کاتێ گەیشتنە نەخلەی مەحموود دەوڵەمەندەکە ئاکامی گەیشتە سەر. دەروێش هـاتە ژوور سـەریو وتـی: ئـێمـە لە سـەختییا نـەمردین تـۆ لە پوختییا[1] مردی.

پیاوێ بۆ نەخۆش شـەو تـا ڕۆژ گـریا ڕۆژ بووەوە ئەو مرد نەخۆش ماو ژیا

* * *

زۆر ئـەسپی خـۆشڕەو لە ڕێ مـایەوە کـەری شــەل گـیانی گـەیاندە قـۆناغ

زۆرمـان لە لەشساغ لە خـاکا ون کـرد بـــریندار نـــەمرد مـــایەوە لەشســاغ

## چیرۆك (١٧)

پادشایەك خواپەرستێکی بانگ کرد، خواپەرست کەوتە خیاڵ کە دەرمـانێ بـخۆم تـا لاواز ببم باوەڕی دەربارەم زیاتر بێ. گێڕاویانەتەوە کە دەرمان کوشندە بوو خواردی مرد.

---

(١) پوختی: بوختی: جۆرێك حوشتری گەورەو بەهێزە.-ع.

دلقت به چه کار آید و تسبیح و مرقّع؟ خود را ز عمل‌های نکوهیده بری دار
حاجت به کلاهِ بَرَکی داشتنت نیست درویش صفت باش و کلاهِ تَتَری دار

## حکایت [۱۶]

پیاده‌ای سر و پا برهنه با کاروانِ حجاز از کوفه به در آمد و همراهِ ما شد. نظر کردم و معلومی نداشت. خرامان همی رفت و می‌گفت:

نه به اشتر بر سوارم، نه چو اشتر زیرِ بارم
نه خداوندِ رعیّت، نه غلامِ شهریارم
غمِ موجود و پریشانيِ معدوم ندارم
نفسی می‌زنم آسوده و عمری می‌گذارم

اشترسواری گفتش: ای درویش کجا می‌روی؟ برگرد که به سختی بمیری. نشنید و قدم در بیابان نهاد و برفت. چون به نخله‌ی محمود برسیدیم توانگر را اَجَل فرا رسید. درویش به بالینش فراز آمد و گفت: ما به سختی بنمردیم و تو بر بُختی بمردی.

شخصی همه شب بر سرِ بیمار گریست
چون روز آمد، بمرد و بیمار بزیست

***

ای بسا اسبِ تیزرو که بماند که خرِ لنگ جان به منزل بُرد
بس که در خاک تندرستان را دفن کردیم و زخم خورده نمرد

## حکایت [۱۷]

عابدی را پادشاهی طلب کرد. عابد اندیشید که دارویی بخورم تا ضعیف شوم، مگر اعتقادی که در حقِّ من دارد زیادت شود. آورده‌اند که داروی قاتل بخورد و بمرد.

ئەوەی لام وابوو مەغزە چەشنی پستە — وەکو پیاز یەك لەسەر یەك گشتی پێستە

* * *

کە ڕووی خۆی کردە خەڵکی خواپەرستێ
لە نـــــوێژا پشت لە قـــیبلە ڕا ئـــەوەستێ
کـۆیـلە گـەر بـانگ کـا خـوای خـۆی ئـانێ
ئـــەبێ خـــوا نـەبێ بـە کـەس نـەزانـێ[1]

## چیرۆك (١٨)

لە زەمینی یونانا لە کاروانێکیان دا، سامانێکی بێ پایانیان برد. بازرگانەکـان گـریانو زاری‌یان زۆر کرد. خواو پێغەمبەریان کرد بە تکاکار کەڵکی نەگرت.

کە پیرۆزی دی دزی تاریك گیان — چ باکی هەیە لە گریەی کـاروان؟
بکـــەی هـــاوارو بـپاڕێـتەوە — دز ئاڵـتوونی خـۆی نـاگـێڕێتـەوە

لوقمانی حەکیم لە کاروانەکەدا بوو، یەکێ پێی‌وت: با ئامۆژگـاری ئـەمانە بکـەیتو وەعزیان بدەیتێ، بەڵکە لە هەندێ لەم ماڵە دەست هەڵگرن. داخە ئـەم هـەموو سـامانە بفەوتێ. وتی داخ وتەی حیکمەتە لەگەڵ ئەمانەدا.

ئاسنێ لەگـەڵ مـۆرانـە خـواردی — زاخـاو دانـەوە لێی لانـابا ژەنگ
لەگەڵ دڵڕەشا وەعز بـێ‌سـوودە — مێخی ئاسنین داناچێ لە سـەنگ

(پارچە)

ڕۆژی سـەلامەت بگـەرە دامـاو — بـۆ بـەڵا دڵـان ئـەبێتـە سـپەر
داوای شـتی کـرد گـەدا بـیدەرێ — تـا لێت نـەسێنـن بـە زۆرو سـتەم

## چیرۆك (١٩)

مامۆستای گەورەم ئەبولفەرەجی جەوزی، ڕەحـمەتی خـوای لێ‌بـێ، ئـەوەندە پـێی ئەفەرموم واز لە گوێ‌گرتنو وتن بهێنم، وە فەرمانی دامێ بە تـەنیاییو گـۆشـەگـیری،

---

(١) هەر دڵبەر نەبێ کەس بە یار مـەکـە — هاوار لە ڕەقیب، لە نە یار مـەکـە،ـ«ك».

آن که چون پسته دیدمش همه مغز پوست بر پوست بود همچو پیاز
پارسایانِ روی در مخلوق پشت بر قبله می‌کنند نماز

***

چون بنده خدای خویش خواند باید که به‌جز خدا نداند

## حکایت [۱۸]

کاروانی در زمینِ یونان بزدند و نعمتِ بی‌قیاس ببردند. بازرگانان گریه و زاری کردند و خدای و پیغمبر شفیع آوردند سودی نداشت.

چو پیروز شد دزدِ تیره‌روان چه غم دارد از گریه‌ی کاروان؟

لقمانِ حکیم در آن میان بود. یکی از کاروانیان گفتش: کلمه‌ای چند از موعظه و حکمت با اینان بگوی مگر طرفی از مالِ ما دست بدارند که دریغ است چندین مال که ضایع شود. گفت: دریغ کلمه‌ی حکمت باشد با ایشان گفتن.

آهنی را که مورچانه بخورد نتوان بُرد از او به صیقل زنگ
با سیه‌دل چه سود گفتنِ وعظ؟ نرود میخِ آهنین در سنگ

همانا که جُرم از طرفِ ماست:

به روزگارِ سلامت شکستگان دریاب
که جبرِ خاطرِ مسکین بلا بگرداند
چو سایل از تو به زاری طلب کند چیزی
بده وگرنه ستمگر به زور بستاند

## حکایت [۱۹]

چندان که مرا شیخِ اَجَلّ ابوالفرج ابن‌جوزی، رحمة الله علیه، به ترکِ سماع فرمودی و به خلوت و عُزلت اشارت کردی عنفوانِ شبابم غالب آمدی و هویٰ و هوس طالب؛ ناچار

تەمەنی گەنجیم زاڵ بوو، وە هەواو هەوەسم ئەیویست، ناچار بە پێچەوانەی بڕیاری پەروەردەکەری خۆم چەند هەنگاوم ئەنا وە لە تێکەڵی و بیستن و وتن بەشێکم وەرئەگرت کە ئامۆژگاری مامۆستام بیر ئەکەوتەوە ئەم وت:

قازی دانیشێ لەگەڵمان بەرزئەکا بۆ ڕەقس دەست
موحتەسیب گەر مەی بنوشێ عوزر ئەداتە دەستی مەست

هەتا شەوێك بە ئەنجومەنێ گەیشتم گوێندەیەکم دی (شیعر)

ڕەگی گیان ئەپچڕێنێ دەنگی هەودای تاری ناسازی
لە دەنگی باوکە ڕۆ ناخۆشترە خۆ دەنگ و ئاوازی

ئاوازێ کە ﴿إِنَّ أَنْكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ﴾(1) لە وا هاتووە.

نُهَاجُ إِلَىٰ صَوْتِ الْأَغَانِي لِطِيبِهَا وَ أَنْتَ مُغَنٍّ إِنْ سَكَتَّ نَطِيبُ(2)

ئەچین بۆ دەنگی گۆرانی لە خۆشی کە تۆ گوێندە بی بێدەنگی خۆشە

تاوێ پەنجەی هاوڕێیان وا لە گوێدا، وە تاوێك وا بە سەر لێوە وەکە بێ دەنگ! (شیعر)

لە گوێ گرتنت نەی دی هیچکەس خۆشی مەگەر کاتی ڕۆین کە خامۆشی

* * *

کە هاتە ئاواز ئەو بوربوت ژەنە بە خانە خۆی وت: لە ڕێی یەزدانا
بیخە گوێم پەموو با گوێم لێ نەبێ یا قاپی کەوە دەرچم لەم یانا

بە کورتی ئاگاداری دڵی هاوڕێیانم ڕێك دی و شەوم بە چەند ڕەنج گەیاندە ڕۆژ.

موئەززن بانگی لێ هەڵدا لەناکاو کە نەی زانیوە چەند ڕابردووە شەو
درێژیی شەو لە موژگانم بپرسە لە چاوانم کە یەك دەم تێ نەچوو خەو

بەیانی بە ناوی پیرۆزییەوە میزەرەی لە سەرم وە دیناری لە کەمەرم دەرهێنا لە بەردەمی گوێندەدا دامناو گرتمە باوەش و زۆر سوپاسم کرد. هاوڕێیانم ئەمەیان بە پێچەوانەی

---

(١) بێ گومان ناخۆشترین ئاواز، ئاوازی کەرانە،-«ك».
(٢) بە دەنگی گەرمی کوردی مەستی مەستین
کە تۆ بێژی، کزو بێ حاڵ و پەستین،-«ك».

به خلافِ رایِ مربّی قدمی چند برفتمی و از سماع و مجالست حظّی برگرفتمی و چون نصیحتِ شیخم یاد آمدی، گفتمی:

**قاضی ار بـا مـا نشـیند بـرفشاند دست را**

**مُحتسب گر می‌خورد، معذور دارد مست را**

تا شبی به مجمعِ قومی برسیدم که در آن میان مطربی دیدم:

**گویی رگِ جان مـی‌گسلد زخـمه‌ی نـاسازش**

**نــاخوش‌تر از آوازه‌ی مـــرگِ پـــدر آوازش**

گاهی انگشتِ حریفان از او در گوش و گاه بر لب که خاموش.

**نُهاجُ إلی صَوْتِ اَلْأَغـانِی لِـطیبِهِ وَ أَنْتَ مُـــغَنٍّ إنْ سَکَتَّ نَـــطیبُ**

***

**نبیند کسـی در سـماعت خـوشی مگر وقتِ رفـتن کـه دم درکشـی**

***

**چون در آواز آمد آن بـربط سـرای کـــدخدا را گـــفتم: از بـهرِ خـدای**

**زیـــبقم در گـــوش کـن تـا نشـنوم یـــا درم بگشـــای تـــا بـیرون روم**

فی‌الجمله پاسِ خاطرِ یاران را موافقت کردم و شبی به چند مجاهده به روز آوردم.

**مـــؤذّن بـــانگ بـــی‌هنگام بـرداشت نمی‌داند کـه چـند از شب گـذشته‌ست**

**درازیِ شب از مـــژگانِ مـــن پـــرس که یک دم خواب در چشمم نگشته‌ست**

بامدادان به حکمِ تبرّک دستاری از سر و دیناری از کمر بگشادم و پیشِ مُغَنّی نهادم و در کنارش گرفتم و بسی شکر گفتم. یاران ارادتِ من در حقِ وی خلافِ عادت دیدند و بر

خووی من، وە بە سووکیی عەقڵم دی، نیهانی پێکەنین. یەکێ لە ناویانا زمانی تەشەری درێژ کردو کەوتە تانووت لێدانم کە ئەم کردەوەیە ڕێکی بڕیاری خیرەدمەندان نەبوو. خەرقەی مەشایخ بدەی بە گویندەیەکی وا کە لە هەموو تەمەنیا درەمێکی لە دەستاو حەڵقەیەکی لە دەفا نەبوە. (مەسنەوی):

گـــــویندەیەك دوور لەم خـــــانەدانـــا
دوو جــار کــەس نـەیدی لە یـەك دیـوانا
ڕاســـتی کــە دەنگــێ لەو دەمــە هــەستا
مووی لەشی خەڵکی ڕاست بووەوە وەستا
بـــاڵنـــدەی هـــەیوان لە ســـاما فــڕی
مەغزی ورد کـردین، قـوڕگـی خـۆی دڕی

وتم: ڕێك ئەوەیە زمانی تەشەر کورت کـەیتەوە لە بـەر ئـەوەی مـن کـەرامـەتی ئـەم پیاوەم[1] بۆ دەرکەوت. وتی: لە چۆنیەتی ئەوە ئاگادارم بکە تا منیش خۆم نزیك کەمەوەو داوای لێخۆش بوون بکەم بۆ تاوانم. وتم: بەو هۆیەوە مـامۆسـتای گـەورەم بـارەها بـە وازهێنانی گوێ گرتن فرمانی ئەدامێ و ئامۆژگاری بەرزی ئەکردم، نەهاتە گوێی قوبوولم، تا ئەستێرەی پیرۆزو بەختی بەرزم ڕابەری کردم بۆ ئەم شوێنە، وە لە دەست ئەمەدا تەوبەم کرد، کەچی ژیانم ماوە تێکەڵ نەبم و گوێ لە وتن نەگرم. (چواری):

لە دەم و لێوی شیرین دەنگی خۆش
پـەردەی بـێ و نـەبێ دڵ ئـەفرێنـێ
بەڵام عوششاق و نەهاوەند، حیجاز
لە گویندەی قەڵب خۆش نـانوێنـێ

## چیرۆك (٢٠)

بە لوقمانیان وت: لە کێوە وێڵ[2] و ئەدەب فێربوویت، وتی: لە بێ وێڵانەوە، هەرچی لە وانەوە لە بەر چاوم پەسەند نەبوو، لە کردنی ئەوە پارێزم کرد.

بــە گـاڵتـەیش بـێ ئـەگـەر پـیتێ بـوترێ
لەوە پەندێ وەر ئەگرێ خـاوەنی هـۆش
بەڵام سەد پەندی حیکمەت لای نەمامان
وەکو گاڵتەی لە گوێ دێ پیاوی بێ هۆش

---

(١) مەبەستی «شێخ ئەبولفەرەجی جەوزی»ە،ـ«ك».
(٢) وێڵ: ڕەوشت و خووی چاك، مرۆڤی سەرگردان و ئاوارە،ـ«ك».

خفّتِ عقلم نهفته بخندیدند. یکی ازان میان زبانِ تعرّض درازکرد و ملامت کردن آغاز که این حرکت مناسبِ سیرتِ خردمندان نکردی، خرقه‌ی مشایخ به چنین مطربی دادن که در همه عمرش درمی بر کف و قُراضه‌ای در دف نبوده است.

مطربی، دور از این خجسته سرای　　کس ندیدش دو بار در یک جای
راست چون بانگش از دهن برخاست　　خلق را موی بر بدن برخاست
مرغِ ایوان ز هَولِ او برمید　　مغزِ ما بُرد و حلقِ خود بدرید

گفتم: مصلحت آن است که زبانِ تعرّض کوتاه کنی که مرا کرامتِ شیخ ظاهر شد. گفت: مرا بر کیفیّتِ آن واقف گردان تا هم‌چنین تقرّب نمایم و بر مطایبه‌ای که گفتم استغفار گویم. گفتم: به علّتِ آن که شیخِ اَجَلّم بارها به ترکِ سماع فرمودی و موعظه‌های بلیغ گفتی و در سمعِ قبولِ من نیامدی تا امشب که طالعِ میمون و بختِ همایون بدین بُقعه رهبری کرد و به دستِ این توبه کردم که بقیّتِ عمر گردِ سماع و مجالست نگردم.

آوازِ خوش از کام و دهان و لبِ شیرین
گر نغمه کند ور نکند دل بفریبد
ور پرده‌ی عشّاق و حسینی و حجازست
از حنجره‌ی مطربِ مکروه نزیبد

## حکایت [۲۰]

لقمان را گفتند: ادب از که آموختی؟ گفت: از بی‌ادبان؛ هرچه از ایشان در نظرم ناپسند آمدی از فعلِ آن احتراز کردمی.

نگویند از سرِ بازیچه حرفی　　کزان پندی نگیرد صاحبِ هوش
وگر صد بابِ حکمت پیشِ نادان　　بخوانی، آیدش بازیچه در گوش

## چیرۆك (٢١)

ئەگێڕنەوە کە خواپەرستێ بە شەو دەمەنی ئەخواردو خەتمێکی ئەکرد. خاوەن دڵێ بیستیو وتی: ئەگەر لەتێ نانی بخواردایەو بنوستایە لەوە گەورەتر ئەبوو. (پارچە):

تۆ دەروونت بەتاڵی خواردن کە — نووری عیرفان ئەبینی ئەوساکە

بۆیە خاڵی لە حیکمەتی چونکە — تاکوو لووتت پڕی لە خۆراکە

## چیرۆك (٢٢)

بە بەخشایشی خوا، ڕێ ونکردوویەك چرای ڕێگەی دیو هاتە ڕیزی ئەهلی تەحقیقەوە، لە پیرۆزی دەروێشانو ڕاستیی نەفەسی ئەوانەوە، کردەوە ناپەسەندەکانی گۆڕا بە ڕەوشتی جوان. دەستی لە هەواو هەوەس کورت کردەوە. بەڵام زمانی تانووت لێدەران دەربارەی درێژ بوو. لەسەر شێوەی پێشووی، باوەڕیان بە چاکیو واز لە جیهان هێنانی نەکرد. (چواری):

تەوانای ڕزگار لە سزای خودا — بە هۆی تەوبەوە ئەکەوێتە دەس

بەڵام ناتوانی ڕزگارت بێ — بە هیچ کلۆجێ لە زمانی کەس[1]

توانای ستەمی زمانیانی نەبوو، دادی بردە بەر پیری تەریقەت، وتی: لە زمانی مەردومان لە ڕەنجام. وەڵامی دایەوە کە سوپاسی ئەم بەخشایشە چۆن بەجێ دێنی کە چاکتری لەوەی گومانت پێ ئەبەن؟

چەند ئەڵێیت کەوا بەدبینی حەسوود — لە کەمو کووری من نیهان ئەدوان

بۆ بەدخواهیی من کە دائەنیشتن — بۆ خوێن ڕشتنم هەڵئەسنە پێیان

چاك بیو خراپیت بڵێن چاکترە — لەوەی خراپ بیو چاکت کەن گومان

بەڵام من کە گومانی جوانی خەڵك دەربارەم تەواوە، وە من لە عەینی کەمی دام، ڕەوایە بیرکەمەوەو نەخۆش بکەوم. (تاك):

---

(١) بێ ئەوەی بمەوێ لە وەرگێڕ ڕەخنە بگەرم، ئەتوام بڵێم ئەو دوو شیعرە لە شعرێکا بگونجێنم وەکوو:
خوا خۆی بە تۆبە ئەبەخشێ تۆڵە — بەڵام زبانی خەڵك هەر شڕو شۆڵە،-«ك».

## حکایت [۲۱]

عابدی را حکایت کنند که شبی ده من طعام بخوردی و تا سحر ختمی بکردی. صاحب‌دلی بشنید و گفت: اگر نیم نانی بخوردی و بخفتی بسیار از این فاضل‌تر بودی.

اندرون از طعام خالی دار تا در او نورِ معرفت بینی
تهی از حکمتی به علّت آن که پُری از طعام تا بینی

## حکایت [۲۲]

بخشایش الهی گمشده‌ای را در مناهی چراغِ توفیق فرا راه داشت تا به حلقه‌ی اهلِ تحقیق درآمد. به یُمنِ قدمِ درویشان و صدقِ نَفَسِ ایشان ذَمایمِ اخلاقش به حَمایدِ مبدّل گشت. دست از هویٰ و هوس کوتاه کرد و زبانِ طاعنان در حقِ وی هم‌چنان دراز که: بر قاعده‌ی اوّل است و زُهد و صلاحش بی‌مُعَوَّل.

به عُذر و توبه توان رَستن از عذابِ خدای
ولیک می‌نتوان از زبانِ مردم رَست

طاقتِ جورِ زبان‌ها نیاورد و شکایت پیشِ پیرِ طریقت برد. شیخ بگریست و گفت: شکرِ این نعمت چگونه گزاری که بهتر از آنی که پندارندت.

چند گویی که بداندیش و حسود عیب گویانِ منِ مسکینند
گه به خون ریختنم برخیزند گه به بد خواستنم بنشینند
نیک باشی و بدت گوید خلق به که بد باشی و نیکت بینند

امّا مرا که حُسنِ ظنِّ مردمان در حقِ من به کمال است و من در عینِ نقصان، روا بوَد اندیشه بردن و تیمار خوردن!

ئـەوەی کـە ئـەموت گـەر بـمکردایـە     چاك ڕەوشت ئەبووم خواپەرست مایە

* * *

اِنّـی لَـمُسْتَتِرٌ مِـنْ عَـیْنِ جِیرانـی     وَ اللُّـهُ یَـعْلَمُ اَسْـرارِی و اَعْـلانِی

لە چاوی هـاوسێ خـۆم ئـەکـەم پـەنهان     خـودا ئـەزانـێ چـیم دیـارەو پـەنهان

(چوارینە):

قـاپی دائـەخەم لە خـۆم تـا کـەسان     کـەمو کـووڕی مـن نـەگـرنە چـاویان

چ سـوود داخسـتن لە (عـالم الغـیب)     زانـای ئـاشکرا زانـا بـە نـیهان

## چیرۆك (٢٣)

گلەییم بردە بەر یەکێ لە مەشایخە گەورەکان کە فڵان دەربارەم بە خراپی شەهادەتی داوە. وتی: تۆ بە وتنی چاکی، شەرمەزاری کە.

تـۆ چـاك ڕەوشت بـە هـەتا بـەد بیران     بـۆ خـراپ وتـن نـەیانبێ مـەیدان

ئاهەنگی بوربوت ڕاست بێ ئیتر کەی     زللـەی لێ ئـەدرێ بـە دەست گـویندان

## چیرۆك (٢٤)

لە یەکێ لە مەشایەخی شامیان پرسی: تـەسەووفی ڕاسـتی چـییە؟ وتـی: لەمـەوبەر دەستەیەك لە جیهانا هەبوون بە شێوە پەراکەندەو لە مەعنادا گردو کۆمەڵ. ئێستا کەسانێ هەن بە دیمەن گردو بە مەعنا پەرێشانو پەراکەندە.

(پارچە):

هـەر سـاتێ دڵت بـڕوا بـۆ شـوێنـێ     بـا بـە تـەنیایش بی سـەفا نـابینی

مـاڵو پـایەت بـێو زەرعو تـیجارەت     دڵ لەگـەڵ خـوابـێ گـۆشـەنشینی

## چیرۆك (٢٥)

دێتە یادم شەوێك لە کاروانێکا هەموو شەو ڕۆیشتبووم، لە گوێی بێشەیەك نوستبووم، عاشقێ لەو سەفەرەدا هاوڕێی ئێمە بوو لە بەرە بەیانا زریکەیەکی کردو ڕێگەی بـیابانی گرت، وە یەك هەناسە ئارامی نەگرت. کە ڕۆژ بووەوە پێم وت: ئەوە چ حاڵی بوو؟ وتی:

گر آن‌ها که می‌گفتمی کردمی　　نکو سیرت و پارسا بودمی

***

إنّی لَمُسْتَتِرٌ مِنْ عَیْنِ جیرانی　　وَاللّٰهُ یَعْلَمُ إسْراری و إعْلانِی

***

در بسته به روی خود ز مردم　　تا عیب نگسترند ما را
در بسته چه سود و عالم‌الغیب　　دانای نهان و آشکارا

## حکایت [۲۳]

گله کردم پیشِ یکی از مشایخ که فلان به فسادِ من گواهی داده است. گفت: به صلاحش خجل کن.

تو نیکو روش باش تا بدسگال　　به نقصِ تو گفتن نیابد مجال
چو آهنگِ بربط بوَد مستقیم　　کی از دستِ مطرب خورَد گوشمال؟

## حکایت [۲۴]

یکی را از مشایخِ شام پرسیدند که حقیقتِ تصوّف چیست؟ گفت: از این پیش، طایفه‌ای در جهان پراگنده بودند به صورت و به معنی جمع و این زمان قومی به صورت جمعند و به دل پراگنده.

چو هر ساعت از تو به جایی رود دل
به تنهایی اندر صفایی نبینی
ورت جاه و مال است و زرع و تجارت
چو دل با خدای است، خلوت نشینی

## حکایت [۲۵]

یاد دارم که شبی در کاروانی همه شب رفته بودم و سحر در کنارِ بیشه‌ای خفته. شوریده‌ای که در آن سفر همراهِ ما بود نعره برآورد و راهِ بیابان گرفت و یک نَفَس آرام نیافت. چون روز شد گفتم: این چه حالت بود؟ گفت: بلبلان را شنیدم که به نالش در آمده

بولبولانم دی هاتبوونە نالە بە سەر درەختانەوە، وە کەوەکان بە کۆسارەوە، وە بەراز[١] لە ئاوا، جانەوەران لە بێشەدا، کەوتمە بیر کردنەوە کە مروەت نییە هەموو لە تەسبیحاتابن و من بە گێژی و خەو کەی ڕەوایە؟

| | |
|---|---|
| دوێ بـەیانی مـەلێ بـوو ئـەی نـالاند | بردی توانام و عـەقڵ و تـاقەت و هـۆش |
| گەیبە گوێی دۆستی ڕاستەقینەی مـن | دەنگ و ئاوازی من بە جۆش و خـرۆش |
| وتـی: مـن بـاوەڕم نـەبوو کـە وەها | دەنگـی بـاڵەنـدە تـۆ بکـا مـەدهۆش |
| وتـم: کـەی مـەرجـی ئـادەمیزادە | مەل کە تەسبێح بخوێنێ مـن خـامۆش |

## چیرۆك (٢٦)

کاتێ لە سەفەری حیجازا دەستەیەك جوانانی خاوەن دڵ هاوڕێمان بوون، هام دەم و هاوهەنگاو، کاتەها زەمزەمەیان ئەکردو شیعری وردیان ئەخوێندەوە. خواپەرستێ لەو ڕێیە باوەڕی بە حاڵی دەروێشان نەبوو، وە ئاگای لە دەردی دڵیان نەبوو. هەتا گەیشتینە خێڵی بەنی هیلال، مناڵێکی ڕەش لەو هۆزە عەرەبە هاتەدەرەوە ئاوازێکی بەرز کردەوە کە باڵندەی لە هەوا ئەهێنایە خوارەوە. حوشتری عابیدم دی کەوتە هەڵپەرکێ و عابیدی فڕێدایە خوارێ و ڕێی بیابانی گرتەبەرو ڕۆیشت، وتم: یاشێخ لە حەیوانات کاریگەر بوو، وە تۆ هیچ نەگۆڕایت. (پارچە):

| | |
|---|---|
| ئـەزانـی چـی وت بـولبولی سـەحەر | تۆ کەی ئادەمیت لە عەشق بێ خەبر |
| بە شیعری عەرەب حوشتر هاتە جۆش | زەوقت نـەبێ تـۆی وەکـوو جـانەوەر |
| لە سـەریا بـێ شـۆر ئـەو حـوشترە | ئـەگـەر ئـادەمیزاد نـەیبێ، کـەرە |
| وَ عِنْدَهُبُوبِ النّاشراتِ عَلَى الحِمَىٰ | تَميلُ غُصُونُ الْبانِ لَاالْحَجَرُ الصَّلْدِ[٢] |

* * *

(١) لە فارسییەکەدا نووسراوە: «غوکان درآب»؛ غوك: قورواق، بۆق، بەق. دوور نییە لە نووسخەکەی بەردەستی مامۆستادا بە هەڵە نووسرابێ «خوك» یانی: بەراز.-ع.

(٢) تەرجەمەی شیعرە عەرەبییەکە:

بـە هـۆنـەی بـا، شـنەی دارەو، لق و پـۆ

نە بەردی سەردو سڕ، دڵڕەق، وەکوو تۆ.-«ك».

بودند از درخت و کبکان در کوه و غوکان در آب و بهایم در بیشه؛ اندیشه کردم که مروّت نباشد همه در تسبیح و من به غفلت خفته.

دوش مرغی به صبح می‌نالید / عقل و صبرم ببرد و طاقت و هوش
یکی از دوستانِ مخلص را / مگر آوازِ من رسید به گوش
گفت: باور نداشتم که تو را / بانگِ مرغی کند چنین مدهوش
گفتم: این شرطِ آدمیّت نیست / مرغ تسبیح گوی و من خاموش!

## حکایت [۲۶]

وقتی در سفرِ حجاز جماعتی جوانانِ صاحب‌دل همدمِ من بودند و هم‌قدم. وقت‌ها زمزمه‌ای بکردندی و بیتی محقّقانه بگفتندی و عابدی در سبیل، مُنکرِ حالِ درویشان و بی‌خبر از درد ایشان. تا برسیدیم به نخله‌ی بنی‌هلال. کودکی سیاه از حیِّ عرب به در آمد و آوازی برآورد که مرغ از هوا در آورد. اشترِ عابد را دیدم که به رقص اندر آمد و عابد را بینداخت و راهِ بیابان گرفت. گفتم: ای شیخ، در حیوانی اثر کرد و در تو اثر نمی‌کند!

دانی چه گفت مرا، آن بلبلِ سحری؟
تو خود چه آدمیی کز عشق بی‌خبری؟
اشتر به شعرِ عرب، در حالتست و طرب
گر ذوق نیست تو را، کژ طبع جانوری

***

وَ عِنْدَ هُبُوبِ النّاشِراتِ عَلَی الْحِمیٰ / تَمیلُ غُصُونُ الْبانِ لاَ الْحَجَرُ الصَّلْدُ

***

بـە زیکـری وا لە جـۆشـا چـی ئـەبینی    بـەڵام ئـەم حـاڵە خـاوەن گـوێ ئـەزانـێ
نـەهەر بـولبول لەسـەرگوڵ وا لە تـەسبێح    لە هـــەر دڕکـێ لە تـەسبێحـا زمـانێ

## چیرۆك (٢٧)

یەکێ لە پادشایان تەمەنی گەیشتە دوایی، جێنشینێکی نەبوو، وەسیەتی کرد بەیانی یەکەم کەس لە قاپیی شارەوە هات، تاجی شاهی بنێنە سەر، وە ئیشی وڵاتی پێ بسپێرن. وا ڕێکەوت یەکەم کەس کەهات گەدایەك بووکە لە هەموو تەمەنیا پارووی چنیوەتەوە، وە پینەی لەسەرپینە درووەتەوە. پایەکانی دەوڵەتو پیاو ماقووڵانی ئاستان وە سیەتی پادشایان بەجێ هێناو کلیلی قەڵاو گەنجەکانیان پێسپارد. هەندێ حوکمداری کرد هەتا هـەندێ لە فـەرمانداران سـەریان لە فـەرمانی پێچـایەوە. پاشان لە هـەرلاوە کـەوتنە بەربەرەکانێ کردنیو سوپایان ڕازاندەوە. بەکورتی سوپاو گەل بە یەکا هاتن، وە هەندێ لە کەناری وڵاتی لەدەس دەرچوو. دەروێش لەم لێقەومانە دڵی نەخۆش کەوت، هەتا یەکێ لە دۆستانی کۆنی زەمانی دەروێشی لە سەفەرێ هاتەوە، هاوڕێکەی لەو پایەیەدا دی. وتی: سوپاس بۆ خوای بەرزو بڵند کە بەخت یاوەری کردی، وە دەوڵەت ڕابەری، هـەتا گوڵت لە دڕكو دڕکت لە پێ دەرهات. ﴿إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً﴾. (تاك):

پشکووت غونچە بۆت کە لەم وشکانە    دار ڕوتـــە بـۆ تـۆ سـەوزە زمـانە[1]

وتی: ئەی خۆشە ویست سەرخۆشیم لێبکە جێی پیرۆزبایی نییە ئەو کـاتە تـۆ دیت غەمم هەبوو بۆ نانێو ئێستا بۆ جیهانێ. (چواری):

ئـەگـەر دنیا نـەبوو وا دەردمـەندی    بە خۆشی وا ئەگەر بوو دڵ لە بەندی
بـە ئـاشووبتر بـەڵا کـوا لەم جیهانە    نـەبوونو بـوونی ڕەنجێکی گـرانـە

* * *

(١) لە هەندێ نووسخەدا ئەم شیعرەش هەیە:
لە کـاری بـەستە دڵت نـەشکێ لێی مـەترسە تـۆ
کە ئاوی زیندەگانی لە تاریکیدایە سەرچاوەی،.و.

به ذکرش هرچه بینی در خروش است  دلی داند در این معنی که گوش است
نه بلبل بر گلش تسبیح خوانی است  که هر خاری به تسبیحش زبانی است

## حکایت [۲۷]

یکی از ملوک مدّتِ عمرش سپری شد و قایم‌مقامی نداشت. وصیّت کرد که بامدادان نخستین کسی که در این شهر آید تاجِ شاهی بر سرِ وی نهید و تفویضِ مملکت بدو کنید. اتفاقاً اول کسی که درآمد گدایی بود همه عمر لقمه اندوخته و خرقه بر خرقه دوخته. ارکانِ دولت و اعیانِ حضرت وصیّتِ مَلِک به‌جای آوردند و تسلیمِ مفاتیحِ قِلاع و خزاین بدو کردند و مدّتی ملک راند. پس بعضی امرای دولت گردن از مُطاوعتِ او بپیچیدند و ملوک از هر طرف به منازعت برخاستندو به مقاومت لشکر آراستند. فی الجمله سپاه و رعیّت به‌هم برآمدند و برخی طرفِ بلاد از قبضِ تصرّفِ او به در رفت. درویش از این جهت خسته خاطر همی بود تا یکی از دوستانِ قدیمش که در حالتِ درویشی قرینش بود از سفر بازآمد و در چنان مرتبه دیدش. گفت: منّت خدای را، عَزَّوَجَلّ، که گُلت از خار برآمد و خار از پای به در آمد و بختِ بلندت یاوری کرد و اقبال و سعادت رهبری تا بدین پایه برسیدی؛ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ یُسْراً.

شکوفه گاه شکفته‌ست و گاه خوشیده  درخت وقت برهنه‌ست و وقت پوشیده

گفت: ای یارِ عزیز تعزیتم گوی، چه جایِ تهنیت است؟ آن دم که تو دیدی غمِ نانی داشتم و امروز تشویشِ جهانی.

اگر دنیا نباشد دردمندیم  وگر باشد به مهرش پای‌بندیم
بلایی زین جهان آشوب‌تر نیست  که رنجِ خاطرست، ار هست ور نیست

***

گـــەر دەوڵەمـــەندی ئـەکـەی ئـارەزوو
هـــەر قـــەناعەتە ڕەنگـــینت کـــا زوو
زەنگـــین بـــە داوێن گـەر بـبەخشێ زەڕ
هـــەتا پـــاداشـــی نـــەگـریتە نـەزەر
زۆر لە گەورەم بیست توانای دەروێشان
چـــاترە لە خـەرجـی دەوڵەمـەندەکـان
بـــارام گـــەر بکـا کـەروێشکـێ بـریان
نـــابێ بـــە قـاچی کـوللەی مـێلـووران

## چیرۆك (٢٨)

ئـــەبوو هـــورەیرە -ڕەزای خـــوای لێ بــێ- هــەموو ڕۆژی ئـەچووە خـزمەت محمدالمصطفیٰ، سەلامی خوای لەسەر، فەرمووی ئەی ئەبوو هورەیرە «زُرْنِی غِبّاً تَزْدَدْ حُبّاً» یانی ڕۆژە نە ڕۆژ زیارەتم بکە تا خۆشەویستیت زیاد بێ.

بە خاوەن دڵێکیان وت: ڕۆژ بەو جوانییە هەیە نەمان بیستووە کەسێ حەزی لێ بکاو دڵداری لەگەڵ بکات. وتی: لەبەر ئەوەیە هەموو ڕۆژێ ئەتوانن ببینن مەگەر لە زستانا شاراوەو خۆشەویستە.

چـوونە لای یـاران سـووکی تیا نییە — بەڵام نەك هێنـدە کـە پێت بـڵێن بـەس
ئەگەر تۆ لە خۆت بۆت بدرێ تانووت — بەرگوێت ناکـەوێ کـە تـانووتی کـەس

## چیرۆك (٢٩)

یەکێ لە پیاوە گەورەکان بایەکی ناڕێك لە سکیا پێچی دا، توانـای ڕاگـرتنی نـەبوو، بەناچار بەریداو وتی: ئەی دەروێشان من ئێستا وا هیچ چارێکم نەبوو، وە گـوناهێکـیان لەسەرمن نەنووسیو ئیستراحەتێکیش بە دەروونـی مـن گـەیشت. ئـیوەش لە ڕووی بـە خشینەوە بیانووم تەواو ببینن.

کە سك زیندانی بایە ئەی خیرەدمەند — کەسێ عەقڵی هەبێ با چۆن ئەکا بەند؟
کـە پـێچی‌دا لە سك، بـا، بـیکەرە دەر — کە بای سك بارە بۆ دڵ ئەی هونەروەر

مَطلَب، گر توانگری خواهی / جز قناعت که دولتی است هَنی
گر غنی زر به دامن افشانَد / تا نظر در ثوابِ او نکنی!
کز بزرگان شنیده‌ام بسیار: / صبرِ درویش به که شکرِ غنی
اگر بریان کند بهرام گوری / نه چون پای ملخ باشد ز موری

## حکایت [۲۸]

اَبُو هُرَیْرَه، رَضِیَ اللهُ عَنْهُ، هر روز به خدمتِ مصطفیٰ، صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَ سَلَّم، آمدی. یک روز فرمود: **یا اَبا هُرَیرَه زُرنِی غِبّاً تَزْدَدْ حُبّاً**: هر روز میا تا محبّت زیادت شود.

صاحب‌دلی را گفتند: بدین خوبی که آفتاب است نشنیده‌ایم که کسی او را دوست گرفته است و عشق آورده. گفت: سبب آن که هر روز توان دیدن مگر در زمستان که محجوب است و محبوب.

به دیدارِ مردم شدن عیب نیست / ولیکن نه چندان که گویند بس
اگر خویشتن را ملامت کنی / ملامت نباید شنیدن ز کس

## حکایت [۲۹]

یکی را از بزرگان بادی مخالف در شکم پیچیدن گرفت و طاقتِ ضبطِ آن نداشت. بی‌اختیار از وی جدا شد. گفت: ای دوستان مرا در آن چه کردم اختیاری نبود و بزه‌ای بر من ننوشتند و راحتی به من رسید؛ شما هم به کَرَم معذور دارید و به عفو در گذارید.

شکم زندانِ بادست، ای خردمند / ندارد هیچ عاقل باد در بند
چو باد اندر شکم پیچید فروهل / که باد اندر شکم بارست بر دل

***

(تاك):

ڕوو ترشت ئەگەر هەبوو لە هاوڕێ | گەر ویستی بڕوا تۆ لێی مەگرە ڕێ
---|---

## چیرۆك[١]

یەکێ دۆستێکی هەبوو کە ئیشی دیوانی ئەکرد، کاتێکی زۆر چاو پێ‌کەوتنی بۆ ڕێك نەکەوت. یەکێ پێی‌وت: واکۆن بوو کە فلانت نەدیوە، وتی: نامەوێ ببینم وا ڕێ‌کەوت یەکێ لە خزمانی لەوێ بوو. لێی پرسی: چی کردووە وا لە چاوپێ‌کەوتنی زویری؟ وتی: هیچ زویر نیم، بەڵام دۆستی دیوانی کاتێ ئەتوانرێت ببینرێت کە لە ئیش خرا، وە منیش ڕەحەتی خۆم لە ڕەنجی ئەوا ناوێت.

کاتی گەورەیی‌و ئیش‌و گیرو دار | دڵیـــان بـــەتاڵە لە ئـــاشنایان
---|---
ڕۆژی دامــاوی‌و لە ئیش لابـران | دەردی دل دێنن بۆ بەردەم یـاران

## چیرۆك (٣٠)

لە هاورێ‌یەتی یارانی شام بێ‌تاقەتی‌یەکم بۆ پەیدا بوو، سەرم نایەوە بۆ بیابانی قودس، لەگەڵ جانەوەران کەوتمە ڕابواردن هەتا هەنگاوێ بووم بە دیـلی زنـجیری فـەرەنگ. لە خەندەقی تەڕابلوس لەگەڵ جولەکەکانا قوڕەکاری‌یان پێ‌ئەکردم. یەکێ لە سەردارانـی حەڵەب کە ناسیاوی ڕابوردوومان هەبوو بەلاما ڕابوورد ناسیمیەوە، وتی: ئەمە چ حاڵێکە کە هۆی ئەم ڕەنجەیە؟ وتم: چی بڵێم؟ (پارچە):

لە ئینسان ڕام کرد بۆ کێوو بۆ دەشت | لەگەڵ خوادا نەبێ نـەمبێ خـەریکی
---|---
تـەماشا حـاڵەتـم ئـێستا لە تـاوڵە[٢] | لەگەڵ غەیری بەشەر بمبێ خەریکی

(تاك):

پێ لە زنـجیر چـاترە لای دۆسـتان | نەك لەگەڵ بێگـانە بـاغ‌و بـۆسـتان
---|---

(پارچە):

لە کـل خـۆشـترە لە چـاوا شـووژن | برووسکەی ئاگر خـەرمان سـووتانن
---|---
زنجیری فـەرەنگ لە مـلتا بـێ کـوت | نـەك لە جێی دۆسـتا ببینی دوژمـن

(١) ئەم چیرۆکە لە هەندێ نوسخەدا نییە.

(٢) تاوڵە: زوژ، بەیانی، تەوێڵەی وڵاخ، بە مەعنای نەرد، نەردین، وە گیای گژنیژیش هاتووە.

حــــریفِ تُــــرُش رویِ نـــاسازگار　　　چو خواهد شدن دست پیشش مدار

## حکایت [۳۰]

از صحبتِ یارانِ دمشقم ملالتی پدید آمده بود؛ سر در بیابانِ قدس نهادم و با حیوانات انس گرفتم تا وقتی که اسیرِ قیدِ فرنگ شدم و در خندقِ طرابلس با جهودانم به کارِ گِل داشتند. یکی از رؤسای حَلَب که سابقه‌ی معرفتی میانِ ما بود گذر کرد و بشناخت. گفت: این چه حالت است؟ گفتم: چه گویم؟

همی گریختم از مردمان به کـوه و بـه دشت
که جز خـدای نـبودم بـه دیگـری پـرداخت
قیاس کن که چه حـالم بـوَد در ایـن سـاعت
که در طـویله‌ی نـامردم هـم بـباید سـاخت

***

بەزەیی بە حاڵما هاتەوە، بە دە دینار لە زنجیری فەرەنگ کڕیمیەوە، لەگەڵ خۆیا هێنامیەوە بۆ حەڵەب کچێکی هەبوو هێنایە نیکاحمەوە لێی مارە کردم لەسەرسەد دینار مارەیی. کاتێکی بەسەرا ڕۆیی، توند خووی‌و تیژروویی دەست پێ کرد، وە زمان درێژی گرتەبەر، تا ڕابواردنی لێ تاڵ کردم. (شیعر):

پیاو چاك لە ماڵیا بوو ژنی بەدخوو    دۆزەخ لە جیهان بۆ ئەو کەوتە ڕوو
خۆت لە جووتی بەد دوورگرە زینهار    (وَقِـنا) خوا (مِنْ عَذابِ النَّار)

هەموو جارێ زمانی توانجی درێژ ئەکردو ئەیوت: تۆ ئەوە نیت باوکم بە دە دینار لە زنجیری فەرەنگ ڕزگاری کردی؟ وتم: بەڵێ من ئەوەم بە دە دینار لە زنجیری فەرەنگ ڕزگاری کردم‌و بە سەد دینار بە زنجیری تۆ دوچاری کردم. (شیعر):

بیستم کە جارێ پیاوێکی بوزورگ    مەڕی ڕزگار کرد لە دەس دەمی گورگ
شەو هات‌و چەقۆی لە قووڕگی ماڵی    مەڕ لە ژێر چەقۆ بە زار دەناڵی
ئەیوت لەدەم گورگ تۆ دەرت هێنام    کەچی بوویتە گورگ گیانت دەرهێنام

## چیرۆك (٣١)

یەکێ لە پادشایان لە خواپەرستێکی خاوەن مناڵی پرسی: کاتی خۆشەویست چۆن ڕائەبوێریت؟ وتی: هەموو شەو لە پاڕانەوە دا، هەموو بەیان لە دووعای پێویستا، وە هەموو ڕۆژ لە بەند کردنی خەرج کردنا، تا پادشا لە مەبەستی جوان تێ گەیشت، فەرمانی‌دا چی بەش ئەکا بۆی دیاری کەن، هەتا باری ماڵ‌و مناڵ لەسەردڵی لاچێ. (پارچە):

ئەی گرفتاری دەستی ماڵ‌و مناڵ    تۆ لە ئاسوودەگی نەکەویە خەیاڵ
غەمی وردان‌و نان‌و بەرگ‌و قووت    تۆ ئەگێڕێتەوە لەڕێی مەلەکووت
هەموو ڕۆژی وەها ئەدەم بڕیار    کە بە شەو بچمە خزمەتی دادار
دایەدەستم کە نوێژی شەو بە خەیاڵ    ئەکەوم: چی بخۆن سبەینێ مناڵ؟

## چیرۆك (٣٢)

یەکێ لە خواپەرستانی شام لە بێشەیەکا ژیانی ئەبردە سەر، وە بەرگی درەختانی ئەخوارد. پادشایەك بە ناوی زیارەتەوە چووە نزیکی‌و پێی‌وت: ئەگەر بە باشی ئەزانی لە

بر حالتِ من رحمت آورد و به ده دینارم از قیدِ فرنگ خلاص داد و با خود به حلب برد و دختری که داشت به عقدِ نکاحِ من درآورد به کاوینِ صد دینار. مدّتی برآمد. اتفاقاً دختری بدخوی، ستیزه‌روی، نافرمانبُردار، بود؛ زبان‌درازی کردن گرفت و عیشِ مرا منغّص داشتن. چنان که گفته‌اند:

زنِ بد در سرای مردِ نکو / هم در این عالَم است دوزخِ او
زینهار از قرینِ بد، زنهار! / وَ قِنا رَبَّنا عَذابَ ٱلنّار

باری زبانِ تعنّت دراز کرده همی گفت: تو آن نیستی که پدر من تو را از قیدِ فرنگ به ده دینار خلاص داد؟! گفتم: بلی، به ده دینارم از قیدِ فرنگ خلاص کرد و به صد دینار در دستِ تو گرفتار.

شنیدم گوسفندی را بزرگی / رهانید از دهان و دستِ گرگی
شبانگه کارد بر حلقش بمالید / روانِ گوسفند از وی بنالید
که از چنگالِ گرگم در ربودی / چو دیدم عاقبت خود گرگ بودی

## حکایت [۳۱]

یکی از پادشاهان عابدی را پرسید که اوقاتِ عزیزت چون می‌گذرد؟ گفت: همه شب در مناجات و سحر در دعای حاجات و همه روز در بندِ اخراجات. مَلِک را مضمونِ اشارتِ عابد معلوم گشت. فرمود تا وجهِ کفافِ او معیّن دارند تا بارِ عیال و اطفال از دلِ او برخیزد.

ای گرفتارِ پایْبندِ عیال / دگر آزادگی مبند خیال
غمِ فرزند و برگ و جامه و قوت / بازت آرد ز سَیر در مَلَکوت
همه روز اتّفاق می‌سازم / که شبی با خدای پردازم
شب چو عقدِ نماز می‌بندم / چه خورَد بامداد فرزندم؟

## حکایت [۳۲]

یکی از متعبّدانِ شام چند سال در بیشه‌ای زندگانی کردی و برگِ درختان خوردی. یکی از پادشاهانِ آن طرف به حکمِ زیارت به نزدیکِ او رفت و گفت: اگر مصلحت بینی

شارا جێیەکت بۆ ڕێك بخەم تا دڵ بەتاڵ چاکتر خواپەرستیت بۆ بکرێتو خەڵکی تریش لە پیرۆزیی هەناسەتانەوە کەڵك وەر بگرنو پەیڕەوی کردەوەی چاکی ئێوە بکەن. خواپەرست ئەم وتەیەی پێخۆش نەبوو، ڕووی لێوەرگێڕا. یەکێ لە وەزیران پێی وت: ئاگاداری کردنی دڵی پادشا ڕەوایە، ئەگەر چەند ڕۆژێ بێیتە شارەوە ژیان بەریتە سەرو چۆنیەتیی شوێنت بۆ دەر ئەکەوێت. جا ئەگەر کاتی ڕووناکی خۆشەویستیت لە هاوڕێیەتی بێگانە لێڵ بوو ئیش بە دەست خۆتە. ئەگێڕنەوە کە خواپەرست هاتە شارەوە، کۆشكو باغی پادشایان پێ سپارد، شوێنێکی دڵگوشای گیانی چەشنی بەهەشت. (چوارینە):

سوورەگوڵ چەشنی گۆنای جوانان — سونبول بە وێنەی زوڵفی دڵداران
لە ترسی ساردی بورجی پیرێژن — وەك منداڵ شیری دایەن نەخواردن[1]
وَ اَفانِینُ عَلَیْها جُلنار — عُلِّقَتْ بِالشَّجَرِ الْاَخْضَرِ نار
لقەکانی بە سەریەوە گوڵنار — داری سەوزە کە پێوە ئاگر دیار

پادشا کوتووپڕ کەنیزەکێکی بۆ نارد ڕوو، ماهی تابان کە ئەمە نیشانەیەتی (شیعر):

پارچە مانگێ بوو عابید تەفرە دەر — فریشتە وێنەو تاوس باڵو پەڕ
ئەگەر ببینێ کاتێ خواپەرست — نامێنێ بەرگی سروەتی لە بەر

هەروەها لە دوای ئەوە کۆیلەیەکی بێ وێنەو باڵاجوانێ بۆ نارد کە:

وا لە دەوری لە تینویەتی خنکان — سەیر ئەکاو ئاو بە هیچ کەسێ نادات
خۆ لە دیداری دیدە نابێ تێر — وەکو تینوو لە ئاوی چۆمی فوڕات

خواپەرست کەوتە خواردنی خۆش خۆشو لەبەر کردنی جلو بەرگی جوان لە میوەو بۆنی خۆشو شیرینی وەرگتنو جوانی کۆیلەو کەنیزەك تەماشا کردن، خیرەدمەندان وتوویانە زوڵفی جوانان زنجیری پێی عەقڵەو داوی مەلی زیرەکە. (تاك):

لە سەرو کاری تۆ دا چوو دڵو دینو هەموو دانش
مەلی زیرەك بە حەقیقەت منم ئەمڕۆ تۆ داوی

---

(١) شەونم لە سەر گوڵ خێوەی هەڵدا بوو — لەو شوێنە خەیاڵ پێی هەڵخزابوو.-«ك».

در شهر از بهرِ تو مَقامی سازم که فراغِ عبادت به از این دست دهد و دیگران هم به برکاتِ اَنفاسِ شما مُستَفید شوند و به صلاحِ اعمالِ شما اقتدا کنند. زاهد قبول نکرد. وزرا گفتند: پاسِ خاطرِ مَلِک را روا باشد اگر چند روزی به شهر اندر آیی و کیفیّتِ مکان معلوم کنی. پس اگر صفای وقتِ عزیزان را از صحبتِ خلق کدورتی باشد، اختیار باقی است. عابد به شهر درآمد و سرا بُستانِ خاصِّ مَلِک بدو پرداختند: مَقامی دلگشای، روان آسای.

گلِ سرخش چو عارضِ خوبان — سنبلش همچو زلفِ محبوبان
همچنان از نهیبِ بَردِ عَجوز — شیر ناخورده طفلِ دایه هنوز
وَ اَفانِینُ عَلَیْها جُلَّنار — عُلِّقَتْ بِالشَّجَرِ اَلْاَخْضَرِ نار

مَلِک در حال کنیزکی خوب‌روی پیشش فرستاد:

از این مه پاره‌ای، عابد فریبی — مَلایک صورتی، طاووس زیبی
که بعد از دیدنش صورت نبندد — وجودِ پارسایان را شکیبی

هم‌چنین در عقبِ او غلامی بدیع الجمال، لطیف الاعتدال که زورِ بازوی جمالش پنجه‌ی تقوا شکسته بود و دستِ قوّتِ صاحب‌دلان بر کتف بسته:

هَلَكَ اَلنّاسُ حَوْلَهُ عَطَشاً — وَ هوَ ساقٍ یَریٰ وَ لا یَسْقی
دیده از دیدنش نگشتی سیر — همچنان کز فُرات مُسْتَسْقی

عابد طعام‌های لطیف خوردن گرفت و کسوت‌های نظیف پوشیدن و از فَواکِه و مَشموم و حلاوات تمتّع یافتن و در جمالِ غلام و کنیزک نگرستن و حکما گفته‌اند: زلفِ خوبان زنجیرِ پای عقل است و دامِ مرغِ زیرک.

در سرِ کارِ تو کردم دل و دین با همه دانش
مرغ زیرک به حقیقت منم امروز و تو دامی

(پارچە):

دڵو عەقڵ ئەبەن ئەگەر دولبەران    بۆچ ئەچنە خەڵوەت ئیتر زاهیدان

گەر دانەی خاڵی ببینی زینهار    ئەزانی زوڵفی داوە بۆ دڵان

دولبەری شۆخو چوستو نازەنین    کەمتر سڵ ئەکەن لە ڕووی عاشقان

بەکورتی دەوڵەتی گردو کۆی ڕووی کردە پەرێشانی، وەکوو وتوویانە:

هەرکەس لە فەقیو لە پیرو دەروێش    خاوەن زمانان لە نەفەس خاوێن

کە هاتنە خوارێ بۆ جیهانی دوون    ئەچەقن وەکوو مێشی ناو هەنگوێن

جارێکی‌تر پادشا ئارەزووی دیدەنی کرد، سەیری کرد خواپەرست لە شێوەی جارانیا نەماوە سوورو سپی‌و قەڵەو بووە، پاڵی داوە بە پشتی‌یەکی ئاوریشمەوە، وە کۆیلەیەکی پەری ڕوخسار بە باوەشێنێکەوە کە لە پەڕی تاوس کراوە بە ژوور سەریەوە وەستاوە، پادشا بۆ سەلامەتی حاڵی شادمانی نواند، وە لە هەر ڕوویەکەوە دوان، هەتا پادشا لە ئەنجامی وتارا وتی: ئەوندەی من ئەم دوو دەستەیەم لا دۆستن لای کەس وا نییە. یەکێ زانایانو ئەوی‌تریان زاهیدان. وەزیرێکی فەیلەسووفی جیهان دیدەی لەگەڵ بوو وتی: ئەی خاوەنی ڕووی زەوی مەرجی دۆستی لەگەڵ ئەم دوو تیرەیە ئەوەیە چاکە بکەیت: زێڕ بدە بە زانایان هەتا هی‌تر بخوێنن، وە هیچ مەدە بە زاهیدان هەتا بە زاهیدی بمێننەوە.

(چواری):

خانمی جوان شێوە، پاکژ[1] ڕوو، دەبا    نەیبێ پیرۆزە، نگین، نەخش‌و نیگار

گەر ڕەوشتی جوانی بوو دەروێش ئیتر    نانی تەکیەی با نەبێ‌و پارووی هەژار

(تاك):

بۆ شتێك بمێنێ لە دڵما کەلێن    بۆ ئەوە ناشێم زاهیدم پێ‌بڵێن

## چیرۆك (٣٣)

ڕێکی ئەم وتارە، پادشایەك ئیشێکی گرنگی هاتە پێش، وتی: ئەگەر ئەنجامی ئەم کارە بە ئارەزووی من هات ئەوەندە درەم ئەدەم بە زاهیدان. پێویستی هاتەجێ، ناڕەحەتی دڵی

---

(١) پاکژ: جوان، پاك، خاوێن، لەوەڕ یا دارستانێ کە قەدەغەن کرابێ «ك».

فی الجمله دولتِ وقتِ مجموع به زوال آمد چنان که گفته‌اند:

هرکه هست از فقیه و پیر و مُرید — وز زبان‌آورانِ پاک نَفَس
چون به دنیای دون فرود آمد — به عسل در، بماند پای مگس

باری مَلِک به دیدنِ او رغبت کرد. عابد را دید از هیأتِ نخستین بگردیده و سرخ و سپید برآمده و فربه شده و لِبسِ ثَمین پوشیده و بر بالشِ دیبا تکیه زده و غلامی پری پیکر با مِرْوَحه‌ی طاووسی بالای سرش ایستاده. مَلِک بر سلامتِ حالش شادمانی کرد و از هر دری سخن گفتند تا به انجامِ سخن مَلِک گفت: من این دو طایفه دوست می‌دارم از عالَمیان: یکی علما و دیگر زهّاد. وزیری فیلسوفِ جهان‌دیده حاضر بود گفت: ای پادشاه، شرطِ دوستی آن است که با هردو طایفه احسان کنی: علما را زر بده تا دیگر بخوانند و زهّاد را چیزی مده تا زاهد بمانند.

خاتونِ خوب صورتِ پاکیزه روی را — نقش و نگار و خاتمِ پیروزه گو مباش
درویشِ نیک سیرتِ فرخنده رای را — نانِ رِباط و لقمه‌ی دریوزه گو مباش

***

تا مرا هست و دیگرم باید — گر نخوانند زاهدم، شاید

## حکایت [۳۳]

مطابقِ این سخن، پادشاهی را مهمّی پیش آمد. گفت: اگر انجامِ این حالت به مرادِ من برآید چندین درم دهم زاهدان را. چون حاجتش برآمد و تشویشِ خاطرش برفت وفای

ڕۆیشت، پێویست بوو پەیمانی بەجێ بێنێت. کیسەیەك درەمی دایە پیاوێکی خۆی هەتا بەسەر زاهیدانا بەشی کات. ئەڵێن پیاوێکی عاقڵو هۆشیار بوو هەموو ڕۆژ گەڕا شەو هاتەوە درەمەکانی ماچ کردو لەبەردەمی پادشادا دایnان، وتی: هەرچەندێ بۆ زاهیدان گەڕام دەسم نەکەوتن. پادشا وتی: ئەم وتارە چۆن وتارێکە؟ ئەوەی من پێی بزانم لەم وڵاتەدا چوارسەد زاهید هەیە. وتی: ئەی خاوەنی ڕووی زەوی ئەوەی زاهیدە وەری ناگرێت، ئەوەش وەری ئەگرێت زاهید نییە. پادشا پێکەنیو وتی: ئەوەندەی من دەربارەی خواپەرستان باوەڕم هەیە، بڕیاری ئەم چاوبێشەرمە دەربارەیان دوژمنایەتیو بێبڕوایی‌یە، حەقیش لای ئەوە. (تاك):

زاهید کە ویستی درەمو دینار زاهیدێکی‌تر دەس‌خەو بیکە یار

## چیرۆك (٣۴)

لە زانایەکی گەورەیان پرسی: چی ئەڵێیت لە بارەی نانی وەقفەوە؟ وتی: ئەگەر نانی وەقف بۆ کۆکردنەوەی دڵ بێ دروستو حەڵاڵە، وە ئەگەر کۆ بوونەوەو دانیشتن بۆ نانی وەقف بێ قەدەغەو حەرامە. (تاك):

خاوەن‌دڵ نانی بۆ خەڵوەت ئەوێ نەك کونجی خەڵوەت بگرێ لە بۆ نان

## چیرۆك (٣٥)

دەروێشێ ڕێی کەوتە شوێنێ. خاوەن شوێنەکە سەخی نەفسو خێرەدمەند بوو. دەستەیەك لە خاوەن فەزڵ و ئەدەب هاوڕێی بوون، هەریەکە وتەیەکی نەسەقی جوانی کرد، وەکوو شێوەی ئەدیبانە. دەروێش ڕێگەی چۆڵی بڕیوە، ماندووە هێشتا هیچی نەخواردووە. یەکێ لەو ناوەدا پێی‌وت: ئەبێ تۆیش شتێك بڵێیت. وتی: وەکو ئێوە فەزڵو زمان ڕەوانیم نییەو نەم خوێندووە. بە یەك شیعر لیم ڕازی ئەبن؟ هەموو بە ئارەزوو وتیان: بە ڵێ. وتی: (تاك).

منێکی برسی ڕوو لە خوانی نان وەك بێ ژن لە دەر حەمامی ژنان

یاران پێ‌کەنینو وتەکەیان پەسەند کرد، سفرەیان هێنایە بەردەمی، خاوەن زیافەت وتی: ئەی هاوڕێ کەمێ بوەستە لە ماڵەوە کفتە سوور ئەکەنەوە. دەروێش سەری هەڵبڕیو پێکەنیو وتی:

نذرش به وجودِ شرط لازم آمد. یکی را از بندگانِ خاص کیسه‌ای درم داد تا صرف کند بر زاهدان. گویند غلامی عاقلِ هشیار بود. همه روزه بگردید و شبانگه بازآمد و درم‌ها بوسه داد و پیشِ مَلِک بنهاد و گفت: زاهدان را چندان که طلب کردم نیافتم. گفت: این چه حکایت است؟ آن‌چه من دانم در این مُلک چهارصد زاهدست. گفت: ای خداوندِ جهان، آن که زاهدست نمی‌ستاند و آن که می‌ستاند زاهد نیست. مَلِک بخندید و ندیمان را گفت: چندان که مرا در حقِ خداپرستان ارادت است و اقرار، مر این شوخ دیده را عداوت است و انکار و حق به جانبِ اوست.

زاهد که درم گرفت و دینار　　　زاهدتر از او کسی به دست آر

## حکایت [۳۴]

یکی را از علمای راسخ پرسیدند که چه فرمایی در نانِ وقف؟ گفت: اگر نان از بهرِ جمعیّتِ خاطر می‌ستاند حلال است و اگر جمع از بهرِ نان می‌نشیند، حرام.

نان از برای کُنجِ عبادت گرفته‌اند　　　صاحب‌دلان، نه کُنجِ عبادت برای نان

## حکایت [۳۵]

درویشی به مَقامی درآمد که صاحبِ آن بُقعه مردی کریم النّفس بود و خردمند و طایفه‌ای اهلِ فضل و بلاغت در صحبتِ او بودند. هریک بذله و لطیفه‌ای، چنان که رسمِ ظریفان باشد، می‌گفتند. درویش راهِ بیابان کرده بود و مانده و چیزی نخورده. یکی ازان میان به طریقِ انبساط گفت: تو را هم چیزی باید گفت. گفت: مرا چون دیگران فضل و ادب نیست و چیزی نخوانده‌ام. به یک بیت از من قناعت کنید. هم‌گنان به رغبت گفتند: بگوی. گفت:

من گرسنه در برابرِ سفره‌ی نان　　　هم‌چون عَزَبم بر درِ حمّامِ زنان

یاران بخندیدند و ظرافتش بپسندیدند و سفره پیش آوردند. صاحبِ دعوت گفت: ای یار، زمانی توقّف کن که پرستارانم کوفته بریان می‌سازند. درویش سر برآورد و بخندید و گفت:

سفرەی مـن بـڵێ بـا کـفتەی نـەبێ　　　بۆ کفت نانی ڕووت لە جێی کفتەیە

## چیرۆك (٣٦)

دەروێشێ بە پیری خۆی وت: لەم خەڵکە لە ڕەنجام ئەوەندە زۆر دێنە زیارەتم بە هاتوچۆی ئەوان کاتم لێ تێك چووە. وتی: هەرچیان هەژارە قەرزی بدەرێ، ئەوەیان دەوڵەمەندە داوای شتی لێبکە. ئیتر بەدەوری تۆدا ناگەڕێن. (تاك):

گەدا پێشڕەو بێ بۆ سوپای ئیسلام　　　کافر لە تاو سواڵ ئەڕوا هەتا چین

## چیرۆك (٣٧)

فەقێیەك بە باوکی وت: ئەم وتارە ڕەنگاوڕەنگە کە زانایانی عیلمی کەلام ئەیلێن، کارم لێ ناکات، چونکە ئەبینم هیچ کردارێکی ڕێکی وتاریان نییە. (مەسنەوی):[(١)]

مەردومان فێرئەکەن بە تەرکی جیهان　　　زیوو ئاڵتوون بە بەرگ ئەکەن خۆیان

عـالمێ گـەر وتـاری ڕووتـەو بـەس　　　هەرچی وت وا وەری نەگرت لێی کەس

ئـەوکەسە عـالمە نـەبێ بـەدخوو　　　نەك بە خەڵکی بڵێ ئەوەی نەی بوو

خوا فەرموویە ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالبِرِّ وَ تَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ﴾ یانی: ئایا فەرمان ئەدەن بە خەڵك بە چاکەو خۆتان فەرامۆش ئەکەن؟.

ئـەو عـالمە وا کـە تـەن پـەروەرە　　　ئەو خۆی گومڕایە کەی ئەو ڕابەرە؟

باوکی وتی: ئەی کوڕم بە خەیاڵێکی ڕووتی بەتاڵ ڕوو وەرگێڕان لە پەروەردە کردنی ئامۆژگاری کەران نابێ، وە گومڕا وتن بە عالمانو سووڕانەوە بە دوای عالمانی بێ گوناها ئەبێ بە هۆی بێبەش بوون لە قازانجو کەڵکی عیلمو زانیاری، چەشنی کوێرێ شەوێ لە قورێ چەقیبوو ئەیوت: ئاخر ئەی موسڵمانان! چرایەك لە ڕێگاما دانێن. ژنێکی قسە خۆش بیستی، وتی: تۆ کە چرا نابینی بە چرا چی ئەبینی؟ هەروەها ئەنجومەنی وەعزو ئامۆژگاری وەك دووکانی بازرگان وایە، هەتا پارەیەك نەدەیت، کووتاڵێ وەرناگریت، لەوێیش هەتا ئارەزووت نەبێ سەرفەرازی وەرناگریت.

---

(١) بەسە باسی کەلامو عیلمی ئایین!　　　بناغەی دینو ئایین، قەت وەها نین
لە گوڵ بێژەو دەمی پڕپڕ لە خوێنی　　　لە لێوی ئەو ئەچۆڕێ دەرسی زانین،ـ«ك».

کوفته بر سفره‌ی من گو مباش　　　کوفته را نانِ تهی کوفته‌ست

## حکایت [۳۶]

مریدی گفت پیر را: چه کنم که از خلق به رنج اندرم از بسیاری که به زیارتم می‌آیند و اوقاتِ من از تردّدِ ایشان مشوّش می‌شود. گفت: هرچه درویشانند مر ایشان را وامی بده و آن‌چه توانگرانند از ایشان چیزی بخواه که دیگر گردِ تو نگردند.

گر گدا پیشروِ لشکرِ اسلام بوَد　　　کافر از بیمِ توقّع برود تا درِ چین

## حکایت [۳۷]

فقیهی پدر را گفت: هیچ از این سخنانِ رنگینِ دلاویزِ متکلّمان در من اثر نمی‌کند. سبب آن که نمی‌بینم از ایشان کرداری موافقِ گفتار.

ترکِ دنیا به مردم آموزند　　　خویشتن سیم و غلّه اندوزند
عالِمی را که گفت باشد و بس　　　هرچه گوید نگیرد اندر کس
عالِم آن کس بوَد که بد نکند　　　نه بگوید به خلق و خود نکند

أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِالْبِرِّ وَ تَنْسَونَ أَنْفُسَكُمْ؟

عالِم که کامرانی و تن پروری کند　　　او خویشتن گم است، که را رهبری کند؟

پدر گفت: ای پسر، به مجرّدِ این خیالِ باطل نشاید روی از تربیتِ ناصحان بگردانیدن و علما را به ضلالت منسوب کردن و در طلبِ عالِمِ معصوم از فواید علم محروم ماندن، هم‌چون نابینایی که شبی در وَحَل افتاده بود و می‌گفت: آخر، ای مسلمانان، چراغی فرا راهِ من دارید. زنی مازحه بشنید و گفت: تو که چراغ نبینی به چراغ چه بینی؟ هم‌چنین مجلسِ واعظ چون کلبه‌ی بزّازست؛ آن جا تا نقدی ندهی بِضاعتی نستانی و این جا تا ارادتی نیاوری سعادتی نبری.

وەعــزی عــالم بـە گـوێی دڵت ببیسە بــە وتــەی خــۆشــی بـا نـەکـا کـردار
خاڵی‌یە هەرچـی ئـەهلی لاف ئـەیڵێت نووستوو بە نووستووکەی ئەبێ بێدار
مــەردی پێویستە تـا لە گـوێی بگـرێ پـەندێ نـووسرابـێ بـا لە ڕووی دیـوار

## چیرۆکی هۆنراوە

خاوەن دڵێ لە خانەقا بـوو کـەچی ڕۆییە مـەدرەسە
وازی‌هـــێنـــا لە هــەمدەمیی خـاوەن تــەریقەتان
پـێم وت: چ فـەرقی عـابیدو عـالم هـەبوو کـەوا
لەم دوانــە چــویتە هــەمدەم‌و هــەمڕازی عـالمان
فــەرمووی یــەکـەم گـلیمی لە گـێژاو ئـەخاتە دەر
عـــالم لە کــۆششـایە کـە بگـرێ نـوقم بـووان

## چیرۆك (٣٨)

یـەکـێ لەسـەرڕێگـایە مـەست نـووستبوو، جـڵەوی ئیختیاری لە دەست ڕۆیـیبوو. خواپەرستێ بە لایا تێپەڕی، وە لە حاڵی ناشیرینی ڕوانی. جوان لە خەوی مەستی سەری هەڵبڕی‌و وتی: ﴿وَ اِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَاماً﴾ (یانی پیاوچاکان کـە بـە لای خـراپـی‌یا ئەڕۆن بە چاوپۆشی [وگەورەیی] تێ‌پەڕ ئەکەن).

اِذا رَأَيْتَ أَثِيماً كُنْ سَاتِراً وَ حَلِيماً يا مَنْ تُقَبِّحُ أَمْرِي لِمَ لاتَمُرُّ كَرِيماً؟

(واتە: کە گوناهبارت دی بە توانابە بیشارەوە، ئەی کەسێ کە ئیشم بە ناشیرین ئەزانی بۆچی بە چاوپۆشی بە لاما ناڕۆیت).

مــەپێچــە ڕوو لە تـاوانکـار عـابید! بە چاوی پڕ لە بـەخشایش نـەزەرکە
جەوانمەردیم نییە گەر من بـە کـردار بە سەرما وەك جەوانمەردان گوزەرکە

## چیرۆك (٣٩)

دەستەیەك لە بێ‌پەروایان بە مشت‌و مڕ بۆ دەروێشێ هاتنە دەر، وە وتاری ناشایستەیان پێ‌وتو لێ‌یاندا و ڕەنجاندیان. لە بێ‌تەوانایيا شکاتی بردە لای پیری تەریقەت کە حاڵێکی

گفتِ عالِم به گوشِ جان بشنو | ور نماند به گفتنش کردار
باطل است آن چه مدّعی گوید: | خفته را خفته کی کند بیدار؟
مرد باید که گیرد اندر گوش | ور نبشته‌ست پند بر دیوار

***

صاحب‌دلی به مدرسه آمد ز خانقاه
بشکست عهدِ صحبتِ اهلِ طریق را
گفتم: میانِ عالِم و عابد چه فرق بود
تا اختیار کردی ازان این فریق را؟
گفت: آن گِلیم خویش به در می‌بَرَد ز موج
وین جهد می‌کند که بگیرد غریق را

## حکایت [۳۸]

یکی بر سرِ راهی مست خفته بود و زمامِ اختیار از دست رفته. عابدی بر وی گذر کرد و در آن حالتِ مُستَقبَحِ او نظر کرد. مست سر برآورد و گفت: وَ إِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِراماً.

إِذَا رَأَيْتَ أَثيماً كُنْ ساتِراً وَ حَليماً | يا مَنْ تُقَبِّحُ أَمْرى لِمَ لا تَمُرُّ كَريماً؟

***

متاب، ای پارسا، روی از گنهکار | به بخشایندگی در وی نظر کن
اگر من ناجوان‌مردم به کردار | تو بر من چون جوان‌مردان گذر کن

## حکایت [۳۹]

طایفه‌ی رندان به انکارِ درویشی به در آمدند و سخنانِ ناسزا گفتند و بزدند و برنجانیدند. شکایت از بی‌طاقتی پیشِ پیرِ طریقت بُرد که چنین حالی رفت. گفت: ای

وام بەسەر هات. وتی: ئەی کوڕم! خەرقەی دەروێشان کراسی ڕەزایە. هەرکەسێ لەم بەرگەدا باری بێهیوای هەڵ نەگرت بە گەزافە، نەوەك دەروێشە، وە خەرقەی لەسەرقەدەغەیە. (٣ تاك):

١: دەلیای فراوان بە بەرد نابێ لێڵ — عارف بڕەنجێ هێشتا تەنکاوە
٢: ئازار تووش ئەبی بە توانا بە — بە عەفو ئەبی پاك گەر گوناهبار بی
٣: ئەی برادەر کە پاشە ڕۆژ خاکە — خۆت بە خاك کە هەتا نەبویتە خاك

## چیرۆکی هۆنراوە (٤٠)

ئایا بیستوتە لە شاری بەغدا
لە ئاڵاو پەردە هەرایەك ڕووی دا
ئاڵا بە ڕەنجی ڕێ تۆزو گەردە
لە ڕووی گلەیی وتی بە پەردە
بچووکی گەورەین وەك یەك هەردوکمان
کۆیلەی بارەگاین لە بۆ یەك سوڵتان
دەمێ لە خزمەت من نیمە سرەوت
وام لە سەفەرا بە وەختو بێ وەخت
نە ڕەنج ئەکێشیو نە بۆسە[1]و حەسار
نەبیابانو نە تۆزو غوبار
بۆ کۆشش زۆرتر من ئەنێم هەنگاو
تۆ بۆچ حورمەتت زۆرترە لەناو
هاودەمی لەگەڵ غولامی مەهڕوو
لەگەڵ کەنیزی یاسەمین گیسوو
من کەوتوومەتە دەستی شاگردان
پێبەندی سەفەر بووم سەرگەردان

---

(١) بۆسە: سیپە، ڕەبەت، کەمین، حەشار. «بڕوانە هەنبانە بۆرینە، فەرهەنگی خاڵ».ـع.

فرزند، خرقه‌ی درویشان جامه‌ی رضاست هرکه در این جامه تحمّلِ بی‌مرادی نکند مدّعی است و خرقه بَرْ وی حرام است.

دریای فراوان نشود تیره به سنگ　　عارف که برنجد تُنُک آب است هنوز

***

گر گزندت رسد تحمّل کن　　که به عفو از گناه پاک شوی
ای برادر چو عاقبت خاک است　　خاک شو، پیش ازان که خاک شوی

## حکایت [۴۰]

این حکایت شنو که در بغداد　　رایت و پرده را خلاف افتاد
رایت از گردِ راه و رنجِ رکاب　　گفت با پرده از طریقِ عتاب:
من و تو هردو خواجه‌تاشانیم　　بنده‌ی بارگاهِ سلطانیم
من ز خدمت دمی نیاسودم　　گاه و بی‌گاه در سفر بودم
تو نه رنج آزموده‌ای نه حصار　　نه بیابان و باد و گرد و غبار
قدمِ من به سعی پیشترست　　پس چرا عزّتِ تو بیشترست؟
تو برِ بندگانِ مه‌رویی　　با کنیزانِ یاسمن بویی

وتـــــی: مـــــن ســـــەرم لە ئـــاستانە

نـــــەك وەك تـــۆ ســـەرم لە ئـــاسمانە

هـــەركەس بـێهـوودە بـڵنـد كـا گـەردن

خـــۆی بـــەسەر مـــلا ئـەخا بـۆ مـردن

لە پـــــێ كـــەوتووە ســـەعدی ئـــازادە

كـــەس بـۆ شـەڕ نـابێ بـۆ ئـەو ئـامادە

## چیرۆك (٤١)

یەكێ لە خاوەن دڵان بە هێزو بازوویەكی چاو پێ كەوت، هاتبوەیەك دەستی خستبوە ناو دەمی. وتی: ئەمە چ حاڵێكە؟ ویتان: فڵان جنێوی پێ داوە. وتی: ئەم بێ مایەیە هەزار مەن بەردی پێ هەڵئەگیرێ، كەچی توانای وتەیەكی نییە. (چواری):

لافـی سـەرپەنجەو مـەردی بـخە لا، لادە گـەزاف

پیاوو ژن وەك یەكە گەر دیلی نەفس بیتو پەست

دەسەڵاتت هەیە، وا چاكـە دەمـێ شـیرین كـەیت

ئەوە مەردی نییە بیدەی لە دەمی پیاوێ مەست[١]

(پارچە):

ئەگەر ببیێ دەمو چـاوێ وەكـوو فـیل[٢]     نەبۆتە مـەرد بـە بـێ مـەردییو ئیحسان

بـەڵێ ئـادەم سـروشتی ئـەو لە خـاكـە     ئەگەر خاكـی نـەبێ كـەی بۆتـە ئینسان

## چیرۆك (٤٢)

ڕای گەورەیەكم پرسی لە ڕەوشتی دۆستانی ڕاستی.[٣] وتی: كەمترین شت ئەوەیە كە

---

(١) فرمێسكە ورێژنـە لە چـاوی ئـاسمان     بـــا ئـــەرزی هـــەزار نـــەمرێ لە تـــینوان
ئـــەم ئـــاژین ئـــەكـا، لە زەوی ئـاوی     ئەو بە گەردەلوول كوێر ئەكا چاوی،ـ«ك».

(٢) ئەگەر ببڕێ سەرو لووتی هەزار فیل... بەمچۆرە لە شیعرەكەی شێخی سەعدییەوە نزیكترە؛ یانی: ئەگەر ئەوەندە بەهێز بێ كە سەری هەزار فیل ببڕێت... فارسییەكەی: «اگر خود بردرد پیشانی فیل»،ـع.

(٣) اخوان الصفا. «ع.م»، (لە نوسخەكاندا نووسراوە: «اخوانِ صفا» و مەبەست سۆفیەكانە نە كۆمەڵی «اخوان الصفا»)،ـع.

من فتاده به دستِ شاگردان — به سفر پای‌بند و سرگردان
گفت: من سر بر آستان دارم — نه چو تو سر بر آسمان دارم
هرکه بیهوده گردن افرازد — خویشتن را به گردن اندازد

## حکایت [۴۱]

یکی از صاحب‌دلان زورآزمایی را دید به‌هم برآمده و در خشم شده و کف بر دماغ آورده. گفت: این را چه شده است؟ گفتند: فلان دشنامش داد. گفت: این فرومایه هزار من سنگ برمی‌دارد و طاقتِ سخنی نمی‌آرد!

لافِ سرپنجگی و دعویِ مردی بگذار — عاجزِ نفسِ فرومایه، چه مردی، چه زنی
گرت از دست برآید، دهنی شیرین کن — مردی آن نیست که مشتی بزنی بر دهنی

***

اگر خود بردَرَد پیشانیِ پیل — نه مردست آن که در وی مردمی نیست
بنی‌آدم سرشت از خاک دارند — اگر خاکی نباشد، آدمی نیست

## حکایت [۴۲]

بزرگی را پرسیدم از سیرتِ اِخْوانِ صفا. گفت: کمینه آن که مرادِ خاطرِ یاران بر مصالحِ

ئارەزووی یاران ئەخەنە پێش ئارەزووی خۆیان. حەکیمان وتوویانە برادەر کە خەریکی خۆی بوو نە برادەرەو نە خوێش. (٢ تاك):

١: هاوڕێت پەلەی کرد هاوڕێی تۆ نییە     دڵ مەدە کەسێ دڵبەستت نییە

* * *

٢: بۆ خۆی کە نەیبوو تەقواو دیانەت[١]

ڕەحمی ببڕەو نەتبێ مەحببەت

دێتە یادم بەگەزافی خراپەی لەم شیعرە گرتبوو، وە وتبوی خوا لە قورئانا فەرمانی داوە بە پەیوەند ڕەحم نەوەك بە بڕینی، وە فەرمانی داوە بە خۆشەویستیی خزمان. ئەمەی تۆ وتوتە نارێکی ئەوەیە. وتم: ﴿وَ اِنْ جَاهَدَاكَ عَلَىٰ اَنْ تُشْرِكَ بِمَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا﴾ (واتە: ئەگەر دایك و باوکت کۆششیان لەگەڵ کردی بۆ ئەوە بڕیاری شەریکی من بدەیت بەقسەیان مەکە). (تاك):

هەزار خوێش کە بێگانە بێ لەگەڵ یەزدان     فیدای یەك کەسی بێگانە ئاشنابێ بەو

## چیرۆکی هۆنراوە (٤٣)

جوان ڕەوشت پیرێ لە شاری بەغدا     کچۆڵەیێکی بە پینەچی دا

پیاوێکی[٢] دڵڕەق گەزی لێوی کچ     هاتە خوارێ خوێن لە لێوو لە لچ

باوکی بەیان دی کچی کەساسی     هاتە لای زاوای لە زاوای پرسی

ئەی کەمتر ئینسان کەی ئەمە دانە     کچ لێوی هەیە یا خۆ هەمانە؟

لە ڕووی گاڵتەوە نالێم ئەم واتە     بە ڕاستی ئەیڵێم ڕاستیم ئاواتە

کەسێ لە سروشت کە بوو ناپەسەن     لە دەستی نادا هەتاکوو مردن[٣]

## چیرۆك (٤٤)

ئەگێرنەوە مەلایەك کچێکی بەو پەڕی ناشیرینییەوە هەبوو، گەیشتبوە تەمەنی ژنان لەگەڵ ئەوە جیازیو بەخشایشی زۆری هەبوو کەس ئارەزووی لە مارەکردنی نەبوو.

---

(١) خوێشت کە نەیبوو تەقواو دیانەت...، بەمجۆرە لە دقەوە نزیکترە،ـع.

(٢) پینەچی دڵرەق... چاکترە،ـع.

(٣) گۆڕانی سرشت عەقڵ نایبڕێ     هەرچی لە مشك بێ، جەواڵ ئەدڕێ،ـ«ك».

خویش مقدم دارد و حکما گفته‌اند: برادر که در بندِ خویش است نه برادر و نه خویش است.

همراه اگر شتاب کند هم رهِ تو نیست　　دل در کسی مبند که دل بسته‌ی تو نیست

***

چون نبوَد خویش را دیانت و تقوی　　قطع رَحِم بهتر از مودّتِ قُربیٰ

یاد دارم که یکی مدّعی در این بیت بر قولِ من اعتراض کرد و گفت: حق تَعالیٰ در کتابِ مجید از قطعِ رَحِم نهی کرده است و به مودّتِ ذی اَلْقُرْبیٰ فرموده، و آن‌چه تو گفتی مُناقِضِ آن است. گفتم: غلط کردی که موافقِ قرآن است: وَ إِنْ جاهَداكَ عَلَىٰ أَنْ تُشْرِكَ بی ما لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلاَ تُطِعْهُما.

هزار خویش که بیگانه از خدا باشد　　فدای یک تن بیگانه کآشنا باشد

## حکایت [۴۳]

پیرمردی لطیف در بغداد　　دخترک را به کفشدوزی داد
مردکِ سنگدل چنان بگزید　　لبِ دختر که خون از او بچکید
بامدادان پدر چنان دیدش　　پیشِ داماد رفت و پرسیدش
کای فرومایه، این چه دندان است؟　　چند خایی لبش؟ نه انبان است
به مزاحت نگفتم این گفتار　　هزل بگذار و جِدّ از او بردار
خوی بد در طبیعتی که نشست　　ندهد جز به وقتِ مرگ از دست

## حکایت [۴۴]

آورده‌اند که فقیهی دختری داشت به غایت زشت‌روی، به جای زنان رسیده و با وجودِ جهاز و نعمت کسی به مناکحتِ او رغبت نمی‌نمود.

(تاك):

چەند ناشیرینە ئاوریشمی نەخشین بکـرێتـە بەری بووكی ناشیرین

بە ناچاری لەگەڵ کوێرێکا مارەیان بەست. لەوکاتەدا حەکیمێ لە سەرەندیبەوە هاتبوو چاوی نابینای ڕووناك ئەکردەوە. بە مەلایان وت: زاواکەت کوڕتە بۆچی چاوی چاك ناکەیتەوە؟ وتی: ئەترسم چاوی چاك بێتەوە کچەکەم تەڵاق بدا. بۆ ناشیرین ڕوو مێردی کوێر باشە.

## چیرۆك (٤٥)

پادشایەك بە چاوی سووك تەماشای تیرەی دەروێشانی ئەکرد. یەکێ لەو ناوە دا تێ گەیی، وتی: ئەی پادشا ئێمە لەم جیهانەدا بە ڕابواردن لە تۆ خۆشتر ڕائەبوێرین وە بە سوپا لە تۆ کەمترین، وە لە مردنا یەکسانین وە لە دوا ڕۆژا خوابیەوێت لە تۆ چاکترین.

ئەگەر خاوەندەی شاران، کامەرانی وەگەر دەروێشی هەر پێویست نانی

ئەگەر ئەم یاخۆ ئەو لەو کاتەدا مرد لەگەڵ خۆیا بە تەنیا کفنێکی برد

کە لەم موڵکە ئەکەی تۆ کۆچی دوایی گەدایی چاکترە نەك پادشایی

نیشانەی ڕێگای دەروێشی کراسی کۆنەو مووی گڤن، وە ڕاستی ئەو [ڕێگایە] دڵی زیندووەو نەفسی مردووە.

نەوەك لە ڕێی گەزافەوە قاپی لە مەردومان بگریت

کەسێ بە پێچەوانەی جووڵا، شەڕێ بکا بێ باك

ئەگەر لە شاخێ خزا ڕوو بە خوارەوە بەردێ

کەسێ کە هەڵسێ لە بەریا نەبۆتە عارفی چاك[1]

ڕەوشتی تەرێقەتی دەروێشان سوپاس و ناوی خوایەو، خزمەت و هەرچی سوودی خەڵکە پێشی ئەخەن لە سوودی خۆیان و دڵنیایی بە کەم و خوا بە یەك ناسین. هەر کەسێ ڕێکی ئەم بەیاناتە بوو بە ڕاستی دەروێشە، با کەوای جوانیشی لە بەرابێت، بەڵام هەرزە

---

(١) مەبەستی ئەوەیە پیاوی عارف لە ئاستی کەندو کۆسپی ژیانا وەکوو قارەمانێکی نەبەزو نەترس ڕائەوەستێ. «ك»

زشت باشد دبیقی و دیبا — که بوَد بر عروسِ نازیبا

فی الجمله، به حکمِ ضرورت با ضریری عقدِ نکاحش بستند. آورده‌اند که حکیمی در آن تاریخ از سرندیب آمده بود که دیده‌ی نابینا روشن همی کرد. فقیه را گفتند: چرا داماد را معالجت نکنی تا بینا شود؟ گفت: ترسم بینا شود و دخترم را طلاق دهد؛ شوی زنِ زشت‌روی نابینا بِهْ.

## حکایت [۴۵]

پادشاهی به چشمِ حقارت در طایفه‌ی درویشان نظر کرد. یکی ازان میان به فراست دریافت و گفت: ای مَلِک، ما در این دنیا به جیش از تو کمتریم و به عیش خوش‌تر و به مرگ برابر و در قیامت بهتر، اِنْشاءَالله.

اگر کشورخدای کامران است — و گر درویشِ حاجتمندِ نان است
در آن ساعت که خواهند این و آن مُرد — نخواهند از جهان بیش از کفن بُرد
چو رخت از مملکت بربست خواهی — گدایی بهترست از پادشاهی

ظاهرِ حالِ درویشان جامه‌ی ژنده است و مویِ سترده و حقیقتِ آن دلِ زنده و نَفْسِ مُرده.

نه آن که بر درِ دعوی نشیند از خلقی — وگر خلاف کنندش، به جنگ برخیزد
اگر ز کوه فرو غلطد آسیا سنگی — نه عارف است که از راهِ سنگ برخیزد

طریقِ درویشان ذِکرست و شکر و خدمت و طاعت و ایثار و قناعت و توحید و توکّل و تسلیم و تحمّل. هرکه بدین صفت‌ها موصوف است به حقیقت درویش است اگرچه در

وتارو نوێژ نەکەر، هەوا پەرستو هەوەس باز ڕۆژ بەرێتەسەر، وە پەیوەندی بە شەهوەتی نەفسە وە ڕۆژکاتەوە بە خەوی بێهۆشی، وە هەرچی هاتە ناو بیخوا، وە هەرچی هاتە سەرزمان بیڵێ، ئەوە بێ باکەو بێ ئابڕوو با عەبایشی لەبەرابێ. (پارچە):

ئەی دەروونت ڕووت، لە دینو تەقوا لە دەر لەبەرتا کراسی ڕیا
پەردەی حەوت ڕەنگی مەخە بەر دەرگا کە لە ناو خانوو هەتە بوریا[1]

«كَمْ مِنْ مُؤْمِنٍ فِي قَبَاءٍ وَ كَمْ مِنْ كافِرٍ في عَبَاءٍ» (یانی: زۆر موسوڵمان هەیە کەوای جوانی لەبەرایە کە شێوەی جیهانییە، وە زۆر کافر عەبای لەبەرە کە شێوەی دەروێشانەیە).

## چیرۆکی هۆنراوە (٤٦)

گوڵی تازەم دی چەندێ بە دەستە
لەسەر گومەزی بە گیاوە بەستە
وتم: چۆن ئەبێ گیایەکی ناچیز
دانیشێ لەسەر گوڵا لەیەك ڕیز
گیا گریا وتی: بێ دەنگ بە خامۆش
هاوڕێ بەخششی ناکا فەرامۆش
گەرچی جەماڵو ڕەنگو بۆم نییە
گیای باغی ئەوم جیاوازی نییە
گەر بێ هونەرم وە یا هونەرمەند
هیوام بە لوتفی تۆیە خووەوەند
ئەگەرچی نیمە لە دەس دەسمایە
کە گەردەن کەچی زاتی خودایە
چاری کاری عەبد هەر ئەو ئەزانێ
کە دەسی بڕا لە هەر کەسانێ

(١) بوریا: لە باتیی حەسیرە.

قباست، امّا هرزه‌گردی بی‌نماز، هواپرست، هوسباز که روزها به شب آرد در بندِ شهوت و شب‌ها روز کند در خوابِ غفلت و بخورد هرچه در میان آید و بگوید هرچه بر زبان آید، رندست اگرچه در عباست.

ای درونت برهنه از تقویٰ — کز برون جامه‌ی ریا داری
پرده‌ی هفت رنگ در مگذار — تو که در خانه بوریا داری

## حکایت [۴۶]

دیدم گُلِ تازه چند دسته — بر گنبدی از گیاه بسته
گفتم: چه بوَد گیاهِ ناچیز — تا در صفِ گل نشیند او نیز؟
بگریست گیاه و گفت: خاموش — صحبت نکند کَرَم فراموش
گر نیست جمال و رنگ و بویم — آخر نه گیاهِ باغِ اویم
من بنده‌ی حضرتِ کریمم — پرورده‌ی نعمتِ قدیمم
گر بی‌هنرم و گر هنرمند — لطف است امیدم از خداوند
با آن که بِضاعتی ندارم — سرمایه‌ی طاعتی ندارم،
او چاره‌ی کارِ بنده داند — چون هیچ وسیلتش نماند

ڕەوشتو شێوەی خاوەن کۆیلەکان
کە ئازاد ئەکەن کۆیلە پیرەکان
ئەی خاوەن گیتی بەم جوانیو نەخشە
دە تۆیش (سەفوەتی) پیرت ببخەشە
(سەعدی) ڕێی کەعبەی ڕەزا بگرە بەر
ئەی مەردی خودا بگرە ڕێی داوەر
بەدبەختە کەسێ کە ئەبێ سەرکەش
ئەم دەرکە نەبێ نییە قاپی کەش

## چیرۆك (٤٧)

لە حەکیمێکیان پرسی: ئازایی باشترە یا بەخشایش؟ وتی: کەسێ بەخشایشی ببێ پێویستی بە ئازایی نییە.

(چواری):

نەماوە حاتەمی تایی، وەلێ هەتا دواکات
ئەمێنێ ناوی بڵندی بە چاکە، چۆن ئەمرێ؟
زەکاتی ماڵت بکە دەر لقی زیادەی ڕەز
کە باخەوان بڕی زۆرترینترێ ئەگرێ

(تاك):

عالەمێکیان گرت بە مەردیو بە زۆر — لەگەڵ خۆمانا نەمانبردە گۆڕ

(تاك):

لە کێلی گۆڕی بارامەکەی گۆڕ — نووسرابوو بەخشش چاترە لە زۆر

| | |
|---|---|
| رسم است که مالکانِ تحریر | آزاد کنند بندهٔ پیر |
| ای بار خدایِ عالم آرای | بر بندهٔ پیرِ خود ببخشای |
| سعدی رهِ کعبهٔ رضا گیر | ای مردِ خدا، رهِ خدا گیر |
| بدبخت کسی که سر بتابد | زین در، که دری دگر نیابد |

## حکایت [۴۷]

حکیمی را پرسیدند که از سخاوت و شجاعت کدام بهترست؟ گفت: آن که را سخاوت است به شجاعت حاجت نیست.

| | |
|---|---|
| نماند حاتمِ طایی ولیک تا به ابد | بماند نامِ بلندش به نیکویی مشهور |
| زکاتِ مال به در کن که فضلهٔ رز را | چو باغبان بزند بیشتر دهد انگور |

***

| | |
|---|---|
| نِبِشته‌ست بر گورِ بهرامِ گور | که دستِ کَرَم بِهْ که بازوی زور |

## بەندی سێیەم:

# گەورەیی قەناعەتو دڵنیایی

### چیرۆك (١)

سواڵکەرێکی ڕۆژئاوایی (مەغریبی) لە گوزەری بازرگانەکانی حەلەبا ئەیوت: ئەی خاوەن سامانەکان ئەگەر ئێوە بە بەخشایش بوونایەو، ئێمە بە قەناعەت، شێوەی سواڵکردن لە جیهانا هەڵئەسا. (پارچە):

| | |
|---|---|
| ئەی قەناعەت دە دەوڵەمەندم کە | تۆ نەبی خۆ نییە ئیتر سامان |
| گەنجی سەبر ئیختیاری لوقمانە | ئەوەی بێ سەبرە لای نییە عیرفان |

### چیرۆك (٢)

دوو ئەمیرزادە لە میسرا یەکێکیان زانست فێرئەبوو، ئەویتریان سامانی پێکەوە ئەنا. دواکار ئەو بوو بە عەللامەو، ئەم بوو بە عەزیزی میسر. پاشان دەوڵەمەند بە چاوی سووك تەماشای زانای ئەکرد. وتی: من واگەیشتمە سەڵتەنەت، تۆ هەروا لە بێنەواییدا مایتەوە. وتی: ئەی برام سوپاسی بەخشایشی خوای گەورە لەسەر من زۆرترە کە میراتی پێغەمبەرانم دەس کەوتووە یەعنی زانیاری، وە تۆ میراتی فیرعەونو هامانت بۆ ماوەتەوە یەعنی وڵاتی میسر. (مەسنەوی):

باب سوم:

# در فضیلت قناعت

## حکایت [۱]

خواهنده‌ی مغربی در صفِ بزّازانِ حلب می‌گفت: ای خداوندانِ نعمت، اگر شما را انصاف بودی و ما را قناعت، رسمِ سؤال از جهان برخاستی.

ای قناعت، توانگرم گردان | که ورای تو هیچ نعمت نیست
کُنجِ صبر اختیارِ لقمان است | هرکه را صبر نیست حکمت نیست

## حکایت [۲]

دو امیرزاده در مصر بودند: یکی علم آموختی و آن دیگر مال اندوخت. عاقبة الامر این یکی علامه‌ی عصر گشت و آن دیگر عزیز مصر شد. باری توانگر به چشمِ حقارت در درویشِ فقیه نظر کرد و گفت: من به سلطنت رسیدم و این هم‌چنان در مسکنت بمانده است. گفت: ای برادر، شکرِ نعمتِ باری، عزَّاسْمُهُ، مرا بیش می‌باید کرد که میراثِ پیغمبران یافتم یعنی علم، و تو میراثِ فرعون و هامان یعنی ملک مصر.

مـن ئـەو مـێرووەم پێم لێ ئـەماڵن — نـەك زەردەواڵەم کـە لێم بـناڵن
چـۆنم بـۆ بکـرێ سـوپاس گـوزاری — کـە نـیمە تـوانـای مـەردوم ئـازاری

## چیرۆك (٣)

بیستم دەروێشێ ئاگری هەژاری ئەی سووتاندو، غەرقەی لەسەر غەرقە پینە ئەکرد، بۆ سروەتی دڵی خۆی ئەیوت: (تاك).

به نانی وشکی خـۆم ڕازیـمو پـینە پـینەیی غـەرقە
به ڕەنجو سەغڵەتی خۆم، چاتری شانازیی خەڵقه[1]

کەسێ پێیوت: بۆچ دانیشتووی کە فڵان، تەبیعەتێکی بە بـەخشایش‌و کـەرەمێکـی گشتیی هەیە. پشتێنی خزمەتی ئازادانی بەستووە، وە لە دەرقاپیی داڵان دانیشتووە. ئەگەر بە شێوەی حاڵی تۆ وەکوو هەیە بزانێ بە شانازییەوە ئاگاداری دڵی دۆستان ئەکا، وە بە هەڵی ئەزانی. وتی: بێدەنگ‌بە لە سەغڵەتی‌و هەژاری‌یا مردن چاکترە لە پێویست بۆ لای کەسێ بردن. (پارچە):

لەکـونجی سـەبرا پـینەکـەی کـراس — نەك لای گەورە بیت بۆ کراس کەساس
بـەرامـبەر سـزای دۆزەخ وەهـایە — لە بـەهەشت بچیە بـەرپێی هـەمسایە

## چیرۆك (٤)

یەکێ لە پادشایانی عەجەم پزیشکێکی بـاشی نـاردە خـزمەتی «محمد المصطفیٰ» ـسەلامی خوای لێبێ ـ چەند ساڵێ لە ناو عەرەبا بوو کەسێ بە تاقی کردنەوەیەك نەهاتە لای، و داوای چارێکی لێنەکرد. هاتە خزمەت پێغەمبەر ـسەلامی خوای لێبێ ـ گلەیی کرد کە ئەم بەندەیەیان بۆ دەرمان کردنی یارانی تۆ ناردووە، لەم کاتە درێژەدا کەسێ ڕووی تێنەکردم، هەتا خزمەتێ بەجێ بهێنم کە بۆم دیاری کراوە. پێغـەمبەر ـسـەلامی خـوای لێبێ ـ فەرمووی ئەمانە تیرەیەکن هەتا ئارەزوویان بە سەرا زاڵ نەبێ، ناخۆن. وە هێشتا ئارەزوویان ئەمێنێ دەست هەڵئەگرن. پزیشك وتی: ئەمەتە هۆی لەش ساغی‌یان. زەمینی [خزمەتی] ماچ کردو ڕۆیشت. (مەسنەوی):

---

(١) قـەزای نـانێ ڕەق کـەرەکـێفـاوی — وەك بـەردە ڕێژە سـووتابێ چـاوی
لە هـەزار گـۆشت‌و پـڵاوێ کـەوێ — کە، سەر لە ئاستی، کە سەر ئەخەوێ»ـ «ك».

من آن مورم کـه در پـایم بـمالند　　نـه زنـبورم کـه از دسـتم بـنالند
کجا خود شکرِ این نـعمت گـزارم　　کـــه زورِ مـــردم‌آزاری نـــدارم؟

## حکایت [۳]

درویشی را شنیدم که در آتشِ فاقه می‌سوخت و خرقه بر خرقه می‌دوخت و تسکینِ خاطرِ خود به این بیت می‌کرد:

به نان خشک قناعت کـنیم و جـامه‌ی دلق
که بارِ محنتِ خود بهْ کـه بـار مـنتِ خـلق

کسی گفتش: چه نشینی که فلان در این شهر طبعی کریم دارد و کرمی عمیم، میان به خدمتِ آزادگان بسته است و بر درِ دل‌ها نشسته، اگر بر صورت حالِ تو که هست مطلع گردد پاسِ خاطر عزیزان داشـتن مـنت دارد و غـنیمت شـمارد گـفت: خـاموش کـه بـه گرسنگی مردن بِهْ که حاجت به کسی بردن.

هم رُقعه دوختن بـهْ و الزام کـنج صـبر　　کز بهرِ جامه رُقعه برِ خواجه‌گان نبشت
حقا که بـا عـقوبتِ دوزخ بـرابـر است　　رفتن به پای‌مردیِ هـمسایه در بـهشت

## حکایت [۴]

یکی از ملوک عجم طبیبی حاذق به خدمت مصطفیٰﷺ فرستاد. سالی در دیار عرب بود، کسی تجرتی پیش وی نبرد و معالجی از وی در نخواست. پیش پیغامبرﷺ رفت و شکایت کرد که مرا برای معالجت اصحاب فرستاده‌اند و کسی در این مدت التفاتی تـا خدمتی که بر بنده معین است به‌جای آورد. خواجهﷺ فرمود: ایـن طـایفه را طـریقتی است که تا اشتها غالب نباشند نخورند و هنوز اشتها باقی باشد که دست از طعام بدارند. حکیم گفت: موجب تندرستی این است. زمین خدمت ببوسید و برفت.

کـــاتێ دانــا زمــانی ئــەخاتە وتــن | یا خۆ پـەنجە ئـەخاتە سـەر خـواردن
نــە وتــن بــۆی بــبێتــە عـارو زیـان | وە نــە خـواردن زیـانی بـێ بـۆ گـیان
بێگومان جا وتاری حیکمەت ئـەبێ | وەك خۆراکی بە هۆی سیحەت ئەبێ

## چیرۆك (٥)

لە ڕەوشتی ئەردەشیری بابەکان وتراوە کە لە پزیشکێ عەرەبی پرسی: ڕۆژی چەند ئەبێ خۆراك بخورێ؟ وتی: سەد درەم بەسە. وتی: جا ئەم ئەندازەیە چ هێزێ ئـەدات؟ وتی: ئەوەندە هەڵت ئەگرێ، ئەگەر لەوە زیاتر بوو، تۆ هەڵگری ئەویت. (تاك):

خواردن لە بۆ ژیان لە بـۆ زیکـر کـردنە | تۆ باوەڕت وەهایە ژیان ئیشی خواردنە

## چیرۆك (٦)

دوو دەروێشی خوراسانی پێکەوە سەفەریان کرد، یەکێکـیان لاواز بـوو بـە دوو ڕۆژ جارێ خواردنی ئەخوارد، ئەوی‌تر بە هێز بوو ڕۆژێ سێ جاری ئەخوارد. وا ڕێکەوت لە قاپی شارێك بوختانی جاسووسی‌یان پێ‌کردن، هەردووکیان لە خانوویەکـا بـەند کـردو قاپی‌یان بە قوڕ لەسەر بەستن. لە دوای دوو حەفتە دەرکەوت کـە بـێ تـاوانـن، قـاپی‌یان لێ‌کردنەوە بەهێزەکە مردبوو، لاوازەکە گیانی بە سەلامەتی ڕزگـار کـردبوو. مـەردومان کەوتنە سەرسامی. حەکیمێ وتی: پێچەوانەی ئەم حاڵە بوایە سەرسامی ئەدا ئەوەیان زۆر خۆر بوو توانای بێ‌نەوایی نەبوو فەوتاو مرد، ئەمەیان کەم خۆر بوو لەسەر شێوەی خۆی توانای کرد، بێ‌گومان بە سەلامەتی ڕزگاربوو. (پارچە):

کـەسێ کـەم خـواردنـی کـردە سـروشتی
کـە سـەختی هـاتەبەر، ئـاسانی ئـەگـرێ
لە کـــاتی شـــێنـــەیی تـەن پـەروەری کـا
کە تەنگی دی، ئەوەند لای سەختە ئەمرێ[1]

---

(١) کەسێ نـۆکـەری زکـو نـەوسی بـێ | هـەر یـەکـە بـۆ خـۆی بـاری لێ ئـەنێ
پـیاوی خـۆ فـرۆش کـەری زکـە ڕۆ | چل مەن بار ئەبا بە لەوێچی جۆ،-«ك».

سخن آن‌گه کند حکیم آغاز   یا سرانگشت سوی لقمه دراز
که ز ناگفتنش خلل زاید   یا ز ناخوردنش به‌جان آید
لاجَرَم حکمتش بوَد گفتار   خوردنش تندرستی آرد بار

## حکایت [۵]

در سیرت اردشیر بابکان آمده است که حکیمی عرب را پرسید که روزی چه مایه طعام مصلحت است خوردن؟ گفت: صد درم سنگ کفایت کند. گفت: این قدر چه قوت دهد؟ گفت: **هٰذا الْمِقْدارُ یَحْمِلُكَ وَ ما زادَ عَلیٰ ذٰلِكَ فَاَنْتَ حامِلُهُ**، یعنی: این قدر تو را بر پای همی دارد و هرچه بر این زیادت کنی تو حمّالِ آنی.

خوردن برای زیستن و ذکر کردن است
تو معتقد که زیستن از بهر خوردن است

## حکایت [۶]

دو درویش خراسانی ملازمِ صحبت یکدیگر سیاحت کردندی. یکی ضعیف بود هر به دو شب اندک طعام افطار کردی، و آن دیگر قوی که هر روز سه بار خوردی. قضا را بر درِ شهری به تهمت جاسوسی گرفتار آمدند. هردو را به خانه‌ای کردند و در به گِل برآوردند. بعد از دو هفته که معلوم شد بی‌گناهند در باز گشادند، قوی را دیدند مرده و ضعیف جان به سلامت برده. در این تعجب کردند. حکیمی گفت: به خلاف این عجیب بود این یکی بسیار خوار بوده است و طاقتِ بینوایی نیاورد و به سختی هلاک شد و آن دیگر خویشتن‌دار بود لاجَرَم بر عادت خویش صبر کرد و به سلامت بماند.

چو کم خوردن طبیعت شد کسی را   چو سختی پیشش آید سهل گیرد
و گر تن‌پروست اندر فراخی   چو تنگی بیند، از سختی بمیرد

## چیرۆك (٧)

یەکێ لە حەکیمان ئامۆژگاری کوڕێکی کرد بۆ کەم خواردن کە تێری پیاو نەخۆش ئەخات، وتی: ئەی بابە برسییەتی خەڵك ئەکوژێ، نەت بیستووە خۆش وتاران وتوویانە لە تێری مردن چاکترە لە برسییەتی کێشان؟ وتی: ئەو ئەندازە ئاگاداری بکە ﴿کُلُوا وَاشْرَبُوا وَ لا تُسْرفوا﴾[1] بخۆن‌و بخۆنەوەو لە ئەندازەی دەرمەکەن. (تاك):

نە هێندە بخۆ لە دەمت سەرکا  نە ئەوەندەبێ گیانت بە دەرکا

* * *

خـۆراك ئـەگـەرچـی بـەشە بـۆ نـەفس، بـەڵام زۆری

ئـەبێتــە ڕەنـج‌و ســەغڵەتـی زیــاتر بــبێ لە قـەدەر

چ خـۆشـە گـوڵ بـە شـەکـر زۆری کـەی زیـان دێنـێ

کە نانی وشك درەنگی بخۆیت ئەبێتە گوڵ بە شەکر[2]

## چیرۆك (٨)

بە نەخۆشێکیان وت: دڵت چی داوا ئەکات؟ وتی: ئەوەی داوای هیچ نەکات. (تاك):

وورگ کە پـڕ بـوو سك ئـە بـێ نـەخۆش  سوودێکی نـابێ گشت ئـەسبابی خـۆش

## چیرۆك (٩)

لە شاری واسیت بەقاڵێ چەند درەمێکی لەسەرسۆفی‌یان گردبووبووەوە، هەموو ڕۆژێ داوای لێ ئەکردن‌و وتەی ڕەقی پێ ئەوتن. یاران لە بەدگوفتاری ڕەنجوور بوون‌و ئەیان گرتە شان بە ناچاری. خاوەن دڵێ لەو ناوەدا وتی: نەفس تەفرەدان بۆ خواردن ئاسانترە لە بەقاڵ بۆ درەم. (پارچە):

واز لە بەخشینی گەورە چاترە لام  لە قـوبووڵی جـەفای قـاپییەوان

چاترە مەرگ لە ئارەزووی گۆشتا  نەك خـوتەی نـاشیرینی قـەسابان

---

(١) خوا کە فەرمووی (کُلوا وَاشْرَبُوا) لەگەڵیا فەرمووی (وَ لاتُسْرِفوا)

(٢) مەکێشە مینەتی نامەرد، بۆ نان بە دوو نان گیان ئەکێشن خێڵی دوو نان، «ك».

## حکایت [۷]

یکی از حکما پسر را نهی همی کرد از بسیار خوردن که سیری شخص را رنجور دارد. گفت: ای پدر گرسنگی مرد را بکُشد. نشنیده‌ای که ظریفان گفته‌اند: به سیری مردن بهْ که گرسنگی بردن. گفت: اندازه نگه دار، کُلُوا وَاشْرَبُوا وَ لا تُسْرِفُوا.

نه چندان بخور کز دهانت برآید　　　نه چندان که از ضعف جانت برآید

***

با آن که در وجود طعام است حظِّ نفس

رنج آورد طعام که بیش از قَدَر بود

گر گُلشکر خوری به تکلف زیان کند

ور نان خشک دیر خوری گُلشکر بود

***

مکن، گر مردمی، بسیار خواری　　　که سگ زین می‌کشد بسیار خواری

## حکایت [۸]

رنجوری را گفتند دلت چه می‌خواهد؟ گفت: آنکه دلم چیزی نخواهد.

معده چو پر گشت و شکم درد خواست

سود ندارد همه اسباب راست

## حکایت [۹]

بقالی را درمی چند بر صوفیان گرد آمده بود در واسط. هر روز مطالبت کردی و سخن‌های با خشونت گفتی. اصحاب از تعنّتِ وی پریشان خاطر همی بودند و از تحمّل چاره نبود. صاحب‌دلی در آن میان گفت: نفْس را به طعام وعده دادن آسان‌تر است که بقال را به درَم.

ترک احسان خواجه اولیٰ‌تر　　　کاحتمال جفای بوّابان

به تمنّای گوشت مردن بهْ　　　که تقاضای زشت قصّابان

## چیرۆك (١٠)

جەوان مەردێ لە شەڕی تاتارا بریندار بوو. یەکێ وتی: پێی فڵان بازرگان نۆشدارووی هەیە داوای لێبکەیت هیچ درێغی ناکات. ئەڵێن بازرگان بە ڕژدی ناوی هەبوو. (تاك):

گەر لە باتی نان لە خوانیا ڕۆژ ئەبوو      لەم جیهانە نەی ئەدی کەس ڕۆژی روون

جەوانمەرد وتی: دەرمانی ئەگەر داوا لێبکەم ئەیدا یا نایدا، وە ئەگەر دای کەڵکی ئەبێ یا نابێ کەوا بوو داواکردنی زەهری کوشندەیە.

چیت بۆ شانازی لە دوو نان ویستی      بۆ لەشت زیاد بووە بۆ گیانت کەم[١]

حەکیمان وتوویانە ئەگەر ئاوی حەیات مەسەلا بفرۆشن بە ئابڕوو، پیاوی دانا نایکڕێت. مردن بە نەخۆشی چاترە لە ژیانی بێنەوایی [و مەننەت کێشی]. (تاك):

بخۆی گوژاڵك[٢] لە دەستی خۆش خوو      نەوەك شیرینی لە دەستی ترش ڕوو

## چیرۆك (١١)

یەکێ لە زانایان خۆرەندەیەکی زۆری هەبوو مووچەیەکی کەم، بە یەکێ لە گەورەکانی وت: کە باوەڕێکی زۆری پێهەبوو، ڕووی هیوای لێ هێنایەوە یەك. لە پەردەدا سواڵ کردنی بۆ شێوەی [ئەهلی] ئەدەب بە ناشیرین زانی. (پارچە):

بۆ ئیش بە خەندەو ڕوو خۆشی بچۆ      ئیش گرێ نادا دەمو ڕووی کراوە

تۆ بە ڕوو ترشی مەچۆ بۆ لای دۆست      لەوێش تاڵ ئەکەی ژینی ڕازاوە

ئەگێڕنەوە کە کەمێکی لە مووچەکەی زیاد کردو زۆری لە باوەڕی کەم کردەوە دەربارەی. دوای چەند ڕۆژێ خۆشەویستی جارانی لە جێی خۆی نەدی، وتی:

---

(١) لە هەندێ نووسخەدا ئەم شیعرەش هەیە

مکن، گر مردمی، بسیار خواری      کە سگ زین میکشد بسیار خواری

واتە:

فرە خۆر مەبە ئەگەر ئادەمی      کە سەگ بۆ خواردن رووی کردە کەمی.ـ ع.

(٢) گوژاڵك کووژاڵك: کاڵەکە مارانە، وشکی ئەکەنو دەیهاڕنەوە بۆ دەرمان کرنی حەیوانی کرمۆڵو تەبەق گرتوو. «ك»

## حکایت [۱۰]

جوان‌مردی را در جنگ تاتار جراحتی هول رسید. کسی گفت: فلان بازرگان نوش‌دارو دارد، اگر بخواهی باشد که قدری ببخشد. و گویند آن بازرگان به بُخل معروف بود.

**گر به‌جای نانش اندر سفره بودی آفتاب**
**تا قیامت روز روشن کس ندیدی در جهان**

جوان‌مرد گفت اگر نوش‌دارو خواهم دهد یا ندهد و اگر دهد نفعت کند یا نکند باری، خواستن از وی زهر کُشنده است.

**هرچه از دونان به منّت خواستی    در تن افزودیّ و از جان کاستی**

و حکما گفته‌اند: اگر آب حیات فروشند فی‌المَثَل به آبِ روی، دانا نخَرد که مردن به علّت بهْ از زندگانی به مذلّت.

**اگر حنظل خوری از دستِ خوش خوی**
**بهْ از شیرینی از دست تُرش‌روی**

## حکایت [۱۱]

یکی از علما خورنده‌ی بسیار داشت و کفافِ اندک. شکایتِ حالِ خویش پیشِ یکی از بزرگان که در حقِ وی حسنِ ظنّی بلیغ داشت بگفت. روی از توقّعِ او در هم کشید و تعرّضِ سؤال از اهلِ ادب در نظرش ناپسند آمد.

**ز بخت روی تُرُش کرده، پیش یارِ عزیز**
**مرو، که عیش بر او نیز تلخ گردانی**
**به حاجتی که رَوی، تازه روی و خندان‌رو**
**فرو نبندد کارِ گشاده پیشانی**

آورده‌اند که اندکی در وظیفه‌ی او زیادت کرد و بسیاری از ارادت کم. دانشمند پس از چند روز چون محبّتِ معهود برقرار ندید، گفت:

بِــــئْسَ الْـــمَطاعِمُ حِـــینَ الذُّلُّ یَکْسِـــبُها
القِـــدْرُ مُـــنْتَصَبٌ وَ القَـــدْرُ مَـــخْفوضٌ

چەند خراپە ئەو خۆراکانەی بە سووکی دەس ئەکەوێ
بەرز ئەبێ دیزە، بەڵام قەدری گەلێ پێ نزم ئەبێ

* * *

نانی زیاد کردم، ئاوی ڕووی بردم     برسێتی چاکە نەك سووکی لە دوای

## چیرۆك

یەکێ تەوبەی زۆری ئەکردو ئەیشکاند. لە یەکێ لە شێخەکانی پرسی وتی: لام وایە تۆ خووی زۆر خواردنت هەیە، ئەوی نەفسی پێپێوەند کراوە لە موو باریکترە، تۆ کە نەفس پەروەردە ئەکەیت، ئەگەر زەنجیر بێ ئەی پچڕێت.

## چیرۆك (١٢)

دەروێشێك پێویستێکی لێڕوودا. یەکێ پێی‌وت: فڵان سامانی هەیە بێ‌پایان، ئەگەر بە پێویستی تۆ بزانی لە جێ‌بەجێ کردنی ناوەستێ. وتی: بەو پیاوە نازانم. وتی: من ڕابەریت ئەکەم. دەستی گرت هەتا هێنایە قۆناغی ئەو پیاوە. یەکێکی دی لچی داهێشتووەو گرژ دانیشتووە. گەڕایەوەو هیچی نەوت. یەکێ لێی پرسی: چیت کرد؟ وتی: بەخششی ئەوم بە چارەی بەخشی. (پارچە):

بە ڕوو ترشان مەکە پێویستت نەزدیك     لە بەدخوویی نەوەك تۆ دڵ شکاو بی
غەمی دڵ ئەگەر ئەڵێی بیڵێ بە پیاوێ     لە چاوپێکەوتنی تۆ دڵ حەساو بی

## چیرۆك (١٣)

وشکەساڵی لە ئەسکەندەرییە پەیدا بوو، هەروەها کە جڵەوی توانا لە دەست دەروێشان دەرچوو بوو، دەرگاکانی ئاسمان لە زەمین بەستراو بوو، وە هەمیشە هاواری دانیشتووانی زەمین بۆ ئاسمان ئەچوو. (پارچە):

بِئْسَ اَلْـمَطاعِمُ حـینَ اَلذُّلُّ یَکْسِـبُها　　اَلْـقِدْرُ مُـنْتَصَبٌ وَ اَلْـقَدْرُ مَـخْفوضٌ

***

نانم افـزود و آبـرویم کـاست　　بی‌نوایی به از مذلّتِ خواست

## حکایت [۱۲]

درویشی را ضرورتی پیش آمد. کسی گفت: فلان نعمتی وافر دارد، اگر بر حاجتِ تو واقف شود در قضای آن توقّف روا ندارد. گفت: من او را ندانم. گفت: مَنَت رهبری کنم. دستش گرفت و به منزلِ آن‌کس در آورد. یکی را دید لب فروهشته و ابرو در هم کشیده و تند نشسته. برگشت و سخن نگفت. پرسیدندش: چه کردی؟ گفت: عطای او به لِقای او بخشیدم.

مبر حاجت بـه نـزدیکِ تـرش‌روی　　که از خوی بـدش فـرسوده گـردی
اگر گویی غمِ دل، بـا کسـی گـوی　　که از رویش به نقد آسـوده گـردی

## حکایت [۱۳]

خشک‌سالی در اسکندریّه عنانِ طاقتِ درویش از دسته رفته بود و درهای آسمان بر زمین بسته و فریادِ اهلِ زمین به آسمان پیوسته.

نەما بـوو جـانەوەران: مـاسی، مـەل، وە یـا مێروو

لە بـێ مـورادی نـەگـاتە فـەڵەك لێـیان ئـەفغان

عەجەب کە دووکەڵی دڵ کۆ نەبووبوو لەو خەڵکە

کـــە بـبێتــە هــەورو لێشــاوی چــاویان، بــاران

لە ساڵێکی وادا حیزەپیاوێك کە وتار لە بەیانی حاڵیا وازهێنانە لە ئـەدەبـو ویـل، بـە تایبەت لە خزمەتی گەورە پیاوانا، وە واز لێ هێنانیشی لە ڕووی سستی‌یەوە ناشێت چونکە تیرەیەك ئەیخەنە سەر بێ‌دەسەڵاتـی، جـا بـەم دوو شـیعرە کـورتم کـردەوە کـە کـەمێك نیشانەیە بۆ زۆر، وە مشتێ نمونەی خەروارێکە. (پارچە):

تـاتار بـیکوژێ ئـەو مـوخەننەسە　　　لە خوێنیا تـاتار نـاکـرێ بـێ‌گـیان

تاکەی وەك پردی بەغدا لە ژێریا　　　ئاو بـڕواو پشـتی پـیوەبێ ئـینسان

پیاوێکی وەها کە سووچێکت لە شێوەی بیست لەو سـاڵەدا نـیعمەتێکی بـێ‌پـایانی هەبوو، زیوەرو زەڕی ئەدا بەکەم دەستانو خوانی ئەنایە بـەردەمی ڕێبـواران، دەسـتەی دەروێشان لە تەنگی هەژاری هاتبوونە گیان‌دان، دەعوەتی ئەو پیاوەیان بـە یـاد ئـەکـرد. ڕاوێژیان هێنایە لای من سەرم بە نارێکی لێ‌دان وتم: (پارچە).

شێر هەرگیز ناخوا نیوە خوردەی سەگ　　　لە سەختی بـمرێ گـەر لە ژووری غـار

پـــاڵ بـــە نــاچاری بـرسێتــی‌وە دە　　　دەس درێژ مەکـە بـۆ سپڵەی بـێ کـار

بـێتــە فـەرەیدوون بـە نـیعمەتـو مـاڵ　　　بـێ‌هـونەر مـەکـە تـۆ بـە هـیچ ژمـار

پـــەرنیان، نـــەسیج، لە بـەر نـاکـەسا　　　وەك لاجـــیوەردو زەڕە بـــۆ دیـــوار

## چیرۆك (١٤)

لە حاتەمی تایی‌یان پرسی: کەسێکت لە خۆت بەرز هیممەت‌تر دیـوە یـا بـیستووە؟ وتی: بەڵێ. ڕۆژێ چل حوشترم کرد بوو بە قوربانی بۆ گەورەکانی عەرەب. لە پاشان بۆ پێویستی ڕۆیشتم بۆ گۆشەی دەشتێ، دڕك کێشێکم دی کۆمەڵێ دڕکی پێکهێنابوو وتم: بۆناچی بۆ میوانی حاتەمی تەی کە کۆمەڵێکی زۆر لەسەر خوانی ئەوکۆ بوونەتەوە. وتی:

**نماند جانور از وحش و طَیر و ماهی و مور**
**که بر فلک نشد از بی‌مرادی افغانش**
**عجب که دودِ دلِ خلق جمع می‌نشود**
**که ابر گردد و سیلابِ دیده بارانش**

در چنین سالی مُخَنَّثی، دور از دوستان، که سخن در وصفِ او ترکِ ادب است خاصّه در حضرتِ بزرگان و به طریقِ اهمال ازان درگذشتن هم موجّه نیست که طایفه‌ای بر عجزِ گوینده حمل کنند، بر این دو بیت اختصار کردم که اندکی دلیلِ بسیاری است و مشتی نمودارِ خرواری.

**گر تَتَر بکشد آن مخنّث را — تتری را عوض نباید کُشت**
**چند باشد چو جِسْرِ بغدادش — آب در زیر و آدمی بر پشت**

چنین شخصی که طَرَفی از نعتِ او شنیدی در آن سال نعمتی وافر داشت. تنگ‌دستان را سیم و زر دادی و مسافران را سفره نهادی. طایفه‌ای درویشان از جورِ فاقه به جان آمده بودند، آهنگ دعوتِ او داشتند و مشاورت پیشِ من آوردند. سر از موافقت باز زدم و گفتم:

**نخورد شیر نیم‌خورده‌ی سگ — ور بمیرد به سختی اندر غار**
**تن به بی‌چارگی و گرسنگی — بنه و دست پیشِ سفله مدار**
**گر فریدون شود به نعمت و مُلک — بی‌هنر را به هیچ‌کس مشمار**
**پرنیان و نَسیج بر نااهل — لاجورد و طِلی است بر دیوار**

## حکایت [۱۴]

حاتمِ طایی را گفتند: از تو بزرگ همّت‌تر در جهان دیده‌ای یا شنیده‌ای؟ گفت: بلی، یک روز چهل شتر قربان کرده بودم امرای عرب را و خود به گوشه‌ی صحرا به حاجتی بیرون رفتم. خارکنی را دیدم پُشته فراهم نهاده. گفتم: به مهمانیِ حاتم چرا نروی که خلقی بر سماطِ او گرد آمده‌اند؟ گفت:

کەسێ نان بخوا لە ئیشی دەستی ناکێشێ هەرگیز شانازی حاتەم

ئینسافم دایەو ئەوم لە خۆم بە هیممەت‌ترو جەوانمەردتر دی.

## چیرۆك (١٥)

مووسا ـ سەلامی خوای لێبێ ـ دەروێشێکی دی لە ڕووتی‌یا چوبووە ناو لمەوە. وتی: ئەی مووسا لە خوای بەرزو بڵند داوا بکە مووچەی ژیانم بداتێ، لە ناتەوانی‌یا هاتوومەگیان. مووسا داوای بۆ کردو ڕۆیشت. دوای چەند ڕۆژێ لە گفتوگۆو پاڕانەوە هاتەوە. پیاوەی دی دوچار بووە کۆمەڵێکی زۆر لە سەری گرد بووەتەوە. وتی: ئەمە چ حاڵێکە؟ ویتان: شەرابی خواردووەتەوەو نەڕەنەڕی کردووەو یەکێکی کوشتووەو دراوە بە کوشتنەوە. (چواری):

تووی چۆلەکەی ئەبڕی لە جیهان پشیلەی هەژار باڵی ببوایە

نەی ئەهێشت ئینسان لە دەورو پشتی دووشاخی گا جووت کەر ببیوایە[1]

(تاك):

بێ‌دەس دەستی بێ هەڵئەسێتە پێیان لە بنا ئەبڕێت دەستی داماوان[2]

﴿وَ لَوْ بَسَطَ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ﴾ (واتە: ئەگەر خوا مووچەی ڕاخا بۆ عیباد یاخی ئەبن لە زەمیندا). مووسا ـ سەلامی خوای لێبێ ـ دانی نا بە حیکمەتی خواداو داوای لێ‌خۆش بوونی کرد بۆ شۆخی‌یەی[3] کەکردی.

ماذا اَخاضَك يا مَغْرُورُ فی الْخَطَرِ حَتّیٰ هَلَكْتَ فَلَيْتَ النَّمْلُ لَمْ تَطِرِ

(چی تۆی خستە ترس سەرکەش تا فەوتان کاشکی مێلووره قەت نەفڕی بایە)

* * *

---

(١) دەزانی سرشت، بۆچ پای نەدا مار تا نەکا بەژار، قەلاچۆی هەژار، ـ «ك».

(٢) لە هەندێ نوسخەدا وا نووسراوە:

ئەوەی لە عالەم داینا حەوت ئیقلیم هەرکەس شایانی خۆی پێ‌کرد تەسلیم

ئەگەر دەس ڕۆیبو وە یا دەس کورتی هەر کەس ئەوەیە کەوا هەیەتی

ئەگەر بە دەرویش بدرێ دەسەلات بەدی‌و خەیانەت زۆر لێ ڕوو ئەدات

پشیلەی هەژار باڵی ببوایە تووی چۆلەکە ئەبوو نەمایە

ئادەمیزادی ئەبوو نەمایە دوو شاخی گاجووت کەر ببیوایە، ـ «و».

(٣) شۆخی، لێرەدا بە مانای جەسارەتە، نەك شۆخیی‌و گاڵتە، «ك».

هرکه نان از عملِ خویش خورَد　　　　مـنّتِ حـاتمِ طـایی نـبرد

من او را به همّت و جوان‌مردی از خود برتر دیدم.

## حکایت [۱۵]

موسی، عَلَیْهِ ٱلسَّلام، درویشی را دید از برهنگی به ریگ در شده. دعا کرد تا خدای، عَزَّوَجَلّ، مر او را نعمتی داد. پس از چند روز دیدش گرفتار و خلقی انبوه بر او گرد آمده. گفت: این را چه حالت است؟ گفتند: خَمر خورده است و عربده کرده و خونِ کسی ریخته، قصاصش همی کنند. لطیفان گفته‌اند:

گربه‌ی مسکین اگر پـر داشـتی　　　　تخمِ گنجشک از جهان برداشتی

***

عاجز، باشد کـه دستِ قـدرت یـابد　　　　بـرخـیزد و دستِ عـاجزان بـرتابد

وَ لَوْ بَسَطَ ٱللّٰهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبادِهِ لَبَغَوْا فِی ٱلْأَرْضِ. موسی به حکمتِ حق تعالی اقرار کرد و از تجاسرِ خویش استغفار.

مَاذَا أَخاضَکَ یا مَـغْرُورُ فِـی ٱلْـخَطَرِ　　　　حَتّیٰ هَلَکْتَ فَـلَیْتَ ٱلنَّـمْلَ لَـمْ یَـطِرِ

***

سپڵە گەورەیی و زیوو زێڕی دی چارە چەپۆکە لە بۆ تەوقەسەر
ئەی نەت بیستووە کە چی وت لوقمان چاترە مێروو نەیبێ باڵ و پەڕ

فەلسەفە: باوك هەنگوینی زۆرە، بەڵام کوڕ سروشتی گەرمە.

ئەو کەسەی کە تۆ ناکا تەوانا بۆ چاکیت لە خۆت چاکترەو زانا

## چیرۆك (١٦)

عارەبێکی دەشتەکیم دی لە ڕیزی جەواهێر فرۆشانی بەسرە ئەی گێڕایەوە کە کاتێ لە بیابانێ ڕێم ون کردبو، وە توێشووی پێویستم شتێکی نەمابوو. دڵم بە فەوتانەوە نابوو، لەناکاو کیسەیەکم دوزییەوە پڕ لە مرواری. هەرگیز ئەو تام و شادییە فەرامۆش ناکەم کە وامزانی گەنمی برژاوە، وە دیسانەوە ئەو تاڵی و بێ هیوایی‌یە کە زانیم مرواریيە.

لە بیابانی وشك و لمی زۆر تینوو لە دەمیا چ سەدەف چ دوڕ
پیاوی بێ توێشوو کاتێ لەپێ کەوت لە کەمەربەندیا چ سواڵەت چ زەڕ

## چیرۆك (١٧)

عارەبێك لە بیابانێ لەو پەڕی تینوویەتی‌یا ئەیوت:

يَالَيْتَ قَبْلَ مَنِيَّتِي يَوْماً أَفُوزُ بِمُنْيَتِي
نَهْراً تُلاطِمُ رُكْبَتِي وَ أَظِلُّ أَمْلأُ قِرْبَتِي

ئەی خۆزگە من پێش مردنم، ڕۆژێ بە ئامانجم بگەم
جۆگە لە ئەژنۆمدا شەپۆل، جا گۆزەمی لێ پڕ بکەم

## چیرۆك (١٨)

هەروەها دەروێشێ لە دەشتێکی پانا ڕێگەی ون کردو خۆراك و هێزی نەما. چەند درەمێکی پێ بوو. زۆر گەڕا ڕێگەی نەبردە شوێنێ هەتا لە سەختی‌یا مرد. تیرەیەك گەیشتنە سەری، درەمێکیان لە بەردەما دی، وە لەسەر خاك نووسیبووی: (پارچە).

گەر ببێ هەموو زەڕی جەعفەری[1] پیاوی بێ توێشوو وەرناگرێ کام
چاترە لە بۆ هەژارێ لە چۆڵ شێلمی پوختە لە ئاڵتوونی خام

(١) جەعفەری: کیمیاگەر، یا بەرمەکی، و (درەمی زەڕی ناب)-ع.

سفله چو جاه آمد و سیم و زرش　　سیلی خواهد به ضرورت سرش
آن نشنیدی که حکیمی چه گفت　　مور همان بِهْ که نباشد پرش

پدر را عسل بسیارست ولیکن پسر گرمی‌دارست.

آن کس که توانگرت نمی‌گرداند　　او مصلحتِ تو از تو بهتر داند

## حکایت [۱۶]

اعرابیی را دیدم در حلقه‌ی جوهریانِ بصره حکایت همی کرد که وقتی در بیابانی راه گم کرده بودم و از زادْ معنی با من چیزی نبود و دل بر هلاک نهاده که ناگاه کیسه‌ای یافتم پر مروارید. هرگز آن ذوق و شادی فراموش نکنم که پنداشتم گندمِ بریان است و باز آن تلخی و نومیدی که بدانستم که مرواریدست.

در بیابانِ خشک و ریگِ روان　　تشنه را در دهان چه دُر چه صدف
مردِ بی‌توشه کاوفتاد از پای　　بر کمربندِ او چه زر چه خَزَف

## حکایت [۱۷]

یکی از عرب در بیابانی از غایتِ تشنگی می‌گفت:

يَا لَيْتَ قَبْلَ مَنِيَّتِي يَوْماً أَفُوزُ بِمُنْيَتِي　　نَهْرٍ تُلاطِمُ رُكْبَتِي وَ أَظَلُّ أَمْلأُ قِرْبَتِي

## حکایت [۱۸]

هم‌چنین درویشی در قاعِ بسیط گم شده بود و قوت و قوّتش به آخر آمده و درمی چند بر میان داشت. بسیار بگردید و ره به جایی نبرد و عاقبت هلاک شد. طایفه‌ای برسیدند و درم‌ها دیدند پیشِ رویش نهاده و بر خاک نبشته:

گر همه زرِّ جعفری دارد　　مرد بی‌توشه برنگیرد گام
در بیابان فقیرِ سوخته را　　شلغمِ پخته به که نقره‌ی خام

### چیرۆك (١٩)

هەرگیز لە چەرخی زەمان نەم ناڵاندووە، وە لە هاتووچووی ڕۆژان رووم نەهێناوەتە یەك مەگەر کاتێ پێم ڕووت‌و توانای پێ‌پۆشێکم نەبوو هاتمە مزگەوتی گەورەی کووفە بە دڵ تەنگی. یەکێکم دی پێ‌یەکی نەبوو. سوپاسی بەخشایشی خوام هێنایەجێ، وە لەسەر بێ‌پێڵاوی تواناییم نواند. (پارچە):

| | |
|---|---|
| لەبەر چاوی تێر مەلی بوریانی | کەمتر لە بەرگی تەڕی سەرخوانە |
| لەلای بێ‌دەست‌و بێ دەسەڵاتان | شێلمی پوختە مەلی بوریانە |

### چیرۆك (٢٠)

یەکێ لە پادشایان لەگەڵ چەند کەسێکی تایبەت لە ڕاوگەیەکا لە زستان لە ئاوەدانی دوور کەوتەوە، شەو هات بەسەریا. ماڵە فەللاحێکی دی، پادشا وتی: شەو بچینە ئەوێ هەتا سەغڵەتی سەرمامان نەبێ. یەکێ لە وەزیران وتی: شایانی پادشا نییە پەنا بەرێتە ماڵی فەللاحێکی سووك. هەر لەم شوێنەدا خێوەت هەڵ ئەدەین، ئاگر ئەکەینەوە. فەللاح پێی زانی چی بە دەستەوە هات بۆی ئامادە کردن‌و هێنایە بەردەم. زەمینی خزمەتی ماچ کردو وتی: پایەی بەرزی پادشا بەوە نزم نەدەبوو، بەڵام نەیان ویست پایەی نزمی فەللاحێ بەرزبێتەوە. پادشا ئەم وتەیەی لەلا دڵگیرو پەسەند بوو، لەکاتی شەواگواستیانەوە بۆ ماڵی فەللاح. بەیانی خەڵات‌و بەخششیان دایە. فەللاح لەبەر ئاوزەنگیی پادشا ئەڕۆیشت‌و ئەیوت: (پارچە).

لە قەدرو شەوکەتی پادشا شتێ نەیکرد کەم

کەپێی هێنایە میوانخانەی منی شوانێ

بەڵام کڵاوی سەری من گەیشتە رۆژ سووچی

کە سێبەری سەری من خست وەکوو تۆ سوڵتانێ

### چیرۆك (٢١)

ئەگێڕنەوە گەدایێ سامانێکی زۆری پێکەوە نابوو، یەکێ لە پادشایان پێی‌وت: دیارە سامانێکی زۆرت هەیە. ئێمەیش ئیشێکی گرنگمان هەیە. ئەگەر بە هەندێ لەو ماڵە

## حکایت [۱۹]

هرگز از دورِ زمان نناليدم و روی از گردشِ آسمان درهم نکشيدم مگر وقتی که پايم برهنه مانده بود و استطاعتِ پایْ‌پوشی نداشتم، به جامعِ کوفه درآمدم دلتنگ، يکی را ديدم که پای نداشت. شکرِ نعمتِ حق تعالی به‌جای آوردم و بر بی‌کفشی صبر کردم.

مـــرغِ بـريان بـه چشـمِ مـردمِ سـير　　کـمتر از بـرگِ تـرّه بـر خـوان است
وان کـه را دسـتگاه و قـدرت نـيست　　شـــلغمِ پـــخته مـــرغِ بـــريان است

## حکایت [۲۰]

يکی از ملوک با تنی چند از خاصّان در شکارگاهی به زمستان از عمارت دور افتاد تا شب درآمد خانه‌ی دهقانی ديدند. مَلِک گفت: شب آن جا رويم تا زحمتِ سرما نباشد. يکی از وزرا گفت: لايقِ قدرِ پادشاهان نباشد به خانه‌ی دهقانی التجا کردن، هم اين جا خيمه زنيم و آتش کنيم. چنان کردند. دهقان را خبر شد، ماحَضَری ترتيب کرد و پيش آورد و زمين ببوسيد و گفت: قدرِ بلندِ سلطان بدين قدر نازل نشدی وليکن نخواستند که قدرِ دهقان بلند شود. مَلِک را سخن گفتنِ او مطبوع آمد، شبانگه به منزلِ او نقل کردند. بامدادان خلعت و نعمت فرمودش. دهقان قدمی چند در رکابِ مَلِک می‌رفت و می‌گفت:

ز قدر و هيبتِ سـلطان نگشت چـيزی کـم
از التــفات بـــه مـــهمان‌سرای دهـــقانی
کـلاه گـوشه‌ی دهـقان بـه آفـتاب رسـيد
که سايه بر سرش آورد چون تـو سـلطانی

## حکایت [۲۱]

گدايی هول را حکايت کنند که نعمتِ بی‌قياس اندخته بود. يکی از پادشاهان گفتش: همی نمايند که مالِ بی‌کران داری و ما را مهمّی هست اگر به برخی ازان دستگيری کنی

دەسگرۆییمان بکەیت کە خەزێنە زیاد بوو جێبەجێ ئەکرێت. وتی: ئەی خاوەنی ڕووی زەمین شایانی پایەی گەورەی پادشایان نییە دەستی هیممەت تێکەڵ بە ماڵی گەدایەك بکەن دەنکە جۆ دەنکە جۆ کۆم کردووەتەوە. پادشا وتی: قەیدێ ناکا ئەیدەم بە کافران ﴿ٱلْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ﴾. (تاك):

لە چاڵا ئاوی گاور گەر نەبێ پاك

کە جووی مردوو بشوێ پێی چیت هەیە باك

* * *

| قَالُوا عَجِينُ الْكِلْسِ لَيْسَ بِطَاهِرٍ | قُلْنَا نَسُدُّ بِهِ شُقُوقَ الْمَبْرِزِ |
|---|---|
| ویتان: لە پاکی بە دووره قسڵ[1] | وتمان پێی ئەگرین درزی ئاودەستێ |

بیستم کە سەری نەدا بە فەرمانی پادشا، بیانوو هێنانەوەی دەست پێ کرد. بێ ئابڕوویی چاوی خستە ڕوو پادشا فەرمانی دا ئەوەی وتبووی، بە هەڕەشەو سزا لێیان سەند. (پارچە):

| کە بە نەرمی دروست نەبوو بۆت ئیش | سەر بە بێ حورمەتی ئەکێشی کار |
|---|---|
| هەرکەسێ خۆی نەبەخشێ، خەڵکی‌تر | گەر نەیان بەخشی تۆ مەکە ئینکار |

## چیرۆك (٢٢)

بازرگانێکم دی سەدو پەنجا حوشتر بارو چل کۆیلەو خزمەتکاری هەبوو. شەوێك لە جەزیرەی کیش منی ڕاکێشایە ژوورەکەی خۆی. هەموو شەو لە وتاری پەرێشانا سرەوتی نەبوو کە فڵان عەمارەتم لە تورکستانەو فڵان کوتاڵم لە هیندستانە، وە ئەمە تاپۆی[2] فڵان زەویمە وە فڵان شت هی فڵان شتە. دڵم بە ئەسکەندەریەوەیە کە هەوا خۆشە. دووبارە وتی: نەء دەلیای ڕۆژئاوا بە شەپۆلەو. سەعدی‌یا سەفەرێکی ترم لە پێشە، ئەگەر ئەو سەفەرە تەواوکەم ئیتر هەرچی ژیانم ماوە لە گۆشەیەك بۆی دائەنیشم. وتم: ئەوە کامەیە؟

---

(١) قسڵ، بەزمانی کەرکوکی: ئەهەك، ئاهەك. قسڵ: شتێکی تیژی سووتێنەری سپی‌یە لە سووتاندنی جۆرە بەردێ پەیدا ئەبێ. «ك»

(٢) تاپۆ: بنچاخ، قەباڵە، جۆرە سەنەدێکی دەوڵەتییە ئەدرێ بە خاوەنی خانووبەرە. «ك»

چون ارتفاع رسد وفاکرده شود و شُکر گفته. گفت: ای خداوندِ روی زمین لایقِ قدرِ بزرگِ سلطان کجا باشد دستِ همّت به مالِ چون من گدایی آلوده کردن که جوْجوْ به گدایی فراهم آورده‌ام! گفت: غم نیست که به تَتَری می‌دهم. اَلْخَبیثاتُ لِلْخَبیثینَ.

گر آبِ چاهِ نصرانی نه پاک است　　جهودِ مرده می‌شویی چه باک است؟

***

قَالُوا عَجِینُ اَلْکِلْسِ لَیْسَ بِطاهِرٍ　　قُلْنا نَسُدُّ بِهِ شُقُوقَ اَلْمَبْرَزِ

شنیدم که سر از فرمانِ مَلِک باز زد و حجّت آوردن گرفت و شوخ چشمی کردن. مَلِک فرمود تا مضمونِ خطاب از وی به زجر و توبیخ مستخلص کردند.

به لطافت چو برنیاید کار　　سر به بی‌حرمتی کشد ناچار
هرکه بر خویشتن نبخشاید　　گر نبخشد بر او کسی، شاید

## حکایت [۲۲]

بازرگانی را دیدم که صد و پنجاه شتر بار داشت و چهل بنده و خدمتگار. شبی در جزیره‌ی کیش مرا به حجره‌ی خویش برد. همه شب دیده بر هم نبست از سخنانِ پریشان گفتن که فلان انبازم به ترکستان است و فلان بضاعت به هندوستان و این قباله‌ی فلان زمین است و فلان مال را فلان کس ضمین. گاه گفتی: خاطرِ اسکندریّه دارم که هوایی خوش است. باز گفتی: نه، که دریای مغرب مشوّش است. سعدیا، سفری دیگرم در پیش است، اگر کرده شود بقیّتِ عمر به گوشه‌ای بنشینم. گفتم: آن کدام سفرست؟ گفت:

وتی: ئەمەوێت گۆگردی فارسی بەرم بۆ چین. بیستوومە لەوێ نرخێکی گەورەی هەیە، وە لەوێوە کاسەی چینی بهێنم [بۆ ڕۆم] و بەرگی ئاوریشمی ڕۆمی بەرم بۆ هیندو پۆڵای هیند بۆ حەڵەب و ئاوێنەی حەڵەب بۆ یەمەن و بوردی یەمەنی بۆ پارس. دوای ئەوە ئیتر واز لە تیجارەت ئەهێنم و لە دووکانێکا دائەنیشم و گۆشەی تەنیایی بە ئینساف ئەگرم. لەو خولیایەدا ئەوەندەی وت توانای وتنی نەما. جا وتی: ئەی سەعدی تۆیش وتەیەك بڵێ لەوەی دیوتە یابیستووتە. وتم: (پارچە).

قافڵەسالارێ لە ئێستر کەوتە خوار    چی ئەوت بیستت لە دەشتێ چۆڵ و غۆر

واتە چاوی تەنگی دنیا دارەکان    یا قەناعەت پڕیەکا یا خاکی گۆڕ

## چیرۆك (٢٣)

ساماندارێکم بیست ئەوەندە بە ڕژدی ناوی دەرکرد بوو وەکوو حاتەمی تەی بە بەخشش. دیمەنی دەرەوەی بە نیعمەت ڕازابوەوە، بەڵام پیسی نەفسی لە سروشتا هەروەها ڕەگی داکوتابوو، هەتا ئەندازەیەك بە گیانێ نانێکی لەدەست نەئەبوەوە. پشیلەی ئەبووهورەیرەی بە پارە پارووێك نە ئەلاواند، ئێسقانێکی نە ئەخستە بەردەم سەگی یارەکانی غار. بە کورتی کەسماڵی نەدیبوو، وە دەرگای نەکردبوەوە، وە سەری خوانی هەڵنەدابووەوە. (تاك):

بۆنی خۆراکی نەبێ نەی کردووە پیاوی هەژار

نەی چنیوە مەل لە دوای نان خواردنی ئەو وردەنان

بیستم بە دەلیای ڕۆژئاوادا ڕێگەی میسری گرتەبەر. هەوای فیرعەونی چوەبووە سەر. ﴿حَتَّىٰ إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ آمَنتُ﴾ (هەتا نوقم بوونی گەیشتێ، جا وتی: ئیمانم هێنا). بایەکی نارێك دای بە پاپۆڕا.

بۆ تەبعی مەلوولت چ بڵێ دڵ کە نەسازێ

"شورتە"[١] هەموو کاتێ نییە شایستەیی کەشتی

(١) شورتە: ئەو بایە کە بۆ کەشتی چاکە (باد موافق)، عەلامەت و نیشانە. «ك»

گوگردِ پارسی خواهم بردن به چین که شنیدم عظیم قیمتی دارد و ازان جا کاسه‌ی چینی به روم آورم و دیبای رومی به هند و فولادِ هندی به حلب و آبگینه‌ی حلبی به یمن و بُردِ یَمانی به پارس و ازان پس ترکِ تجارت کنم و به دکانی بنشینم. انصاف، از این ماخولیا چندان فرو گفت که بیش طاقتِ گفتنش نماند. گفت: ای سعدی، تو هم سخنی بگوی از آن‌ها که دیده‌ای و شنیده‌ای. گفتم:

آن شـنیدستی کـه روزی تـاجری / در بـیابانی بـیفتاد از سـتور
گـفت: چشـمِ تـنگِ دنـیادار را / یا قناعت پُر کـند یـا خـاکِ گـور

## حکایت [۲۳]

مالداری را شنیدم که به بخل چنان معروف بود که حاتِمِ طایی در کَرَم. ظاهرِ حالش به نعمتِ دنیا آراسته و باطنش بخیل و بخل آگنده چنان که نانی به جانی از دست ندادی و گربه‌ی بُوهُرَیرَه را به لقمه‌ای ننواختی و سگِ اصحاب‌الکهف را استخوانی نینداختی. فی الجمله خانه‌ی او را کس ندیدی در گشاده و سفره‌ی او را سر گشاده.

درویش به‌جز بـوی طـعامش نشـنیدی / مرغ از پسِ نان خوردنِ او ریزه نچیدی

شنیدم که باری به دریای مغرب نشسته بود و راهِ مصر برگرفته و خیالِ فـرعونی در سر؛ حَتَّىٰ إِذَا أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ، بادی مخالفِ کشتی برآمد.

با طبعِ ملولت چه کند دل کـه نسـازد؟ / شُرْطه هـمه وقـتی نـبوَد لایـقِ کشـتی

دەستی پاڕانەوەی هەڵبڕی. هاواری بێسوودی ئەکرد ﴿وَ إِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ (واتە: کاتێ سوار بوون لە کەشتی لە خوا ئەپاڕێنەوە لە دڵەوە وە بۆ خوایە ئایین). (شیعر):

دەستی زاری بەندەیی موحتاج ئەبێ سوودی چ بێ

کاتی بەخشش توون لە باخەڵ کاتی داوا بۆ خوا

(پارچە):

بە زیوو بە زەڕ بدە ڕاحەتێ | خۆیشت وەر گرە لێیان لەززەتێ
لە تووە خانووت ئەمێنی بووبوون | خشتێکی زێڕکە خشتێکی ئاڵتوون

ئەگێڕنەوە لە میسر خزم و خوێشی هەژاری زۆر هەبوو، دوای مردنی ئەو بەو سامانەی جێی هێشت دەوڵەمەند بوون، کراسی کۆنیان بە مەرگی ئەو دڕی وەلەباتی ئەوە پارچەی ئاوریشم. حەریریان بڕی. لەو حەفتەیەدا یەکێکم لەوانە دی سواری ئەسپێکی خۆش ڕەو بووبوو، وە غوڵامێکی پەری شێوە لە دوایەوە ئەڕۆیشت. (پارچە):

ئای ئەگەر مردوو ئەگەڕایەوە | بەناو خزمانا ئەسووڕایەوە
دانەوەی میرات زۆر ئەبوو گران | لەلای واریسان لە مەرگی خزمان

بە هۆی ناسیاوی زوومانەوە، یەخەیم گرت و وتم:

بیخۆ سەری پیاوی چاك شێوە | کۆی کردەوە ئەو نەفامە نەیخوارد

## چیرۆك (٢٤)

ماسی گرێکی لاواز ماسییەکی گەورە کەوتە ناو تۆڕەکەیەوە نەیتوانی ئاگاداری بکا، ماسی زۆری بۆ هێنا ماشەی لە دەست سەندو ڕۆیشت.

غوڵامێ ئاوی جۆگەی ئەهێنا | ئاوی جۆگە هات ڕای ڕفاند غوڵام
ماشە گشت جارێ ماسیی ئەهێنا | ئەمجارە ماسی هات و بردی دام[1]

(١) غوڵامێ ئەچێ بۆ ماسی گرتن | ماسی قولاوی لە دەس دەردێنێ
قولاو هەموو جار ماسی ناگرێ | جار جارە ماسی قولاو ئەفڕێنی
مبەستی سەعدی لە «آب‌جو» ماسییە وە «غوڵام»ی دووەم بە مانای قولاو، داو، ماشەیە. «ك»

دستِ دعا برآورد و فریادِ بی‌فایده خواندن گرفت، فَإِذَا رَكِبُوا فِي ٱلْفُلْكِ دَعَوُا ٱللَّـهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ.

دستِ تضرّع چه سود بنده‌ی محتاج را  وقتِ دعا بر خدا، وقتِ کَرَم در بغل؟

***

از زر و سیم راحتی برسان  خویشتن هم تمتّعی برگیر
وانگه این خانه کز تو خواهد ماند  خشتی از سیم خشتی از زر گیر

آورده‌اند که در مصر اقاربِ درویش داشت، بعد از هلاکِ او به بقیّتِ مالِ او توانگر شدند و جامه‌های کهن به مرگِ او بدریدند و خز و دِمْیاطی ببریدند. هم در آن هفته یکی را دیدم از ایشان: بر بادپایی روان و غلامی در پی دوان.

وه که گر مرده باز گردیدی  به میانِ قبیله و پیوند
ردِّ میراث سخت‌تر بودی  وارثان را ز مرگِ خویشاوند

به سابقه‌ی معرفتی که میانِ ما بود آستینش گرفتم و گفتم:

بخور، ای نیک سیرتِ سَره مرد  کان نگون بخت گرد کرد و نخورد

## حکایت [۲۴]

شنیدم که صیّادی ضعیف را ماهیی قوی در دام افتاد. قوّتِ ضبطِ آن نداشت. ماهی بر او غالب آمد و دام از کَفَش در ربود و برفت.

شد غلامی که آبِ جوی آرد  آبِ جوی آمد و غلام ببُرد
دام هربار ماهی آوردی  ماهی این بار رفت و دام ببُرد

ماسی گرەکانی‌تر زۆریان داخ خواردو تانووتیان لێ‌دا کە ماسی‌یەکی وەها هاتە تۆڕەکەتەوە کەچی نەت‌توانی ئاگاداری بکەیت. وتی: ئەی برادەرینە چی‌بکەم‌من، مووچەم نەبوو، وە ماسی‌یەکە مووچەی مابوو. ڕاوچی بێ‌مووچە لە دەجلەدا ماسی ناگرێت، وە ماسی بێ‌ئاکام لە وشکی‌دا نامرێت.

## چیرۆك (٢٥)

دەست‌و پێ بڕاوێك هەزارپێ‌یەکی کوشت. خاوەن دڵێ بە لایا ڕابوورد وتی: سبحان الله، لەگەڵ ئەوەدا هەزار پێی هەیە چونکە ئاکامی هاتبوو نەیتوانی لە بێ‌دەس‌و پێ‌یەك ڕاکات.

دوژمن لە دواوە بێ‌و وەرگرێ گیان | ئاکام ئەبەستێ پێی ئە سپی ڕەوان
ئەو دەمە دوژمن پەیاپەی ئەگات | نابێ ڕاکێشێ کەوانی کەیان

## چیرۆك (٢٦)

گێلێکم دی قەڵەو، جل‌و بەرگێکی بە نرخی لەبەرا، سواری ئەسپێکی عەرەبی وە میزەرێکی میسریی لەسەرا، یەکێ وتی: سەعدی چۆنی ئەبینی ئاوریشمی چنراو لەبەر ئەم حەیوانە نەزانەدا؟ وتم:

قَــدْ شــابَهَ بِــالْوَرَیٰ حِـمارٌ | عِـــجْلٌ جَسَــدٌ لَــهُ خُــوارٌ
بەڵێ کەرێکە لە وێنەی ئینسان | لەش گوێرەکەیە کەوا دەیبۆڕان

وتوویانە: شێوەیەکی جوان لە هەزار پارچەی ئاوریشم چاکترە. (پارچە):

لە ئینسان ناچێ ئەم حەیوانە مەر | نەخشی دیمەنی‌و پاڵتۆو شەدەی سەر
هەرچی هەیەتی تێدا نابینی | بسووڕێتەوە مەر تەنیا خوێنی

(چواری):

شەریف لاواز بێ تۆ وامەزانە | کە پایەی بەرزی پێ‌زەعیف ئەبێ
دیوانی لە زیو، گوڵ مێخی ئاڵتون | وا مەزانە جووی پێ شەریف ئەبێ

دیگر صیّادان دریغ خوردند و ملامتش کردند که چنین صیدی در دامت افتاد و نگاه نتوانستی داشتن! گفت: ای یاران، چه توان کردن؟ مرا آن ماهی روزی نبود و ماهی را هم‌چنان روزی مانده بود.

صیّاد بی‌روزی ماهی در دجله نگیرد و ماهی بی‌اجل بر خشک نمیرد.

## حکایت [۲۵]

دست و پایْ بریده‌ای هزارپایی بکُشت. صاحب‌دلی بر او بگذشت و گفت: سُبْحانَ اَللّٰه! با هزار پای که داشت چون اجلش فرا رسید از بی‌دست و پایی نتوانست گریخت.

چو آید ز پس دشمنِ جان ستان — ببندد اَجَل پایِ مردِ دوان

در آن دم که دشمن پیاپی رسید — کمانِ کیانی نشاید کشید

## حکایت [۲۶]

ابلهی را دیدم سَمین، خلعتی ثَمین در بر و قَصَبی بر سر و مرکبی تازی در زیرِ ران و غلامی از پی دوان. کسی گفت: سعدی چون می‌بینی این دیبای مُعْلَم بر این حیوانِ لایَعْلَم؟ گفتم: خطی زشت است که به آبِ زر نبشته است.

قَدْ شابَهَ بِالْوَریٰ حِمارٌ — عِجْلاً جَسَداً لَهُ خُوارٌ

گفته‌اند که یک طلعتِ زیبا بِهْ از هزار خلعتِ دیبا.

به آدمی نتوان گفت مانَد این حیوان

مگر دُراعه و دستار و نقشِ بیرونش

نگر تو در همه اسباب و مِلک و هستیِ او

که هیچ چیز نبینی حلال جز خونش

***

شریف اگر مُتَضَعّف شود خیال مبند — که پایگاهِ بلندش ضعیف خواهد شد

ور آستانه‌ی سیمین به میخِ زر بندد — گمان مبر که یهودی شریف خواهد شد

## چیرۆك (٢٧)

دزێك بە سواڵکەرێکی وت: هیچ شەرم ناکەی بۆ دەنکە جۆیەك زیو دەست بۆ هەموو ناکەسێ درێژ ئەکەیت. وتی: (تاك).

دەست درێژکردن بۆ دەنکە زیوێ      نەوەك ببڕن بۆ دانگو نیوێ

## چیرۆك (٢٨)

ئەگێڕنەوە مشت وەشێنێ لە ناهەمواری زەمان کەوتبوە هاوار، وە قوڕگی بە تاڵی لە تەنگ دەستی‌یا هاتبوە گیاندان. شکایەتی هێنایە بەر باوکی‌و داوای ئیزنی لێ کرد کە بیری سەفەرم هەیە هەتا بە هێزی بازوو داوێنی هیوایەك چنگ خەم. (تاك):

بێ نواندن، فەزڵو هونەر فەوتاون      عوود بە ئاگر و میسك ئەیسوونەوە

باوکی وتی: ئەی کوڕم خەیاڵی خاو لەسەرت دەرکە، پێی قەناعەت لە داوێن ئاڵاندن مایەی سەلامەتییە. گەورەکان وتوویانە دەوڵەت بە تێکۆشان نییە کەوایە چارە کەم جۆشانە. (٣ تاك):

١: داوێنی دەوڵەت بە زۆر ناگیرێ<br>کوشش بێ کەڵکە وەك وسمە بۆ کوێر

٢: چی بکا زۆرداری ئاوەژوو بەخت<br>بازووی بەختت بێ نەك بازووی سەخت

٣: لەسەرهەر موویەك دوو سەد خیرەد بێ[1]<br>هونەر کار ناکا کە بەختت بەد بێ

کوڕە وتی: ئەی بابە کەڵك‌و سوودی سەفەر زۆرە لە شادمانی دڵو، ڕاکێشانی قازانج‌و، چاوپێ کەوتنی شتی سەیرو، بیستنی‌و، گەردشی شارانو، گفتوگۆی هاوڕێیانو، پێك‌هاتنی پایەی ئەدەب‌و وێڵ‌و، زۆرکردنی کەسب‌و ماڵو، ناسینی یارو، تاقی کردنەوەی ڕۆزگار هەروەکو ڕێڕەوانی تەریقەت فەرموویانە:

---

(١) خیرەد: مێشك، هۆش. «ع.م».

## حکایت [۲۷]

دزدی گدایی را گفت: شرم نداری که از برای جوی سیم دست پیشِ هر لئیم دراز کنی؟ گفت:

دستْ دراز از پیِ یک حبّه سیم          بِهْ که ببرّند به دانگی و نیم

## حکایت [۲۸]

مشت‌زنی را حکایت کنند که از دهرِ مخالف به فغان آمده بود و حلقِ فراخش از دستِ تنگ به جان رسیده. شکایت پیشِ پدر برد و اجازت خواست که عزمِ سفر دارم، مگر به قوّتِ بازو کفافی به دست آرم.

فضل و هنر ضایع است تا ننماید          عود بر آتش نهند و مُشک بسایند

پدر گفت: ای پسر، خیالِ محال از سر به در کن و پای قناعت در دامنِ سلامت کش که بزرگان گفته‌اند: دولت نه به کوشیدن است، چاره کم جوشیدن است.

کس نتواند گرفت دامنِ دولت به زور          کوششِ بی‌فایده وسمه بر ابروی کور

***

چه کند زورمندِ وارون بخت؟          بازوی بخت بِهْ که بازوی سخت

پسر گفت: ای پدر، فوایدِ سفر بسیارست از نُزهتِ خاطر و جرِّ منافع و دیدنِ عجایب و شنیدنِ غرایب و تفرّجِ بُلْدان و مجاورتِ خُلاّن و تحصیلِ جاه و ادب و مزیدِ مال و مکتسب و معرفتِ یاران و تجربتِ روزگاران چنان که سالکانِ طریقت گفته‌اند:

تـــا لە دووکـــانو خـــانە دانـیشی هەرگیز تـۆ ئـەی خـاو نـابیتە ئینسان
بـــــڕۆ لە شـــاران بســـووڕێرەوە پێش ئەوەی دەرچی ڕۆژێ لە جیهان

باوك وتی: ئەی کوڕ کەڵكو سوودی سەفەر وەکوو وتت ژمارە ناکرێت، بەڵام بۆ پێنج تیرە ئەبێ:

**یەکەم**: بازرگانێ لەگەڵ نیعمەتو دەسەڵاتا خزمەتکارو کارەکەری زۆرو شاگردانی چوستو چابوکی هەیە. هەر ڕۆژە لە شارێ، وە هەر شەوە لە شوێنێ، وە هەر دەمە لە سەیرانگایەك، وە هەر ئانێ لە نیعمەتی خۆشی وەر ئەگرێت. (پارچە):

زەنگین لە شاخو دەشتو بیابان نـیـیە غـەریب
هەرجێیە چوو کـە خـەیمەی هـەڵداو بـارەگـا
بەڵام کەسێ لە ماڵی جیهان نەیبوو دەس ڕەس
بـا شــوێنـی خـۆی بـێ، نـەناسەو غـەریبە وا

**دووەم**: زانایەك بە وتاری شیرینو هێزی زمان ڕەوانیو دەسمایەی بەلاغەت، هەر جێیە بچێ [خەڵک] بۆ خزمەتی لە یـەك لە پێش کـەوتنیان ئـەویو گـەورەی ئـەگـرن. (پارچە):

وجوودی مەردومی دانـا چـەشنی زیـوو زەڕە
بە هەرچی شوێنێ کە چوو نرخو قیمەتی دێنن
کـە گـەورە زادەی نـادان لە شـارێ دامـاوە
بچێتە شـوێنـی غـەریبیش بـە هـیچی نـاسێنـن

**سێهەم**: جوان ڕوویەك کە دەروونی خاوەن دڵان ئارەزووی تێکـەڵیـیان ئـەکـات گەورەکان فەرموویانە: کەمێ لە جەماڵ چاترە لە زۆرێ لە مـاڵ. وە ئـەڵێن ڕووی جـوان مەڵحەمی دڵی نەخۆشەو کلیلی دەرگای بەستراوە. بێ‌گومان هاوڕێیـی ئـەو لە هـەموو شوێنێ بە تاڵانی ئەزانن، وە بە شانازییەوە خزمەتی ئەکەن.

دولبەر ئەوجێیە کە چوو عیززەت ئەبینێو حورمەت
بـاوكو دایکـیشی لە قـینا دەری کـەن لای خـۆیـان

تا به دکّان و خـانه در گـروی ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ هرگز، ای خام، آدمـی نشـوی
بـرو انـدر جـهان تـفرّج کـن، ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ پیش ازان روز کز جهان بـروی

پدر گفت: ای پسر، فوایدِ سفر این چنین که گفتی بسیارست ولیکن مسلّم پنج طایفه راست: نخستین بازرگانی که با وجودِ نعمت و مُکنت، غلامان و کنیزکانِ دلاویز و شاگردانِ چابک دارد، هر روز به شهری و هر دم در کنارِ نهری و هر ساعت به تفرّج‌گاهی و هر لحظه بر سرِ راهی، از نعیمِ دنیا متمتّع.

مُنعم به کوه و دشت و بیابان غـریب نـیست
هرجا که رفت خیمه زد و خـوابگـاه سـاخت
وان را که بـر مـرادِ جـهان نـیست دسـترس
در زادْبومِ خـویش غـریب است و نـاشناخت

دوم عالِمی که به منطقِ شیرین و مایه‌ی بلاغت و قوّتِ فصاحت هرجا که رَوَد به خدمتش اقدام نمایند و اکرام کنند.

وجودِ مردمِ دانا مـثالِ زرِّ طِـلی است ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ به هر کجا که رَوَد قدر و قیمتش دانند
بزرگ‌زاده‌ی نـادان بـه شَـهروا مـانَد ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ که در دیارِ غریبش به هـیچ نسـتانند

سوم خوب‌رویی که درونِ صاحب‌دلان به مخالطتِ او میل نماید. که حکما گفته‌اند: اندکی جمال به از بسیاری مال و گویند: روی زیبا مرهمِ دل‌های خسته است و کلیدِ درهای بسته؛ لاجرم صحبتِ او را همه جای غنیمت شناسند و خدمتش را منّت دانند.

شاهد آن جا که رود، عزّت و حـرمت بـیند
ور برانند به قـهرش پـدر و مـادرِ خـویش

دیم لەناو پەڕڕەیێ قورئان پەڕی تاوس، پێم وت

زیاتری قەدرتە ئەم پایە یە تۆو قورئان

وتی: بێدەنگبە ئەوی هەیبێ جەماڵێ، هەرجێ

دابنێ پێ کە لەسەر سینەیە بۆ ئەو دەستان

(پارچە):

کوڕ کاتێ ڕێكو پێك بوو هەبوو دولبەری لەوا

باکی نییە کە باوکی گەر لێی ببێ بەری

ئەو گەوهەرە بڵێ سەدەفی با لەگەڵ نەبێ

دووڕی یەتیم بە بێکەسی گشت کەسیە موشتەری[1]

**چوارەم**: دەنگ خۆش، بە پەردەی داوودی ئاو لە ڕۆیشتنو باڵندە لە فڕین بگێڕێتەوە، پاشان بە هۆی ئەو فەزڵەوە دڵی ئارەزوو مەندان نچیرکات. پیاوە بە مەعناکان بە هاورازی ئەو حەز ئەکەنو هەموو جۆرە خزمەتێکی ئەکەن. (شیعر):

| | |
|---|---|
| سَمْعِي اِلىٰ حُسْنِ الاَغانی | مَنْ ذَا الَّذِی جَسَّ الْمَثانِی |
| گوێم وا لە دەنگی گۆرانییەکی خۆش | کێ بوو ئەو کەسەی وا ئەیدا لە تار؟ |

* * *

چ خۆشە کە ئاهەنگی بەزمی حەزین

لە گوێی هاوڕێکانا لە مەستی بەیان

لە ڕووی جوان لەلام جوانترە دەنگی خۆش

بەشی نەفسە ئەو، ئەم بەڵا قووتی گیان

**پێنجەم**: [یا لایکەم،] پیشە سازێ بە کۆششی بازووی بەشی خۆی پەیداکات هەتا بۆ پاروو ئابڕووی نەتکێ، وەکوو گەورەکان فەرموویانە: (پارچە).

| | |
|---|---|
| گەر بۆ غەریبی دەربچێ لە شار | پینەچی نایبێ سەغڵەتو ئازار |
| ئەگەر لە جێی خۆی ببێ پەرێشان | سك برسی ئەنوێ پاشای زیستان |

---

(١) هەرچەن بچەقێ گەوهەر لە لیتە — دیسان گەوهەرەو بە نرخو پیتە،ـك.

پـــرِ طـــاووس دراوراقِ مـــصاحف دیـدم
گفتم: این منزلت از قدرِ تو مـی‌بینم بـیش
گفت: خاموش که هرکس کـه جـمالی دارد
هر کجا پای نـهد، دست نـدارنـدش پـیش

***

چـــون در پســـر مـــوافـقی و دلبـری بـوَد
انـدیشه نـیست، گـر پـدر از وی بـری بـوَد
او گوهرست، گو صـدفش در جـهان مـباش
درِّ یـــتیم را هـــمه کس مشـــتری بـــوَد

چهارم خوش آوازی که به حَنجره‌ی داودی آب از جریان و مرغ از طیران باز دارد. پس به وسیلتِ این فضیلت دلِ مشتاقان صید کند و اربابِ معنی به منادمتِ او رغبت نمایند و به انواع خدمت کنند.

سَـمْعی إلی حُسْـنِ ٱلْأَغـانی مَنْ ذَا ٱلَّـذی جَسَّ ٱلْـمَثانی؟

***

چـــه خـوش بـاشد آوازِ نـرمِ حـزین بـــه گـــوشِ حـریفانِ مستِ صَـبوح
بـه از روی خـوب است آوازِ خـوش که آن حظِّ نفس است و این قوتِ روح

یا کمینه پیشه‌وری که به سعی بازو کفافی حاصل کند تا آبروی به تحصیلِ نان ریخته نگردد، چنان که بزرگان گفته‌اند:

گر به غریبی رود از شـهرِ خـویش ســختی و مــحنت نـبرد پـینه‌دوز
ور بـــه خــرابـی فـتد از مـملکت گـــرسنه خـــفتد مَـــلِکِ نـــیم‌روز

ئەم بەیاناتەی دامێنی کوڕم لە سەفەرا هۆی خۆش ڕابواردن و دڵ کۆکییە. کەسێ لە مانە بێبەش بێ بە خەیاڵی بەتاڵ بە جیهانا ئەڕوا، وە کەسێ تر ناوونیشانی نابیسێ. (تاك):

کەسێ کە گەردشی گیتی بە قینی ئەو هەڵسا

بە غەیری مەسڵەحەتی ڕابەری ئەکاو ئەڕوات

(تاك):

کۆتر نابینێ هێلانەی بە چاو　　　باڵی پێ ئەگرێ قەزا بۆ لای داو

کوڕە وتی: ئەی بابە چۆن بەربەرەکانێ بکەم لە تەك وتاری حەکیمانا کە وتوویانە مووچە ئەگەرچی بەش کراوە، بەڵام پەیوەندی بە هۆوە هەیە، بەڵا ئەگەرچی کاتی بۆ دانراوە، بەڵام لە قاپی بۆ چوونەژووری خۆ پاراستن پێویستە.

(پارچە):

مووچە ئەگەر چی ئەگا بێ گومان　　　لای عەقڵ مەرجە بۆی گەڕێیت دەرها

گەرچی بێ ئاکام هیچ کەس نامرێ　　　نابێ بچیتە دەمی ئەژدەرها

لەم وێنەیەداکە من هەم لە فیلی دەمان ئەدەم، وە لەگەڵ شێری ژیان پەنجە بازی ئەکەم. جاکارسازی ئەوەیە سەفەر بکەم لەمە زیاتر توانای بێنەواییم نییە. (پارچە):

پیاو کە لە شوێن و جیگەی خۆی دوور کەوت

هەر جێ جێیەتی بۆچی غەم ئەخوات؟

هەر زەنگینێ شەو ئەڕواتە کۆشکێ

یانەی دەرویشە ئەو جێیەی شەوهات

ئەمەی وتو ماڵاوایی لە باوکی خواست و داوای هیممەتی لێ کرد. ڕۆیشت و لەبەر خۆیەوە ئەیوت: (شیعر).

هونەرمەند بەختی بە مەرام نەبێ　　　بڕواتە شوێنێ ناوی نەزانن

هەروەها ڕۆیشت تا گەیشتە ئاوێك لە تیژڕەوی‌یا بەردی بەسەر بەردا ئەدا، گرمەی فەرسەنگێ ئەڕۆیشت. (تاك):

چنین صفت‌ها که بیان کردم، ای پسر، در سفر موجبِ جمعیّتِ خاطرست و داعیه‌ی طیبِ عیش و آن که از این جمله بی‌بهره است به خیالِ باطل در جهان برود و کَسش نام و نشان نشنود.

هر آن که گردشِ گیتی به کینِ او برخاست
به غیرِ مصلحتش رهبری کند ایّام
کبوتری که دگر آشیان نخواهد دید
قضا همی بردش تا به سوی دانه و دام

پسر گفت: ای پدر، قولِ حکما را چگونه مخالفت کنم که گفته‌اند: رزق اگرچه مقسوم است، به اسبابِ حصولِ آن تعلّق شرط است و بلا اگرچه مقدورست از ابواب دخولِ آن، احتراز واجب.

رزق هر چند بی‌گمان برسد		شرطِ عقل است، جُستن از درها
ورچه کس بی‌اَجَل نخواهد مُرد		تو مرو در دهانِ اژدها

در این صورت که منم با پیلِ دَمان بزنم و با شیرِ ژیان پنجه در افگنم. پس مصلحت آن است، ای پدر، که سفر کنم که از این بیش طاقتِ بی‌نوایی ندارم.

چون مرد برفتاد ز جای و مَقامِ خویش
دیگر چه غم خورد همه آفاق جای اوست
شب هر توانگری به سرایی همی روند
درویش هر کجا که شب آمد سرای اوست

این بگفت و پدر را وداع کرد و همّت خواست و روان شد و با خویشتن همی گفت:

هنروَر چو بختش نباشد به کام		به جایی رَوَد کش ندانند نام

تا برسید بر کنارِ آبی که سنگ از صلابتِ او بر سنگ می‌آمد و آوازش به فرسنگ می‌رفت.

ئاوێکی بە سام مراو ترسێنێ          کەمتر شەپۆلی بەرداش قرتێنێ[1]

کۆمەڵە پیاوێکی چاو پێکەوت هەریەك بە پارەوە دانیشتبون لە بوارا، وە کۆمەڵی سەفەریان ڕێکخستووە. جوان دەستی بەخشینی بەسترا [بوو]، زمانی ستایشی کردەوە، هەرچەند زاریی کرد هاوڕێیی‌یان نەکرد. (تاك):

بێ زەڕ ناتوانی لە کەس بکەی زۆر          گەر زەڕت هەیە زۆری پێناوێ

مەلەوانی بێمرووەت پێی پێکەنی و ڕووی لێوەرگێڕا.

بێزەڕ لە دەلیا ناپەڕیتەوە          زوری دە پیاو نا، زەڕی یەك پیاوێ

جوان لە تانووتی مەلەوان دڵی هاتەوە یەك، ویستی تۆڵەی لێ بسێنێ، پاپۆڕ ڕۆییبوو، بانگی کرد ئەگەر بەم کراسە لە بەرمایە ڕازی ئەبی لام درێغ نییە. مەلەوان تەماع گرتی. پاپۆڕی گێڕایەوە.

تەماع ئەدروێ چاوی هۆشمەند          ئەپێچێ تەماع ماسیو مەل لە بەند

ئەوەندەی ڕیشو یەخەی گەیشتە چنگی نەوجەوان بۆ لای خۆی ڕاکیشا بێ ئەوە بەزەیی پیابێتەوە باشی کوتا. هاوڕێ لە پاپۆڕ دابەزی یاریدەی بدا درشتی دی، پشتی کردەوە.[2] ڕێکەوتن نەبێ چاریتریان نەزانی، لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن چاوپۆشی لێ بکرێ بۆ کرێ کەشتی. (پارچە):

کە پڕ قین ئەبینی تەوانا، خەکار          بە ئاسان ئەبەستێ دەری کارزار[3]

کە تیژی ئەبینی نەرم بە لە ڕێ          کە ئاورێشمی نەرم تیغی تیژ نایبڕێ

بە شیرین زمانی بە لوتفو خۆشی          تۆ ئەتوانی فیل بە موو ڕاکێشی

بە بیانوو هێنانەوە بۆ ڕابوردوو کەوتنە بەر دەستو پێی وە بە نیفاق چەند ماچێکیان لەسەرو ڕووی کردو بردیانە ناو پاپۆڕەو ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە پایەیەك لە ئاوەدانیی یونانا

---

(١) میسرەعی دووهەم لە فارسییەکەیدا بەم شێوەیە: «...کمترین موج آسیا سنگ از کنارش در ربودی». لەوە ئەچێ کوریەکەی وا بووبێ: کەمترین شەپۆلی بەرداش فڕێنێ،-ع.

(٢) پشتی کردەوە: یانێ مەلەوانەکە بەزاو، کۆڵی خوارد. بە ڕای من پشتی دا، بۆ تێگەیشتن لە مەبەست باشترە. «ك»

(٣) لە ئاستی پڕ زۆر، تاقەت بنوێنە          با گیانت نەچێ، دەم بقونجێنە،-«ك».

**سهمگین آبی که مـرغابی در او ایـمِن نـبودی**
**کمترین موج آسیاسنگ از کنارش در ربـودی**

گروهی مردمان را دید هرکس به قراضه‌ای در معبر نشسته و رختِ سفر بسته. جوان را دستِ عطا بسته بود زبانِ ثـنا بـرگشاد؛ چـندان کـه زاری کـرد یـاری نکـردند. مـلاّحِ بی‌مروّت از او به خنده برگردید و گفت:

**زر نداری نـتوان رفت بـه زور از دریـا　　زورِ دَه مَرده چه باشد؟ زرِ یک مَرده بیار**

جوان را دل از این طعنه به هم برآمد، خواست که از او انتقام کشد، کشتی رفته بود. آواز داد و گفت: اگر بدین جامه که پوشیده‌ام قناعت کنی، دریغ نیست. ملاّح طمع کرد و باز آمد.

**بدوزد شَـرَه دیـده‌ی هـوشمند　　درآرد طمع مرغ و ماهی به بند**

چندان که ریش و گریبانش به دستِ جوان افتاد، به خـود درکشـید و بـی‌محابا فـرو کوفت. یارش از کشتی به در آمد که پشتی کند هم‌چنین درشتی دید پشت بگـردانـید. مصلحت آن دیدند که با او به مصالحت گرایند و به اجرتِ کشتی مسامحت نمایند.

**چـو پـرخـاش بـینی تـحمّل بـیار　　کـه سـهلی بـبندد درِ کـارزار**
**لطافت کن آن جـا کـه بـینی سـتیز　　نـبرّد قـزِ نـرم را تـیغِ تـیز**
**به شیرین زبانی و لطـف و خـوشی　　توانی کـه پـیلی بـه مـویی کشـی**

به عذرِ ماضی در قدمش فتادند و بوسه‌ای چند به نفاق بر سر و چشمش دادند و به کشتی درآوردند و روان شدند تا برسیدند به ستونی از عمارتِ یونان در آب ایستاده.

کە لە ئاوا ڕاوەستا بوو، پاپۆڕەوان وتی: پاپۆڕ قۆرتێکی تێ کەوتووە یەکێ لە هەموان بەهێزتر بچێتە سەر ئەو پایەیە جڵەوی پاپۆڕەکە بگرێت تا چاکی بکەمەوە. جوان بە سەرکەشی دلاوەریی کە لە سەریا بوو لە دوژمنی ڕەنجاو نەترساو بە وتاری حەکیمانە ئیشی نەکرد کە وتوویانە: هەرکەسێ ڕەنجێکت بە دڵ گەیاند ئەگەر دوا بە دوای سەد ڕەحەتی بدەیتێ لە تۆڵەی ئەو ڕەنجە دڵنیا مەبە چونکە تیر لە برین دێتەدەر بەڵام ئازاری لە دڵا ئەمێنێ. (تاك):

دوو کۆیلەی بەگی وتیان بە یەکتر      دوژمنت ڕەنجان بترسە ئیتر[١]

(پارچە):

دڵنـــیا تـــۆ مـــەبە لە دڵتـــەنگیت      کە بە دەستت کەسێکت کرد دڵتەنگ
بەرد مەهاوە دیواری شووشەی کەس      تـا لە دیـوارەوە نـەیەت بـۆت سـەنگ

ئەوەندە جڵەوی لە قۆڵیەوە ئاڵاندو چووە سەر پایەکە، پاپۆڕەوان جڵەوی لە دەست پچڕاندو پاپۆڕی لێ خوڕی. بێچارە سەرسام مایەوە، یەك دوو ڕۆژ بەڵاو سەختی کێشاو سەغڵەتی دی، سێهەم ڕۆژ خەو یەخەی گرتو خستیە ئاوەوە. شەوو ڕۆژێکی‌تر کەوتە کەنار، کەمێ گیانی تیا مابوو کەوتە خواردنی گەڵای دارو درەختو بنکەگیای دەرئەهێنا تا تۆزێ هێزی هاتەبەر، سەری لە بیابانا نایەوە ڕۆیشت هەتا تینوو بێ توانا بوو گەیشتە سەر چاڵێ. تیرەیەك ئاویان ئەخواردەوە بە پارە. جوان پارەی نەبوو، بێچارەیی نواند، دڵیان بۆ نەرم نە بوو، دەسی دایە دەس درێژی چەند کەسێکی کوتا، زۆریان بۆ هێنا بەسەریا زاڵ بوون، بێ بەزەیی پیاهاتنەوە لێیاندا تا بریندار بوو. (پارچە):

میشوولە زۆر بوو فیل بێ لێی ئەدەن      لەگەڵ ئەو هەموو مەردیو ڕەق بەدەن
مـــێلـــوورە وردە ئـەگـەر ڕێ کـەون      شێری ژیان بێ پێستی دەرئەکەن[٢]

بە ناچار کەوتە دوای کاروانێ. ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شوێنێکی پڕ ترس لە دزان سەیری کرد کاروانیەکان لەرزیان لێ هاتووە دڵیان داناوە بۆ فەوتان. وتی: مەترسن لە

---

(١) لە ئەسڵا، بەگتاشو خەیلەتاشە. «ع.م».

(٢) بـە بـەردە وردە تـەیری ئـەبابیل      ڕۆژی کـرد بـە شـەو لە یارانی فیل
لە قـەترەی بـاران بـەدی هـاتن چـەم      دەبن بە دەلیا چەن چەم ببن جەم».«ك».

ملاّح گفت: کشتی را خللی هست؛ یکی از شما که دلاورترست و زورمندتر باید که بر این ستون برود و خطامِ کشتی بگیرد تا عمارت کنیم. جوان به غرورِ دلاوری که در سر داشت، از خصمِ دل‌آزرده اندیشه نکرد و قولِ حکما که گفته‌اند: هرکه را رنجی به دل رسانیدی اگر در عقبِ آن صد راحت برسانی از پاداشِ آن یک رنج ایمن مباش که پیکان از جراحت به در آید و آزار در دل بماند.

مشو ایمن، که تنگ‌دل گردی چون ز دستت دلی به تنگ آید
سنگ بر باره‌ی حصار مزن که بوَد کز حصار سنگ آید

چندان که مِقوَدِ کشتی به ساعد بر پیچید و به بالای ستون بر رفت، ملاّح زمام از کَفَش درگسلانید و کشتی براند. بی‌چاره متحیّر بماند، روزی دو بلا و محنت کشید و سختی دید، سوم روز خوابش گریبان گرفت و در آب انداخت. بعد از شبان‌روزی بر کنار افتاد از حیاتش رمقی مانده. برگِ درختان خوردن گرفت و بیخِ گیاهان برآوردن تا اندکی قوّت یافت. سر در بیابان نهاد و همی رفت تا تشنه و بی‌طاقت بر سرِ چاهی رسید، قومی بر او گرد آمده شربتی آب به پشیزی همی آشامیدند. جوان را پشیزی نبود، طلب کرد ابا کردند، بی‌چارگی نمود رحمت نیاوردند، از بی‌طاقتی دستِ تعدّی دراز کرد میسّر نمی‌شد، تنی چند را فرو کوفت. مردان جمع آمدند و چندان بزدندش که مجروح شد.

پشّه چو پُر شد، بزند پیل را با همه مردیّ و صلابت که اوست
مورچگان را چو بوَد اتّفاق شیرِ ژیان را بدرانند پوست

به حکمِ ضرورت خسته و مجروح در پیِ کاروانی افتاد و برفت. شبانگه برسیدند به مَقامی که از دزدان پر خطر بود. کاروانیان را دید لرزه بر اندام افتاده و دل بر هلاک نهاده.

ناوتانا من یەکێکم بەرامبەریی پەنجا پیاوتان بۆ ئەکەم. گەنجەکانی تریش کۆمەك بکەن. ئەمەی وت کاروانی بە گەزافی ئەو بەهێز بوونو بە هاوڕیی ئەو شادمانی‌یان نواند، بەخواردنو ئاو دەسگرۆیی‌یان بە پێویست زانی. جوان ئاگری مێعدەی بەرز بووبووە، جڵەوی توانای لە دەس دەرچووبوو، چەند پارووبەکی بە ئارەزوو خواردو چەند کاسە ئاوی بە دوادا خواردەوە. دێوی دەروونی سرەوتو نووست. پیرەمێردێکی جیهان دیدە لە کاروانەکەدا بوو وتی: ئەی کۆمەڵ من لەم دواکەوتوویی ئێوەیە لە ترسدام زیاتر لە دزان، وەکوو ئەگێڕنەوە غەریبێك[1] چەند درەمێکی کۆکردبوەوە بەشەو لەترسی قەرەج لە ماڵا نە ئەنووست، یەکێکی لە دۆستانی خۆی بانگ کردە لای خۆی هەتا بە دیداری ئەو تەنیایی نەمێنێ، شەو لەلای بوو ئەوەندە بە درەمەکانی زانی بردنی خواردنیو ڕۆیی بۆ سەفەر. بەیانی غەریبەکەیان دی ئەگریا بە ڕووتی، لێ‌یان پرسی: مەگەر درەمەکانت دز بردنی؟ وتی: نە بە خوا دوواکەوتوو بردی. (پارچە):

| | |
|---|---|
| دانەنیشتووم بە دڵنیایی لە دۆست | پێم نەزانیبێ خووڕەوشتی تەواو |
| دوژمنێ زامی دانی بەد ترە وا | خۆی بە دۆستی بەرێتە چاوی پیاو |

چی ئەزانن ئەگەر ئەمەش لە کۆمەڵی دزان بێو بە فێڵ لە ناو ئێمەدا ئامادە کرابێت، هەتا لە کاتێکی هەلا یارانی ئاگادار بکات من وا ڕێك ئەبینم کە ئەمە بە نووستوویی بە جێ‌بێڵینو بارکەین. جوانان پەندی پیریان لا پتەو بوو، وە سامێکی گەورەیان لە مست وەشێن چووە دڵ. باریان کردو جوانیان بە نووستوویی بەجێ‌هێشت کاتێ بێدار بوو ڕۆژ لەسەرشانی هەڵاتبوو، سەری هەڵبڕی دی کاروان ڕۆیشتووە، بێچارە گەلێ گەڕا ڕێی نەبردە هیچ شوێنێك. بێ‌نەوا ڕووی نایە سەر خاكو دڵ لەسەرفەوتانو وای وت:

| | |
|---|---|
| مَن ذا يُحَدِّثُنِي وَ مَرَّ الْعِيْسُ | ما لِلْغَرِيبِ سِوَى الْغَرِيبِ اَنِيسُ |
| کێم لەگەڵ بدوێ وا ڕۆیی کاروان | بێ‌یارە غەریب مەر لە غەریبان |

(تاك):

| | |
|---|---|
| لەسەرغەریبان ناکا زەبرو زۆر | کەسێ نەیدیبێ مەر غەریبی زۆر |

(۱) لە نووسخەی تردا عەرەبێك نووسراوە. «ع.م».

گفت: اندیشه مدارید که یکی منم در این میان که به تنها پنجاه مرد را جواب گویم و دیگر جوانان هم یاری کنند. مردمِ کاروان را به گفتِ او تهوّر زیادت گشت و به صحبتِ او شادمانی کردند و به زاد و آبش دستگیری واجب دانستند. جوان را آتشِ معده بالا گرفته بود و عنانِ طاقت از دست رفته؛ لقمه‌ای چند از سرِ اشتها تناول کرد و دمی چند آب از پیِ آن بیاشامید تا دیوِ درونش بیارامید. خوابش در ربود و بخفت. پیرمردی جهان‌دیده در آن کاروان بود گفت: ای یاران، من از این بدرقه‌ی شما اندیشناکم نه چندان که از دزدان، چنان که حکایت کنند که اعرابیی را درمی چند گرد آمده بود و به شب از تشویشِ لوریان در خانه تنها خوابش نمی‌بُرد. یکی را از دوستان برِ خویش آورد تا وحشتِ تنهایی به دیدارِ او منصرف کند. شبی چند در صحبتِ او بود؛ چندان که بر دِرَم‌هاش وقوف یافت، ببرد و بخورد و سفر کرد. بامدادان دیدندش غمگین و گریان کسی گفتش: حال چیست مگر آن دِرم‌های تو را دزد بُرد؟ گفت لاَ وَاللّٰه بدرقه بُرد.

هرگز ایمن ز مار ننشستم　　که بدانستم آن چه خصلتِ اوست
زخمِ دندانِ دشمنی بترست　　که نماید به چشمِ مردم، دوست

چه دانید اگر این هم از جمله‌ی دزدان است و به عیّاری در میانِ ما تعبیه شده است تا به وقتِ فرصت یاران را خبر دهد. مصلحت آن می‌بینم که او را خفته بمانیم و برانیم. یاران را نصیحتِ پیر استوار آمد و مهابتی از مشت‌زن در دل گرفتند. رخت برداشتند و جوان را خفته بگذاشتند. آن گه خبر یافت که آفتابش به سر تافت. سر برآورد و کاروان رفته دید، بی‌چاره بسی بگردید و ره به جایی نبرد؛ تشنه و بی‌نوا روی بر خاک و دل بر هلاک نهاد و می‌گفت:

مَنْ ذَا یُحَدِّثُنی وَ زُمَّ اَلْعیسُ　　ما لِلْغَریبِ سِوَی اَلْغَریبِ أَنیسُ

***

درشتی کند بر غریبان کسی　　که نابوده باشد به غُربت بسی

بێنەوا لەم وتارەدا بوو پادشا زادەیەك لە ڕاو لە لەشکەر دوور کەوتبووە، لە ژوور سەری وەستاوە گوێی لەم وتارەوەیەو تەماشای شێوەی ئەکا. شێوەیەکی جوانی دی‌و حاڵێکی پەرێشان لێی‌پرسی: لەکوێ‌وە دێیت‌و لێرەدا چۆن کەوتوویت؟ بەشێکی لە حاڵی خۆی بۆ گێڕایەوە. شازادە بەزەیی بە پەرێشانی‌یا هاتەوە، خەڵات‌و بەخششی دایەو پیاوێ تایبەتیی لەتەکا نارد، هەتا بردیانەوە بۆ شاری خۆی. باوکی [و دایکی] بە چاوپێ‌کەوتنی شادمان بوون، وە بۆ سەلامەتی [حاڵیان] سوپاسی[یان] بەجێ‌هێنا. کاتی شەو ئەوەی بەسەریا هاتبوو لە حاڵی کەشتی‌و ستەمی کەشتییەوان‌و جەوری فەللاحەکانی دەوری ئاوەکەو غەدری کاروانی لە ڕێگە بۆ باوکی گێڕایەوە. باوکی وتی: ئەی کوڕم! پێم نەوتی لە کاتی ڕۆیشتنا کە دەست بەتاڵ، دەستی دلێران بەستراوەو پەنجەی شێر شکاوە.[(١)] (شیعر):

خۆشی وت بەتاڵ‌دەستی سیلاح‌شۆر  دەنکێ زەڕ چاکە نەك حەفتا مەن زۆر

کوڕ وتی: ئەی بابە هەتا ڕەنج نەدەیت گەنج وەرناگریت. هەتا گیان نەخیتە ترسەوە بە سەر دوژمنا زاڵ نابیت. هەتا دەنك بڵاونەکەیتەوە خەرمان هەڵناگریت. نابینی بەکەم مایە ڕەنجێ کە کێشام چ ڕەحەتییەکم دەس‌کەوت، وە بە ئازارێ خواردم چەندم هەنگوین هێنایەوە؟. (تاك):

گەرچی لە مووچەت زیاتر پێ ناخورێت  بۆ دەست کەوتنیش خۆ سستی نابێ

(تاك):

غەوواس گەر ترسی دەمی نەهەنگ بێ

قەت دوورڕی گران بە چنگی ناگا

بەرد ئاشی ژێروو ناجوڵێ، بێ‌گومان باری گران ئەگریتە سەرشان. (پارچە):

چی بخوا لە غار شێری دڕندە  یا بازی کەوتوو چی بە قووت ئەبێ
لە ناو خانوودا ئەگەر بکەی ڕاو  دەست‌و پێت عەینی عەنکەبووت ئەبێ[(٢)]

---

(١) لە نووسخەکەی بەردەستی ئێمەدا ئاوا نووسراوە: «تهیدستان را دست دلیری بسته است و پنجەی شیری شکسته» واتە: هەژاران دەستی دلێریان بەسراوە و پنجەی شێریان شکاوە»ـع.
(٢) لە حەوش‌و ماڵ هەرکەسێ بەنە  مێشە ڕاو ئەکا وەك جۆلاتەنە»ـ«ك».

در این سخن بود که پادشازاده‌ای به صید از لشکریان دور افتاده بود و بر بالای سرش ایستاده، می‌شنید و در هیأتِ او می‌نگرید. صورتِ ظاهرش پاکیزه دید و صورتِ حالش پریشان. گفت: از کجایی و بدین جایگاه چون افتادی؟ برخی از آن چه بر سرش گذشته بود اعادت کرد. مَلِک‌زاده بر حالِ تباهِ وی رحمت آورد؛ خلعت و نعمت دادش و معتمدی با وی روان کرد تا به شهرِ خویش باز بردند. پدر و مادر به دیدنِ او شادمانی کردند و بر سلامتِ حالش شکر گفتند. شبانگه آن چه بر سرِ او گذشته بود از حالِ کشتی و جورِ ملاّح و جفای روستاییان بر سرِ چاه و غدرِ کاروانیان با پدر می‌گفت. پدر گفت: ای پسر، نگفتمت هنگامِ رفتن که تهی‌دستان را دستِ دلیری بسته است و پنجه‌ی شیری شکسته؟

چه خوش گفت آن تهی‌دستِ سلحشور

جوی زر بهتر از پنجاه من زور

پسر گفت: ای پدر هر آینه تا رنج نبری گنج برنداری و تا جان بر خطر ننهی بر دشمن ظفر نیابی و تا دانه پریشان نکنی خرمن برنگیری؛ نبینی به اندک مایه رنجی که بردم چه تحصیلِ راحت کردم و به نیشی که خوردم چه مایه عسل آوردم؟

گرچه بیرون ز رزق نتوان خورد　　　در طلب کاهلی نشاید کرد

***

غوّاص اگر اندیشه کند کامِ نهنگ　　　هرگز نکند درِّ گران‌مایه به چنگ

آسیاسنگِ زیرین متحرّک نیست لاجَرَم تحمّلِ بارِ گران می‌کند.

چه خورد شیرِ شرزه در بُنِ غار؟　　　بازِ افتاده را چه قوت بوَد؟

گر تو در خانه صید خواهی کرد　　　دست و پایت چو عنکبوت بوَد

باوك بە كوڕی وت: تۆ لەم جارەدا فەڵەك یاوەری كردی، وە دوا ڕۆژ [و بەخت] ڕابەری، كە خاوەن سامانێ گەیشتە سەرتوو بەخشایشی دایتێو حاڵی تێشكاوی تۆی خستەوە جێ. ڕێكەوتی وا نایابەو كەم، وە لەسەر نایابو كەم حوكمو بڕیار دانامەزرێت.

ڕاوكەر هەمووجار شوغالێ ناگرێت　　ئەبێ جارێكیان پڵنگ بیدڕێ[1]

وەكو یەكێ لە پادشایانی فارس نقیمێكی گران نرخی لە ئەنگوستیلەدا بوو، جارێك بۆ سەیران لەگەڵ چەند كەسێكی تایبەتیی بۆ موسەللای شیراز چوونە دەرەوە، فەرمووی كە ئەنگوستیلەكەیان لەسەرگومەزی «عەزود»[2] ـكە یەكێ بوو لە پادشایانی شیراز ـ دانا، هەتا هەركەس تیر لە كونی ئەنگوستیلەوە دەركا ئەنگوستیلە هی ئەوە. چوارسەد تیرئەنداز لە خزمەتیا بوو تیریان تێ ئەگرت هیچی لێوە نەچووەدەر، هەتا منالێ لە سەربانی خانووەو یاری بە تیر ئەكردو تیری بۆ هەر لایە ئەهاویشت. بای سەباتیری ئەوی لە كونی ئەنگوستیلەوە دەركردو بەخشش و خەلاتی وەرگرت و ئەنگوستیلەیان بە خۆڕایی دایە. ئەگێڕنەوە كە كوڕە تیروكەوانەكەی سووتاند. لێیان پرسی: بۆچی وات كرد؟ وتی: هەتا ڕەونەقی یەكەمجار لە جێی خۆی بمێنێ. (پارچە):

زۆر ئەبێ حەكیم ڕووناك بیرو هۆش　　بۆی ڕێك ناكەوێ بكا تەدبیرێ
جاری وا هەیە منالێ نەفام　　بە غەڵت بدا لە هەدەف تیرێ

## چیرۆك (۲۹)

بیستم دەروێشێ لە ئەشكەوتێكا دانیشتبوو، وە قاپیی لەسەر هەموو ئەهلی جیهان داخستبوو، پادشایانو دەوڵەمەندان لە چاوی هیممەتیا شەوكەتو سامانیان نەبوو. (پارچە):

ئەوەی كردیەوە قاپیی سواڵ لە خۆی　　هەتاكوو ئەمرێ ئەیمێنێ نیاز
لە حیرس وازبێنەو پادشایی كە　　بێ تەماع گەردن بەرزەو سەرفراز

---

(۱) شوغال: شوگال، چەقەڵ. «ع.م».
(۲) عضدالدولة. «ع.م».

پدر گفت: ای پسر، در این نوبت، تو را فلک یاوری کرد و اقبال رهبری تا صاحب دولتی به تو رسید و بر تو ببخشایید و کسرِ حالِ تو را به تفقّدی جبر کرد و چنین اتّفاق نادر افتد و بر نادر حکم نتوان کرد. زینهار! تا بدین طمع دگرباره گردِ وَلَع نگردی.

صیّاد نه هربار شغالی ببرَد — افتد که یکی روز پلنگش بدرد

چنان که حکایت کنند که یکی از ملوکِ پارس، حَرَسَهَا ٱللّٰهُ تَعالیٰ، نگینی گران مایه در انگشتری داشت. باری به عزمِ تفرّج با تنی چند خاصّان به مصلاّی شیراز بیرون رفت، فرمود تا انگشتری بر گنبدِ عضد نصب کردند تا هرکس که تیر از حلقه‌ی انگشتری بگذراند، خاتم او را باشد. اتفاقاً چهارصد حُکم‌انداز که در خدمتِ وی بودند، جمله خطا کردند مگر کودکی که بر بامِ رباطی به بازیچه تیر از هر طرف می‌انداخت؛ بادِ صبا تیرِ او از حلقه‌ی انگشتری بگذرانید و خلعت و نعمت یافت و خاتم به وی ارزانی داشت. پسر تیر و کمان بشکست. گفتند: چرا بشکستی؟ گفت: تا رونقِ آن بر جای بمانَد.

گه بوَد کز حکیمِ روشن‌رای — برنیاید دُرستْ تدبیری
گاه باشد که کودکی نادان — به غلط بر هدف زند تیری

## حکایت [۲۹]

درویشی را شنیدم که در غاری نشسته بود و در به روی از مردم بسته و ملوک و اعیان را در چشمِ همّت او شوکت و هیبت شکسته.

هرکه بر خود درِ سؤال گشاد — تا بمیرد، نیازمند بوَد
آز بگذار و پادشاهی کن — گردنِ بی‌طمع، بلند بوَد

یەکێ لە پادشایانی ئەو دەورە پێی وت: هیوام بەکەرەمی ڕەوشتی مەردان وەهایە کە بۆ نان خواردنێك بڕیار بفەرموون، شێخ ڕازی بوو لەبەر ئەوە قبووڵ کردنی دەعوەت سوننەتە. جارێکی تر پادشا بۆ سوپاسی هاتنی چووەلای شێخ لە جێی خۆی ڕاپەڕی پادشای گرتە باوەش، بەنەرمی سەنا لەگەڵیا دوا، کە ڕۆیشت یەکێ لێی پرسی: کە شێخ ئەوندەی ئەمجارە لوتفو نەرمی بۆ پادشا نواند ڕێکی شێوەی نەبوو، وە لێم نەدیوە، وتی: ئەی نەت بیستووە کە خاوەن دڵان وتوویانە: (تاك).

کەسێ دانیشتی تۆ لەسەرخوانی    پێویستە ـکە هات ـ لە بەر هەڵسانی

(مەسنەوی):

چاو کە ئەتوانێ نەکا سەیری باغ    بێ گوڵو نەسرین، هەڵئەکا دەماغ
لە ژوور سەر نەبێ تووکی قوو یا پەڕ    ئەتوانی بنوی بەردێ لە ژێر سەر
گەر دولبەر نەبێ بە هاوخەو لە شەو    ئەتوانی دانێیت دەس لە کۆش بۆ خەو
سکی بێ هونەر کەوا پێچ پێچ هات    ناتوانێ بە هیچ کە بکا قنیات

یکی از ملوکِ آن طرف اشارت کرد که توقّع به کرم و اخلاقِ عزیزان است که به نمک با ما موافقت کند. شیخ رضا داد، به حکمِ آن که اجابتِ دعوت سنّت است. دیگر روز مَلِک به عذرِ قدمش رفت. عابد بر پای خاست و مَلِک را در کنار گرفت و شکر و ثنا گفت و دعا و آفرین کرد. چون غایب شد، یکی از اصحاب گفت شیخ را که چندین ملاطفت که امروز با پادشاه کردی خلافِ عادت بود؛ در این چه سرّ‌ست؟ گفت: نشنیدی که گفته‌اند:

هرکه را بر بساط بنشستی　　واجب آمد به خدمتش برخاست

***

گوش تواند که همه عمرِ وی　　نشنود آوازِ دف و چنگ و نی

دیده شکیبد ز تماشای باغ　　بی‌گُل و عنبر به سر آرد دِماغ

ور نبوَد بالشِ آگنده پر　　خواب توان کرد، سَفَط زیرِ سر

ور نبوَد دلبرِ همخوابه پیش　　دست توان کرد در آغوشِ خویش

وین شکمِ بی‌هنرِ پیچ‌پیچ　　صبر ندارد که بسازد به هیچ

## بەندی چوارەم:

# کەڵك و سوودی بێدەنگی

### چیرۆك (١)

بە یەکێ لە دۆستانی خومم وت: بۆیە بێدەنگیم لەلا باش هات چونکە لە وتارا چاکی و خراپی ئەبێ، وە دوژمن خراپی نەبێ نابینێ. وتی: ئەی برادەر دوژمن وا چاکەش نەبینێ.

وَ اَخُو الْعَداوَةِ لایَمُرُّ بِصالِحٍ      اِلّا وَ یَلْمِزُهُ بِکَذّابٍ أَشِرِ

بەلای پیاوچاکا نەڕۆیوە دوژمن      مەر ناوی نابێ بەد و درۆزن

(تاك):

هونەر عەیبێکە زل بۆ چاوی دوژمن      گوڵە سەعدی و لە چاوی دوژمنان خار[1]

(تاك):

رۆژ ئەنێرێ ڕووناکی بۆ گیتی      ناشیرینە لە چاوی مشکی کوێر

### چیرۆك (٢)

بازرگانێ هەزار دیناری زیان لێکەوت، بەکوڕی خۆی وت: نابێ لەگەڵ کەسا ئەم

---

(١) هونەوەر خۆری بێ گەرمایە ئەوڕۆ      بەتایبەت لای بڕێ بێ تانو بێ پۆ
لە حەوزی لیخنا خۆر بێ تەوژمە      شەمەکوێرە چوزانێ ڕۆژ چییەو بۆ؟-«ك».

باب چهارم:

## در فواید خاموشی

### حکایت [۱]

یکی را از دوستان گفتم: امتناعِ سخن گفتنم به علّتِ آن اختیار افتاده است که غالبِ اوقات در سخن نیک و بد اتّفاق افتد و دیده‌ی دشمنان جز بر بدی نمی‌آید. گفت: دشمن آن بِهْ که نیکی نبیند.

وَ أَخُو اَلْعَداوَةِ لاَ یَمُرُّ بِصالِحٍ　　　إِلَّا وَ یَلْمِزُهُ بِکَذّابٍ أَشِرْ

***

هنر به چشمِ عداوت بزرگ‌تر عیب است

گُل است سعدی و در چشمِ دشمنان خارست

***

نورِ گیتی‌فروزِ چشمه‌ی هور　　　زشت باشد به چشمِ موشکِ کور

### حکایت [۲]

بازرگانی را هزار دینار خسارت افتاد. پسر را گفت: باید که این سخن با هیچ‌کس در

وتەیە بێنیتە ناو. کوڕ وتی: بابە فەرمانی تۆیە نایڵێم، بەڵام ئەبێ بەسەر کەڵکیا ئاگادارم کەیت، لە شاردنەوە ڕێکی چی هەیە؟ وتی: ئەوەیە قەوماو نەبێ بە دوو، یەکێ زیانی ماڵ، دووهەم پێخۆش بوونی دراوسێ. (تاك):

مەڵێ سەغڵەتیی خۆت لەلای دوژمنان          کە (لاحولَ) بۆ تۆ ئەڵێو شادمان

## چیرۆك (٣)

جوانێکی هونەرمەند لە هونەرا بەشێکی زۆری هەبوو، وە تەبێعەتێکی ورد. کە لە ئەنجومەنی دانایانا دائەنیشت زمانی وتاری ئەبەست. باوکی پێی‌وت: ئەی کوڕم! تۆیش ئەوەی ئەی زانی بیڵێ. وتی: ئەترسم لەوەی نایزانم لێم بپرسن‌و شەرمەزاری بەرم. (پارچە):

بیستت سۆفی‌یەك پێڵاوەکانی          بزمارێژ ئەکرد، کاتێ ڕوانی
سەرهەنگ یەخەی گرت وتی بابڕۆین          هێسرم بۆ ناڵ کە، دیارە ئەیزانی

(تاك):

دەنگ نەکەی هیچ کەس کاری پێت نییە

دەنگت کرد ئەبێ دەلیل حازر کەی

## چیرۆك (٤)

زانایەکی گەورە بەریەرەکانێی بوو لەگەڵ مولحیدێك (لەعنەتی خوا لە یەکە یەکەیان) بێ دەلیل دەرەقەتی نەهات، سوپەری فڕێداو ڕووی وەرگێڕاو ڕۆیشت. یەکێ پێی‌وت: تۆ بەم هەموو زانایی‌و فەزڵ‌و ئەدەبەوە لەگەڵ بێدینێکا دەلیلت نەما؟ وتی: زانایی من لە قورئانایەو فەرموودەکانی پێغەمبەر، سەلامی خوای لەسەربێ، وە لە فەرموودەی مەشایخەکانا ئەو بەمانە هیچی باوەڕی نییەو نایبێت، منیش بیستنی کوفری ئەو بە کەڵکی چیم دێ؟. (شیعر):

کەسێ تۆ لێی نەبی ڕزگار بە قورئان‌و حەدیس

هەر ئەوە چاکە وەڵامی، کە وەڵامی نەدەی

میان ننهی. گفت: ای پدر، فرمان تو راست ولیکن می‌خواهم که بدانم در این چه مصلحت است؟ گفت: تا مصیبت دو نشود: یکی نقصانِ مایه، و دیگر شماتتِ همسایه.

مگوی اندُهِ خویش بـا دشـمنان  که لاحَول گـویند شـادی کـنان

## حکایت [۳]

جوانی خردمند از فنونِ فضایل حظّی وافر داشت و طبعی نافر، چندان که در محافلِ دانشمندان نشستی سخن نگفتی. باری پدرش گفت: ای پسر، تو نیز آن چه دانی بگوی. گفت: ترسم که بپرسندم از آن چه ندانم و شرمساری برم.

آن شنیدی کـه صـوفیی مـی‌کوفت  زیـرِ نـعلینِ خـویش مـیخی چـند؟
آســـتینش گـــرفت ســـرهنگی  کـــه: بـــیا نـعل بـر ستوری بـند

## حکایت [۴]

یکی از علمای معتبر را مناظره افتاد با یکی از ملاحده، لَعَنَهُمُ اللّٰهُ عَلَیٰ حِدَة، و بـه حُجّت با او برنیامد؛ سپر بینداخت و برگشت. کسی گفتش: تو را با چندین علم و فضل با بی‌دینی حجّت نماند؟ گفت: علمِ من قرآن است و حدیث و گفتارِ مشایخ و او بـدین‌ها معتقد نیست و نمی‌شنود؛ مرا به شنیدنِ کفرِ او چه حاجت؟

آن کس که به قرآن و خـبر زو نـرهی  آن است جوابش که: جـوابش نـدهی

## چیرۆك (٥)

جالینووس بێبڕوایەکی دی دەستی لە یەخەی دانایەك توند کردبوو، وە بێحورمەتی پێئەوت. وتی: ئەگەر ئەمە دانا بوایە ئیشی نەئەگەیاندە ئەم جێیە لەگەڵ ئەم نادانـەدا. (مەسنەوی):

لە نـێوانـی دوو عـاقڵ نـابێ پـەیکار | کە دانایش تیژی ناکا بۆ کەم و خوار
نـەفامێ گـەر بڵێ سـەختی بـە گـەرمی | دڵی دێنـێتـەجێ دانـا بـە نـەرمی
دوو خاوەن دڵ ئەکەن موویەك نیگەهدار | وەهـایە سـەرکەشێك و ئـاشتیی یـار
کـە هـەر دوو لا نـەفام بـن، تینێ بێنن | ئەگـەر زەنـجیرێ بـێ بـاش ئـەیپسێنن
جـنێوی دا بـە پـیاوێ، نـاشیرن ڕوو | لە شانی گرت وتی ئەی چاك و پاك خوو
لەوە مـن بـەدترم تـۆ پـێی ئـەزانـی | وەکو خۆم عەیبی من تۆ چۆن ئەزانی؟[1]

## چیرۆك (٦)

سەحبانی وائیلیان لە زمانڕەوانیو فەساحەتدا بێوێنە داناوە لەبەر ئەوە ساڵێ لەسەر کۆمەڵێ دواو وتاری دووبارە نەکردەوە ئەگەر ئەوە ڕێکەوتایە بە شێوەیەکیتر ئەیوت، وە ئەمە یەکێکە لە ئەدەبی بەردەمی شاهان. (مەسنەوی):

وتەگەرچی دڵبەندو شیرین ئـەبێ | کە شایانی تەسدیقو تەحسین ئـەبێ
کە جـارێ وتت مـەیکە ئیتر دووبـار | کە حەڵوا خورا جارێ ناڵێن دووجـار

## چیرۆك (٧)

لە یەکێ لە حەکیمانم بیست ئەیوت: هەرگیز کەسێ بە نەزانیی خۆیـا دانـینەناوە، مەگەر کەسێ، یەکێ لە وتەدابێو پێش ئەوە ئەو لێ بێتەوە ئەم دەست پێبکا.

عـاقڵ! هـەیەتی وتـار سـەرو بـن | وتـەت مـەهێنـە نـاوەندی وتـن
کەسێ خاوەنی هۆشو فـەرهەنگە | ناڵێ، نەبینێ خەڵکی بـێدەنگـە[2]

---

(١) ئەگەر عەیبی منت وەك خۆم ئەزانی    لە بۆ ئـەژماری، خـێڵێکت ئـەهانی،ـ«ك».
(٢) واتە: تا نەبینێ خەڵکی بێدەنگە، نایەتە وتار «ع».

## حکایت [۵]

جالینوس ابلهی را دید دست در گریبانِ عالمی زده، و بی‌حرمتی همی کرد. گفت: اگر این دانا بودی کارِ او با نادان بدین جایگه نرسیدی.

دو عـاقل را نـباشد کـین و پـیکار — نـه دانـایی سـتیزد بـا سـبکسار
اگر نادان به وحشت سخت گـوید — خـردمندش بـه نـرمی دل بـجوید
دو صـاحب‌دل نگـه دارنـد مـویی — هـمیدون سـرکشی و آزرم‌جـویی
وگـر بـر هـردو جـانب جـاهلانند — اگـر زنـجیر بـاشد بگسـلانند
یکـی را زشت‌خـویی داد دشـنام — تحمّل کرد و گفت: ای خوب فرجـام
بتر زانـم کـه خـواهـی گـفتن آنـی — که دانم عیبِ من چون من نـدانـی

## حکایت [۶]

سحبانِ وائل را در فصاحت بی‌نظیر نهاده‌اند، به حکمِ آن که سالی بر سرِ جمع سخن گفتی لفظی مکرّر نکردی و اگر همان اتّفاق افتادی به عبارتی دیگر بگفتی؛ و از جمله‌ی آدابِ ندمایِ حضرتِ پادشاهان یکی این است.

سخن گر چه دلبـند و شـیرین بـوَد — سـزاوارِ تـصدیق و تـحسین بـوَد
چو یک بـار گـفتی، مگـو بـاز پس — که حلوا چو یک بار خـوردند، بس

## حکایت [۷]

یکی از حکما شنیدم که می‌گفت: هرگز کسی به جهلِ خویش اقرار نکند مگر آن کس که چون دیگری در سخن باشد هم‌چنان تمام ناگفته، سخن آغاز کند.

سخن را سـرست، ای خـردمند و بُـن — مـیاور سـخن در مـیانِ سَـخُن
خداونـدِ تـدبیر و فـرهنگ و هـوش — نگـوید سـخن، تـا نـبیند خـموش

## چیرۆك (۸)

چەند کەسێ لە پیاوانی مەحموودی سەبوکتەگین لە حەسەن مەیمەندی‌یان پرسی: کە ئیمرۆ پادشا لە فلان ئیشا چی بە تۆ وت؟ وتی: ون نابێ [لە ئێوەیش]. ویتان: ئەوەی بە تۆی ئەڵێت، وتنی بە وێنەی ئێمە ڕەوا نابینێ. وتی: بە دڵنیایی ئەوەیە کە نایڵێم، ئیتر ئێوە بۆچی ئەپرسن. (بەیت):

عاقڵ هەرچی بوو گورج نایدرکێنێ          بـە نـهێنـیی شـا، سـەر نـادۆڕێنـێ

## چیرۆك (۹)

لە سێ‌و دووی پەیمانی کڕینی خانوویەکا بووم، جوولەکەیەك وتی: بیکڕە، من لە پیاو ماقووڵانی ئەم گەڕەکەم. بەیانی ئەم خانووە وەکوو هەیە لە من بپرسە، هیچ کەم‌و کوڕی نییە. وتم: ئەوە نەبێ تۆ دراوسێمی. (تاك):

خانوویەك کە تۆ دراوسێی ئەو بی          دوو درەم دێنێ زیوی کەم عـەیار
بـەڵام بـێ‌گـومان وەهـایە هـیوام          لە دوای مەرگی تۆ کە بێنێ هەزار

## چیرۆك (۱۰)

یەکێ لە شاعیران ڕۆیشتە لای سەرۆکی دزان، ستایشی کرد، فەرمانی داکراسەکەی لە بەرا داماڵن‌و لە ئاوایی بیکەنە دەرێ. بێ‌نەوا بە ڕوتی ئەڕۆیشت، سەگـەل لە دواوە تـێی ئاڵان. ویستی کە بەردێ هەڵگرێت سەگەکان دوور خاتەوە. زەمین سەهۆڵ بەستبووی بۆی هەڵنەکەنرا. وتی: ئەم پیاوانە حەرامزادەن، سەگیان بەرداوەو بەردیان بەستوەتەوە. سەرۆکی دزەکان لە ژوورەکەیەوە گوێی لێ‌بوو، وە چاوی تێوە بوو. پێکەنی وتی: ئـەی حەکیم لە من شتیك داوا بکە وتی: ئەگەر پێم ئە بەخشی کراسەکەی خۆمم ئەوێتەوە. (نیو شیعر):

«رَضِينا مِنْ نَوالِكَ بِالرَّحِيل». لە بەخشایشت بە ڕۆیین ڕەزاین. (تاك):

هیوادار ئەبێ پیاو بـە چـاکـەی کـەسان          هـیوای چـاکـی تـۆ هـیچ نـەتبێ زیـان

سەرداری دزەکان بەزەیی پیاهاتەوە کراسەکەی دایەوە، وە کەوڵێکی قاقومی بۆ زیاد کردو چەند درەمێ.

## حکایت [۸]

تنی چند از بندگانِ سلطان محمود گفتند حسنِ میمندی را که: سلطان امروز تو را چه گفت در فلان مصلحت؟ گفت: بر شما هم پوشیده نمانَد. گفتند: آن چه با تو گوید با امثالِ ما گفتن روا ندارد که تو ظهیرِ سریرِ سلطنت و مُشیرِ تدبیرِ مملکتی. گفت: به اعتمادِ آن که داند که با کس نگویم، پس چرا می‌پرسید؟

نه هر سخن که برآید، بگـوید اهـلِ شـناخت

بـه سـرِّ شـاه سـرِ خـویشتن نشـاید بـاخت

## حکایت [۹]

در عقدِ بیعِ سرایی متردّد بودم. جهودی گفت: بخر که من کدخدای قدیمِ این محلّتم و نیک و بدِ این خانه چنان که من دانم دیگری نداند. هیچ عیبی ندارد. گفتم: به‌جز آن که تو همسایه‌ی منی.

خانه‌ای را که چـون تـو هـمسایه‌ست ده درم سـیمِ کـم عـیار ارزد

لیکـن امّـیدوار بـاید بـود کـه پس از مـرگِ تـو هـزار ارزد

## حکایت [۱۰]

یکی از شعرا پیشِ امیرِ دزدان رفت در قلبِ زمستان و او را ثنایی گفت. فرمود تا جامه از وی برکندند و از ده به در کردند. مسکین برهنه به سرما همی رفت. سگان در قفای وی افتادند. خواست تا سنگی بردارد و سگان را دفع کند زمین یخ بسته بود. عـاجز شـد، گفت: این چه بدفعل مردمند! سگ را گشاده‌اند و سنگ را بسته! امیرِ دزدان از غرفه بدید و بشنید و بخندید و گفت: ای حکیم، از من چیزی بخواه. گفت: جامه‌ی خود می‌خواهم اگر اِنعام فرمایی کَرَم باشد. رَضَینا مِنْ نَوالِكَ بِالرَّحیلِ.

امیدوار بوَد آدمی بـه خـیرِ کسـان مرا به خیرِ تو امیّد نیست، بد مرسان

سالارِ دزدان بر حالتِ وی رحمت آورد و جامه باز فرمود و لباچه پوستینی و درمی چند بر آن مزید کرد و بدادش و عذر خواست و لطفِ بسیار کرد.

## چیرۆك (١١)

مونەججیمێك[١] هاتەوە ماڵ پیاوێکی بێگانەی دی وا لەگەڵ ژنەکەیدا دانیشتووە. دەستی کرد بە جنێو پێدانو ناشیرینی وتو پێکاهاتن هەروا ئاشووب بەرپا بوو خاوەن دڵێ پێی زانی وتی: (شیعر):

لە ئەوجی فەلەك چی ئەزانی حاڵ؟ نەزانی کێیە تۆ لە دیوی ماڵ

## چیرۆك (١٢)

خەتیبێکی دەنگناخۆش خۆی بە دەنگخۆش ئەزانی هاواری بێسوودی بەرز ئەکردەوە ئەت وت: دەنگی قەلەڕەشەو پەردەی ئەلحانی ئایەتی ﴿إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ﴾ دەربارەی ئەو هاتووە:

نەڕاندی خەتیب «ئەبولفەوارس» دەنگی جووڵاندی ئیستەخری فارس

پیاوانی ئاوایی لە بەر ئەوە پایەیەکی هەبوو ئەو بەڵایەیان ئەکێشا، ئازاردانیان ڕێك نەئەدی، هەتا یەکێ لە خەتیبانی ئەو دەورە لەگەڵیا دوژمنایەتییەکی نیهانیی هەبوو، بۆ ئەحواڵپرسینی هات، وتی: خەوێکی سەیرم پێتەوە دیوە خێر بێت! وتی: چیت دیوە؟ وتی: لە خەوما ئاوازێکی خۆشت هەبوو، وە مەردومان لە پیرۆزی تووە حەسابوونەوە. خەتیب تۆزێ بیری لێ کردەوە، وتی: خوا پاداشت بداتەوە ئەمە چ خەوێکی پیرۆزە تۆ دیوتە، منت لە عەیبی خۆم ئاگادار کرد کە من دەنگێکی ناخۆشم هەیەو پیاوان لە دەنگ هەڵبڕینی من لە ڕەنجان. پەیمان بێ ئیتر خوتبە نەخوێنم مەگەر بە هێواشی. (پارچە):

لە برایەتی دۆستێ لە ڕەنجام شێوەی بەدی من جوان بکا بەیان
عەیبم بە هونەر کەماڵ دابنێ دڕکم بە گوڵو یاسەمین ڕەیحان
کوا بۆ دوژمنی بێ شەرمی نا پاك عەیبی من بە من باش بدا نیشان[٢]

(تاك):

---

(١) ئەستێرەناس.

(٢) کاکڵەی شیعرەکان ئەوەیە: کەسێکی وا عەیبەکانم بە هونەر بە حەساب بێنێو، ئیشی بێ کەڵکی وەکوو دڕكو داڵم، بە گوڵ بزانی، قەزای دوژمنێکی لێ کەوێ کە ڕەخنەم لێبگرێو تانووتم لێ بدات. «ك».

## حکایت [۱۱]

منجّمی به خانه درآمد، مردی بیگانه دید با زنِ او به هم نشسته. دشنام داد و سقط گفت و در هم افتادند و فتنه و آشوب برخاست. صاحب‌دلی بر آن واقف شد، گفت:

تو بر اوجِ فلک چه دانی چیست؟ — که ندانی که در سرای تو کیست

## حکایت [۱۲]

خطیبی کریه‌الصّوت خود را خوش‌آواز پنداشتی و فریادِ بی‌فایده داشتی. گفتی نَعیبِ غُرابُ ٱلْبَیْن در پرده‌ی الحانِ اوست یا آیتِ إِنَّ أَنْکَرَ ٱلْأَصْوات در شأنِ او.

إِذَا نَهَقَ ٱلْخَطِیبُ أَبُـو ٱلْـفَوارِس — لَهُ شَـغَبٌ یَـهُدُّ اَصْـطَخْرَ فـارِس

مردمِ قریه به علّتِ جاهی که داشت بلیّتش می‌کشیدند و اذیّتش مصلحت نمی‌دیدند؛ تا یکی از خطبای آن بوم که پنهان با وی عداوتی داشت باری به پرسیدن رفتش. گفت: تو را خوابی دیده‌ام، خیر باد! گفت: چه دیده‌ای؟ گفت: چنان دیدمی که تو را آوازی خوش بودی و خَلق از نَفَست در آسایش بودندی. گفت: این چه مبارک خواب است که دیدی که مرا بر عیبِ خود واقف کردی. معلوم شد که که آوازِ ناخوش دارم و خلق از نَفَسم در رنجند؛ توبه کردم که از این پس خطبه نخوانم مگر به آهستگی.

از صحبتِ دوستی به رنجم — کاخلاقِ بَدَم حَسَن نماید
عیبم هنر و کمال بیند — خارم گل و یاسمن نماید
کو دشمنِ شوخ چشمِ ناباک — تا عیبِ مرا به من نماید

کــەسێ عــەیبی نــەڵێن لەبـەر دەمـیا وەك نەزان عەیبی خۆی لەلا هـونەرە

## چیرۆك (١٣)

یەکی لە مزگەوتی سنجار بانگی نوێژی ئەدا بە خۆڕایی، بە جۆرێکی ئەداکە گوێ گران نەفرەتیان لێ ئەکرد. خاوەن مزگەوت میرێ بوو عادڵو چـاك ڕەوشت، نـەیویست دڵی بڕەنجێنێ، پێی وت: ئەی جوانمەرد ئـەم مـزگەوتە چـەند بـانگدەرێکی دێریـنی هـەیە هەریەکە پێنج دینار مووچەیان ئەدەمێ. دە دینار ئەدەم بە تۆ لە مزگەوتێکی تر بانگ بدە. لەسەر ئەم وتەیە ڕێك کەوتن، ڕۆیشت. دوای ماوەیەك لە ڕێ گوزەرێ تووشی ئەمیر هات وتی: ئەی گەورە خاوەن، تۆ لەگەڵ منا کەمت بە خەرجدا [زوڵمت کرد] لەو مزگەوتە بە دە دینار دەرت کردم. ئەو شوێنەی چووم بیست دینارم ئەدەنێ بڕۆم قوبووڵم نەکردووە. میر ئەوەندە پێکەنی لەسەر پشت کەوت، وتی: زینهار وەرینەگریت بـە پـەنجا دیـنار ڕازی ئەبن. (شیعر):

بە تەشوێ لە بەرد کەس ناتاشێ گـڵ وەك بـانگی زبـری تـۆ ئـەتاشێ دڵ

## چیرۆك (١٤)

دەنگ ناخۆشێ بە ئاوازێکی ناخۆش قورئانی ئـەخوێنـد. ڕۆژی خـاوەن دڵێ بـەلایا ڕۆیشت، پێی وت: مانگانەکەت چەندە؟ وتی: هیچ. وتی: ئەی بـۆچـی خـۆت ئـەوەندە ئەڕەنجێنی؟ وتی: لەبەر خاتری خوا. وتی: سا لەبەرخاتری خوا مەخوێنە. (شیعر):

گەر بەم شێوەیە قاری قـورئانی نایەڵی ڕەونەق بۆ مـوسوڵمـانی

## حکایت [۱۳]

یکی در مسجدِ سِنْجار به تطوّع بانگِ نماز گفتی به ادایی که مستمعان از او نفرت گرفتندی و صاحبِ مسجد امیری بود عادل، نیکو سیرت، نمی‌خواستش که دل‌آزرده شود. گفت: ای جوان‌مرد، این مسجد را مؤذّنانند قدیم، هر یکی را پنج دینار می‌دهم، تو را ده دینار بدهم تا جایی دیگر روی. بر این سخن اتّفاق افتاد و برفت. بعد از مدّتی به گذری پیشِ امیر باز آمد و گفت: ای امیر بر من حیف کردی که به ده دینارم ازان بقعه روان کردی که این جا که رفته‌ام بیست دینارم می‌دهند که جایی دیگر روم و قبول نمی‌کنم. امیر بخندید و گفت: زینهار تا نستانی که به پنجاه دینار راضی گردند.

به تیشه کس نخراشد ز روی خارا گِل　　چنان که بانگِ درشتِ تو می‌خراشد دل

## حکایت [۱۴]

ناخوش آوازی به بانگِ بلند قرآن همی خواند. صاحب‌دلی بر او بگذشت، گفت: تو را مشاهره چندست؟ گفت: هیچ. گفت: پس چرا زحمتِ خود همی دهی؟ گفت: از بهرِ خدا می‌خوانم. گفت: از بهرِ خدا مخوان.

گر تو قرآن بدین نمط خوانی　　ببری رونقِ مسلمانی

**بەندی پێنجەم:**

# لە عەشق و جوانی یا

## چیرۆك (١)

بە حەسەن مەیمەندی‌یان وت: سوڵتان مەحموود لەم هەموو غوڵامە جوانانەی هەیە، کە هەر یەکە نایابی جیهانێکن، چۆن ڕێکەوتووە کە مەیل و خۆشەویستیی لەگەڵ هیچیانا نییە وەکوو لەگەڵ ئەیازا هەیەتی، خۆ هیچ لەوان جوانی‌یەکی زیاتری نییە؟ وتی: هەرچی چووە دڵەوە لە چاوا جوان ئەنوێنێ. (پارچە):

کەسێ کە پادشا ویستی ئەو کەسە ‌ ‌ سەرا پا بەد بێ بە چاك ئەنوێنێ

ئەو کەسە پادشا فڕێی داتە لا ‌ ‌ لە ناو کۆمارا کەس نایلاوێنێ[1]

کەسێ بە چاوی ڕقاوی ئەگەر تەماشاکات ‌ ‌ بە ناشیرینی لە یوسف نیگار ئەدا نیشان

بە چاوی خۆشەویستی لە دێو تەماشاکات ‌ ‌ وەکو فریشتەی کەرووبی، دێتە بەر چاوان[2]

---

(١) کەسێ کە شیرین هەواداری بێ ‌ ‌ هەمووی شیرینە، چی لە زاری بێ

خەسرەو لە هەرکەس، بە ڕق و قینە ‌ ‌ با شەکەریش بێ، هەر ناشیرینە،ـ«ك».

(٢) لە نووسخەکەی بەر دەست ئێمەدا ئەم بەیتەش هەیە:

هەرکە در سایۀ عنایت اوست ‌ ‌ گنهش طاعت است و دشمن دوست

هەرکەس لە ژێر سایەی ئەودایە ‌ ‌ گوناى تاعەتە و دوژمنی برایە،ـع.

**باب پنجم:**

## در عشق جوانی

### حکایت [۱]

حسنِ میمندی را گفتند: سلطان محمود چندین بنده‌ی صاحب جمال دارد که هر یکی بدیعِ جهانی‌اند، چون است که با هیچ یک از ایشان میل و محبّتی ندارد چنان که با ایاز که زیادت حُسنی ندارد؟ گفت: هرچه در دل فرود آید در دیده نکو نماید.

هرکه سلطان مریدِ او باشد — گر همه بد کند نکو باشد
وان که را پادشه بیندازد — کسش از خیلْخانه ننوازد
هرکه در سایه‌ی عنایتِ اوست — گنهش طاعت است و دشمن، دوست

***

کسی به دیده‌ی انکار اگر نگاه کند — نشانِ صورتِ یوسف دهد به ناخوبی
وگر به چشمِ ارادت نگه کنی در دیو — فرشته‌ایت نماید به چشم، کرّوبی

## چیرۆك (٢)

ئەڵێن گەورەیەك کۆیلەیەکی نایابی جوانی هەبوو، لە ڕووی مەیلو خۆشەویستیو دیانەتەوە سەیری ئەکرد. بەیەکێ لە دۆستانی خۆی وت: درێغ ئەم غوڵامەی من لەگەڵ ئەم جوانی‌یەی هەیەتی زمانی درێژو بێ‌ئەدەب نەبوایە چەند خۆش ئەبوو. وتی: برام! کاتێ دانت بە دۆستی‌یا نا تەمات بە خزمەتی نەبێ، چونکە عاشقو مەعشووقی کە هاتە ناو خاوەندیو کۆیلەیی هەڵئەسێ. (پارچە):

| | |
|---|---|
| گەورە بە کۆیلەی پەری ڕوخساری | کە کەوتە گەمەو یاریو پێکەنین |
| چەند سەیرە کۆیلە فەرمان ڕەوابێ | گەورە ڕابگرێ نازێکی بەتین |

(تاك):

کۆیلە هەڵئەگرێ ئاوو خشت بێنێ    کۆیلە نازدار بێ مشت ئەوەشێنێ

## چیرۆك (٣)

خواپەرستێکم دی بە خۆشەویستیی کەسێ دوچار بووبوو، نەتینی تواناو نە توانای گفتوگۆی مابوو. چی تانووت لێ ئەدرا سۆزی زیاد ئەبوو، وازی لە منالی نەئەهێناو ئەیوت: (پارچە).

| | |
|---|---|
| لە داوێنی تۆ کورت ناکەم دەست | ئەگەر لێم بدەن بە تیغی بوڕان |
| لە دوای تۆ نیمە سایەو پەنایەك | هەر بۆ لای تۆیە بیمو گوریزان[1] |

[جارێك]کەوتمە تانوت لێ‌دانی. پێم وت: عەقڵی بەنرخت چی‌لێ‌هات کە نەفسی پیست بەسەرا زاڵ بوو؟ زەمانێ بە بیر کردنەوەدا ڕۆچوو. وتی:

| | |
|---|---|
| کە سوڵتانی عەشق ڕووی کردە شوێنێ | نامێنی هێزی بازوو بۆ تەقوا |
| چۆن ئەو بێچارە داوێن پاك ئەبێ؟ | تا یەخەی لە قوڕ کە چەقیوە وا |

(١) لە خەرمانی گیانمدا شەرارەی    لە عاسمانی ژیانمدا هەسارەی
ئەڵێن کۆبوونەوەی دوو دژ مەحاڵە    کەچی تۆ مەرگو ژینی ئەم هەژارەی،-«ك».

## حکایت [۲]

گویند: خواجه‌ای را بنده‌ای نادرالحُسن بود و با وی به سبیلِ مودّت و دیانت نظری داشت. با یکی از صاحب‌دلان گفت: دریغ اگر این بنده‌ی من با حُسن و شمایلی که دارد زبان‌دراز و بی‌ادب نبودی. گفت: ای برادر، چون اقرارِ دوستی کردی توقّعِ خدمت مدار که چون عاشق و معشوقی در میان آمد مالکی و مملوکی برخاست.

خواجه با بنده‌ی پری رخسار　　چون درآمد به بازی و خنده
نه عجب کو چو خواجه حکم کند　　وین کشد بارِ ناز چون بنده

## حکایت [۳]

پارسایی را دیدم به محبّتِ شخصی گرفتار، نه طاقتِ صبر نه یارای گفتار. چندان که ملامت دیدی و غرامت کشیدی ترک نگفتی و گفتی:

کوته نکنم ز دامنت دست　　ور خود بزنی به تیغِ تیزم
بعد از تو ملاذ و ملجأی نیست　　هم در تو گریزم، ار گریزم

باری ملامتش کردم که عقل نفیست را چه رسید که نفسِ خسیس غالب آمد؟ گفت:

هر کجا سلطانِ عشق آمد نماند　　قوّتِ بازوی تقوا را محل
پاکدامن چون زیَد بی‌چاره‌ای　　اوفتاده تا گریبان در وَحَل

## چیرۆك (٤)

یەکێ دڵی لە دەست چووبوو، وە وازی لە گیان هێنابوو، هیوای کەوتبوە ترس و گومانی لەسەر فەوتان بوو. نە پاروویەك بوو خەیاڵی، بکرێت بکەوێتە دەم، وە نە مەلێ بوو بکەوێتە داو. (تاك):

زێڕ ئەگەر لەلای دولبەر نەنوێنێ    زیڕو خاك ئیتر یەکسان ئەنوێنێ

جارێك بە ئامۆژگاری پێیان وت: لەم خەیاڵە مەحاڵە بێ جێیە خۆت بپارێزە. زۆر بەم هەوەسەی تۆ هەتە وێڵن و قاچی دڵیان لە زنجیرایە. ناڵاندی و وتی: (پارچە).

بـڵێ پـەندم نـەدەن ئـیتر یـاران    چاو لە مـەیلی ئـەوم لە نـاو جـانان
شەڕفرۆشان بە زۆری پەنجەو شان    ئەکوژن دوژمـن و نـیگار، دۆستـان

(تاك):

دوژمـن زامـی دانـی بـەدتر ئـەبێ    کە لە چاوی کەسان وەکوو دۆست بێ

مەرجی خۆشەویستی ئەوە نییە لە ترسی گیان دڵ لە جانان گرتنەوە. (پارچە):

تـۆ کـە خـەریکی خـزمەتی تـەنی    عـەشقبازێکـی زۆر درۆزنـی
گەر بۆت ڕێك نەکەوت ڕێ بەیار بـردن    خـۆ مـەرجـی عـەشقە لە داوا مـردن

(تاك):

ئەگەر بۆی دەستدام داوێنـی ئـەگرم    گـەر دەسـتی نـەدا لە دەرگـا ئـەمرم

خزم و خوێشی کە چاویان بە کاری ئەکەوت بەزەیی‌یان بە ڕۆزگاریا ئەهاتەوە، پەندیان دائەدا، زنجیریان بۆ دائەنا بێ سوود بوو. (شیعر):

تـاڵی شـاڵی‌دا لەبـۆ دردم تـەبیب    نەفسی چاوچۆی من شەکر داوا ئەکا

(شیعر):

بـیستت دولبـەرێ ئـەیوت نـیهانی    بە دڵ لە دەست چوو، ئەبێ بزانـی
هەتا قـەدری خـۆت وەهـا لەلا بـێ    لە بەر چاوی تـۆ قـەدری مـن نـابێ

ئەگێڕنەوە کە ئەو شازادەیەی ئەو چاوی لێوە بوو ئاگاداریان کرد کە جوانێ هەمیشە لەم سەرمەیدانەیە سروشتێکی خۆش و وتاری شیرین و وردی هەیە، وتەی نەستەقی

## حکایت [۴]

یکی را دل از دست رفته بود و ترکِ جان گفته و مطمحِ نظر او جایی خطرناک و ورطه‌ی هلاک، نه لقمه‌ای که مصوّر شدی که به کام آید یا مرغی که به دام آید.

چو در چشم شاهد نیاید زرت　　　زر و خاک یکسان نماید برت

یاران به نصیحتش گفتند که از این خیال محال تجنّب کن که خلقی هم بدین هوس که تو داری اسیرند و پای در زنجیر. بنالید و گفت:

دوستان گو، نصیحتم مکنید　　　که مرا چشم بر ارادتِ اوست
جنگجویان به زورِ پنجه و کتف　　　دشمنان را کُشند و خوبان دوست

شرطِ مؤدت نباشد به اندیشه‌ی جان دل از مهرِ جانان برگرفتن.

تو که در بندِ خویشتن باشی　　　عشق‌بازی دروغ‌زن باشی
گر نشاید به دوست ره بردن　　　شرط یاری است در طلب مردن

***

گر دست دهد آستینش گیرم　　　ورنه بروم بر آستانش میرم

متعلّقانش را که نظر در کارِ او بود و شفقت بر روزگارِ او، پندش دادند و بندش نهادند بی‌فایده بود.

دردا که طبیب صبر می‌فرماید　　　وین نفسِ حریص را شَکَر می‌باید
آن شنیدی که شاهدی بنهفت　　　با دل از دست رفته‌ای می‌گفت:
تا تو را قدرِ خویشتن باشد　　　پیشِ چشمت چه قدرِ من باشد؟

مَلِک‌زاده‌ای را که ملموحِ نظرِ او بود خبر کردند که جوانی بر سرِ این میدان مداومت می‌نماید خوش طبع و شیرین زبان و سخن‌های لطیف می‌گوید و نکته‌های غریب از وی

نەبیسراوی لێ ئەبیسترێ. وادەر ئەکەوێ شورێ لە سەریاو سۆزێ لە جگەریایە، شێوەی شەیدا ئەنوێنێ. کوڕ کە زانی دڵ هەڵاوەسراوی ئەوەو بە دەوری بەڵادا ئەسووڕێتەوە. هات بۆلای کە دیتی وا شازادە بۆ لای نزیك بووەو بۆ هاتنە لای سوورە. گریاو وتی:

ئەوەی کوشتوومی وا هاتۆتە لام دڵی بۆ کوشتەی سووتاوە گۆیا

هەرچەندە لوتفی لەگەڵ کردو لێی پرسی: چۆنی‌و لە کوێوە ئێیت‌و ناوت چییەو چ پیشەیەك ئەزانی؟ جوان بە جۆری نوقمی قووڵایی دەلیای خۆشەویستی بووبوو، جێی هەناسەی نەمابوو.

لەبەر بخوێنی حەوت سوبعی قورئان تێك چوویت ئەلف‌و بێت لا نابێ ڕەوان

وتی: بۆچی لەگەڵم نادویت، منیش لە ڕیزی دەروێشانم، بەڵکە ئەڵقە لەگوێی ئەوانم. لەو کاتەدا بە هێزی ڕابواردنی خۆشەویستییەوە، لەناو گێژاوی شەپۆلی خۆشەویستی‌یا سەری دەرهێناو وتی: (شیعر).

عەجەبە کە لەگەڵ وجودت کە وجودی من بمێنێ

عەجەبە کە بیتە گوفتار، لای من وتن بمێنی[1]

ئەمەی وتو زیڕەیەکی کردو گیانی بە حەق سپارد. (شیعر):

هیچ عەجەب نییە کوژراوێ لە دەر خەیمەیی دۆست

ئەوە سەیرە بە سەلامەت کە بەریتە دەرێ گیان

## چیرۆك (٥)

یەکێ لە قوتابی‌یان جوانی‌یەکی تەواوی هەبوو، وە شێوەو وتارێکی ڕێك. مامۆستا بە هەستی ئادەمیزادی لەگەڵ جوانپێستی‌یا مامەڵەیەکی هەبوو، وە تووڕەیی‌و هەڕەشەیەك کە بە سەر منداڵەکانی ترا هەیبوو بۆ ئەمی ڕەوا نەئەدی‌و کاتێ بە تەنیا دەسی ئەکەوت ئەیوت: (پارچە).

---

(١) دڵی من مۆم‌و ڕووی تۆ هەر وەکوو شەم
ئەتاوێتۆ، لەبەر پێتا ئەبێ جەم
ئەوا ئێستا دەسووتم تا بزانی
کە عەشقی تۆ چرایەو من پەپوولەم،ـ«ك».

می‌شنوند و چنین معلوم می‌شود که شیداگونه‌ای است و شوری در سر دارد. پسر دانست که دل آویخته‌ی اوست و این گردِ بلا انگیخته‌ی او. مرکب به جانبِ او راند. چون دید که به نزدیکِ وی عزمِ آمدن دارد بگریست و گفت:

**آن کس که مرا بکُشت، بازآمد پیش　　ماناکه دلش بسوخت بر کُشته‌ی خویش**

چندان که ملاطفت کرد و پرسیدش که از کجایی و چه نامی و چه صنعت دانی، در قعرِ بحرِ مودّت چنان غریق بود که مجالِ نفس کشیدن نداشت.

**اگر خود هفت سُبع از بر بخوانی　　چو آشفتی الف بِ تِ ندانی**

گفت: چرا با من سخن نگویی که هم از حلقه‌ی درویشانم بلکه حلقه به‌گوشِ ایشانم. آن‌گه به قوّتِ استیناسِ محبوب از میانِ تلاطمِ امواجِ محبّت سر برآورد و گفت:

**عجب است با وجودت که وجودِ من بماند**

**تو به گفتن اندرآیی و مرا سخن بماند**

این بگفت و نعره‌ای بزد و جان به حق تسلیم کرد.

**عجب از کُشته نباشد به درِ خیمه‌ی دوست**

**عجب از زنده که چون جان به در آورد سلیم!**

## حکایت [۵]

یکی را از متعلّمان کمالِ بهجتی بود و طیبِ لهجتی و معلّم ازان جا که حسِّ بشریّت است با حُسنِ بشره‌ی او معاملتی داشت و زجر و توبیخی که بر کودکانِ دیگر کردی در حقِ وی روا نداشتی و وقتی که به خلوتش دریافتی گفتی:

نەك هێند خەریکم ئەی بەهەشتی ڕوو    لە دڵمــــا مـــابێ هــەتا خــۆم لە بــیر
نیمە لە سـەیرت تـوانـای چـاوپۆشـین    تــــا بــــەرابــــەری خــۆم ببینم تــیر

جارێك کوڕە پێی‌وت: ئـەوەنده لە شـێوەی دەرسـا چـاوت لە مـنە، وە هـەروەها لە خۆیشم ورد ئەبیتەوە، ئەگەر لە ئەخلاقو ڕەوشتی مـنا نـاپەسـەندییەکت دی، بـەسـەریا ئاگادارم بکە. هەتا بۆ گۆڕینی کۆشش بکەم. وتی: ئەی کوڕ ئەم وتەیە لە کەسێکی تر بپرسە من بەو چاوەی لەگەڵ تۆدا هەمە هونەر نەبێ هیچی تری لە تۆدا پێ‌نابینم. (پارچە):

بـــا چـــاوی بـەد بـین هـەڵ کـۆڵرابـێ    هونەری بـە عـەیب بێتـە بـەر نـەزەر
لەگەڵ یەك هونەر ببێ هەفتاد عەیب    دۆست نـابینێ مـەگـەر یـەك هـونەر

## چیرۆك (٦)

لە یادمە شەوێك یاری خۆشەویت لە دەرگاوە هات. وەها بە بێ‌خـودی هـەڵسـام لە جێی خۆم چراکەم بە داوێنی خۆم کوژاندەوە. (شیعر):

سَرَىٰ طَيْفُ مَنْ يَجْلُو بِطَلْعَتِهِ الدُّجىٰ    فَقُلْتُ لَهُ أَهْـلاً وَ سَـهْلاً وَ مَـرْحَباً[١]

دانیشتو گلەیی دەست پێ‌کرد کە لە حاڵەتێکا منت دی چـرات کـوژانـدەوە: بـە چ مەعنایەك بوو؟ وتم: بە دوو مەعنا: یەکەم وام زانی ڕۆژ هەڵات، دووەم ئەم شـیعرەم بـە یادهات:

گەر ئـێسك قـورسێ هـاتە لای چـرا    هەڵسیو لە کـۆمـەڵ تـۆ دەری بـێنـی
وەر دەم بە خەندەو شیرین لێوێ بوو    فــــوو لە چـــراکــەو بگــرە داوێنــی

## چیرۆك (٧)

پیاوێك زەمانێ بوو دۆستێکی نەدیبوو لێی پرسی: لە کوێ بوویت، زۆرم بیر ئەکردی؟ وتی: بیر کردن چاترە لە بێزاری. (چواری):

(١) لە هەندێ نووسخەدا لەباتی نیو شیعری دوای نووسراوە: شگفت آمد از بختم کە این دولت از کجا؟.ــع.

نه آن چنان به تو مشغولم، ای بهشتی روی
که یادِ خویشتنم در ضمیر می‌آید
ز دیدنت نتوانم که دیده دربندم
وگر مقابله بینم که تیر می‌آید

باری پسر گفتا: چنان که در آدابِ درسِ من نظری می‌فرمایی در آدابِ نَفْسم هم‌چنین تأمّل فرمای تا اگر در اخلاقِ من ناپسندی بینی که مرا آن پسنده همی نماید بر آنم اطلاع فرمایی تا به تبدیلِ آن در سعی کنم. گفت: ای پسر، این سخن از دیگری پرس که آن نظر که مرا با تو است جز هنر نمی‌بینم.

چشمِ بداندیش که برکنده باد | عیب نماید هنرش در نظر
ور هنری دارد و هفتاد عیب | دوست نبیند به‌جز آن یک هنر

## حکایت [۶]

شبی یاد دارم که یاری عزیز از در درآمد چنان بی‌خود از جای برجَستم که چراغم به آستین کشته شد.

سَرىٰ طَيْفُ مَنْ يَجْلُو بِطَلْعَتِهِ ٱلدُّجىٰ | شگفت آمد از بختم که این دولت از کجا

بنشست و عتاب آغاز کرد که مرا در حال که بدیدی، چراغ بکُشتی به چه معنی؟ گفتم: به دو معنی: یکی آن که گمان بردم که آفتاب برآمد، و دیگر آن که این بیتم به خاطر بگذشت:

چون گرانی به پیشِ شمع آید | خیزش اندر میانِ جمع بکُش
ور شکرخنده‌ای است شیرین لب | آستینش بگیر و شمع بکُش

## حکایت [۷]

یکی، دوستی را که زمان‌ها ندیده بود گفت: کجایی که مشتاق می‌بودم. گفت: مشتاق به که ملول.

درەنگ هاتویت ئەی یاری سەرمەست ئــیتر داوێنت بــەرنادەم لە دەست
خۆشـەویستی خـۆت ببینی دێر دێر چـــاترە لەوەی کــە لێی بـــبی‌تێر

وتەی ورد: دولبەرێ لەگەڵ هاوڕێیانا هاتبێ بۆ ڕەنجاندن هاتووە چونکە لە حەسەدو بەربەرەکانێ خاڵی نییە.

اِذا جِـئْتَنِی فـی رِفْـقَةٍ لِـتَزُورَنی وَ اِنْ جِئْتَ فی صُلْحٍ فَأَنْتَ مُحارِب
لەگەڵ هاوڕێیان بێـیتە لام ئـەگـەر با بە ڕێکیش بێ هاتوویت بۆ شـەڕ

(تاك):

بە یـەك هـەناسە کـە تێکـەڵ بـوو یـار بـە بێگـانە
فـرەی نـەمابوو کـە بـمرم لە غـیرەت ئـەو ئـانە
بە پێکـەنین وتـی: (سـەعدی) چـرای ئـەنجومەنم
لەوەمچی خۆی کە بسـووتێ بـە شـوعلە پـەروانـە

## چیرۆك (٨)

لە یادمە لە ڕۆژانی پێشینا من‌و دۆستێ وەکوو دوو دەنك بادام لە پێستێکا بووین. واڕێکەوت ون بوونێ پەیدا بوو. دوای زەمانێ کە هاتەوە دەستی کرد بە گلەیی کـە لەم کاتەدا تەتەرێکت[1] نەنارد. وتم: دریغم لێ‌هات چاوی تەتەر بە جەماڵت ڕۆشن بێ‌و من بێ بەش بم. (پارچە):

بـــڵێ بـــە یـــاری دێریـــنەم کـــەوا تـــەوبەم دانـــەدا بـــەزۆری زمـــان
بـۆ مـن لامـوایـە کـە تـەوبە نـابێ هـەتا بـەزۆری شـمشێری بـوڕڕان
حـــەسادەتم بـــرد یـــەکـێ بـنێرم کـە تـەماشاکـا لە جـەماڵی جـوان
دووبارەی ئەڵێم کـە ئـەی یـاری مـن هیچ‌کەس تێر نابێ لە سەیری ڕووتان

---

(١) تەتەر: توندو تۆڵ، شاتر، پەیك، جەردەو ڕێگر، پیاو خراو، نامەرد لێرەدا مەبەست پەیك و نامەیە. «ك».

دیر آمدی، ای نگـارِ سـرمست		زودت نــدهیم دامــن از دست
مــعشوقه کــه دیـر دیـر بـینند		آخر، کـم ازان کـه سـیر بـینند؟

شاهد که با رفیقان آید به جفا کردن آمده است، به حکمِ آن که از غیرت و مُضادّت خالی نباشد.

إذَا جِـئْتَنی فِـی رُفْـقَةٍ لِـتَزُورَنی		وَ إنْ جِئْتَ فِی صُلْحٍ فَانْتَ مُحارِبٌ

***

به یک نَفَس که بـرآمـیخت یـار بـا اغـیار
بسی نمانْد کـه غـیرت وجـودِ مـن بکُشـد
به خنده گفت من شمعِ جـمعم، ای سـعدی
مرا ازان چه که پروانـه خـویشتن بکُشـد؟

## حکایت [۸]

یاد دارم که در ایّامِ پیشین من و دوستی، چـون دو بـادامْ مـغز در پـوستی، صـحبت داشتیم. ناگاه اتّفاقِ غیبت افتاد. پس از مدّتی بازآمد و عتاب آغاز کرد که در این مدّت قاصدی نفرستادی. گفتم: دریغ آمدم که دیده‌ی قاصد به جمالِ تو روشن گـردد و مـن محروم.

یارِ دیرینه، مرا، گو، به زبـان تـوبه مـده
که مرا توبه به شـمشیر نـخواهـد بـودن
رشکم آید که کسی سیر نگه در تـو کـند
باز گویم که کسی سـیر نـخواهـد بـودن

## چیرۆك (٩)

زانایەکم دی بە کەسێ دوچار بووبوو، ڕازی لە پەردە دەرچووبوو بۆ ناو کۆمەڵ. جەفایەکی زۆری لەسەر بوو ئەیگرتە شان. جارێك بە وردی پێم وت: ئەزانم کە تۆ لە خۆشەویستی ئەم دولبەرە هەوایەکی نەفسیت نییە، وە لەم خۆشەویستییەدا هەڵخلیسکانت نییە. جا لەگەڵ ئەم مانایەدا شایانی پایەی زانایان نییە خۆیان بەد ناو بکەن و جەفای بێ ئەدەبان بکێشن. وتی: ئەی یار دەستی گلەیی لە داوێنم بەردە کە زۆر جار بۆ ئەم کارسازییەی [کە تۆ بینیت] خۆم بۆ خۆم کەوتوومەتە یادەوە. توانام بۆ جەفای ئەو لەلا ئاسانترە لە چاو پێ نەکەوتنی ئەو. حەکیمان فەرموویانە دڵ دانان بۆ ماندوویی [و جەفا کێشان] ئاسانترە لە چاوگرتن بۆ تەماشا.

کەسێ دڵی دا بە دەس دولبەرێ — جڵەوی دایە بۆ هەر جێی بەرێ
گەر ئاسك پێی بێ پێی لە پەتایە — ناتوانێ بۆ خۆی بچێ بۆ لایە
کەسێ بەبێ ئەو کات نەبەیتە سەر — ئەگەر جەفای بوو بیخەرە سەر سەر
ڕۆژێ لە دەستی گەر وتم هاوار! — چەند ڕۆژ دوای ئەوە بردم ئیستیغفار
دۆست هاوار ناکا لە دەستی دۆستی — دڵی خۆم دانا بۆ هەرچی ویستی
بە لوتف بۆ لای بانگ ئەکەم ئەگەر — یا بەقینەوە دەرم کاتە دەر[1]

## چیرۆك (١٠)

لە سەرەتای جوانیما کە ئەیزانی چۆنە، لەگەڵ دولبەرێکا خەیاڵ و ڕازێکم هەبوو. لەبەر ئەوەی قورگێکی خۆش دەنگ و سروشتێکی وەك مانگی چواردەی هەبوو لە تاریکی شەوا. (تاك):

سەوزەی کەناری ڕوومەتی ئەخواتەوە ئاوی حەیات

لە شەکری ئەو سەیربکا ویستی کەسێ بخوا نەبات

---

(١) فارسییەکەی بەم شێوەیە:

گر به لطفم به نزد خود خواند — ور بە قهرم براند او داند

ئەگەر کورییەکەشی بەم شێوەبێ چاکترە:

بە لوتف بۆ لای خۆی بانگم کا ئەگەر — یا بەقینەوە دەرم کاتە دەر، ـ ع.

## حکایت [۹]

دانشمندی را دیدم به کسی مبتلا شده و رازش برملا افتاده. جورِ فراوان بُردی و تحمّل بی‌کران کردی. باری به لطافتش گفتم: دانم که تو را در محبّتِ این منظور علّتی و بنای مودّت بر زَلّتی نیست؛ پس با وجودِ چنین معنی، لایقِ قدرِ علما نباشد خود را متّهم گردانیدن و جورِ بی‌ادبان بردن. گفت: ای یار دستِ عتاب از دامنِ روزگارم بدار که بارها در این مصلحت که تو بینی اندیشه کردم و صبر بر جفای او سهل‌تر آید همی که از نادیدنِ او و حکیمان گویند: دل بر مجاهده نهادن آسان‌ترست که چشم از مشاهده بر گرفتن.

هرکه دل پیشِ دلبری دارد / ریش در دستِ دیگری دارد
آهوی پالهنگ در گردن / نتواند به خویشتن رفتن
آن که بی او به سر نشاید بُرد / گر جفایی کند بباید بُرد
روزی، ازدست، گفتمش، زنهار / چند ازان روز گفتم استغفار
نکند دوست زینهار از دوست / دل نهادم بر آن‌چه خاطرِ اوست
گر به لطفم به نزدِ خود خواند / ور به قهرم براند، او داند

## حکایت [۱۰]

در عنفوانِ جوانی، چنان که افتد و دانی، با شاهدی سری و سرّی داشتم، به حکمِ آن که حَلقی داشت طَيِّبُ ٱلْأَدَا و خَلقی کَٱلْبَدْرِ إِذَا بَدَا.

آن که نباتِ عارضش آبِ حیات می‌خورد
در شکرش نگه کند هرکه نبات می‌خورد

وا ڕێکەوت جوولانەوەیەکی ناڕێکی سروشتیم لێ دی پەسەندم نەکرد. داوێنم لێ کێشایەوەو خۆشەویستیم پێچایەوەو وتم:

بڕۆ بیکە هەرچی ئەکەی ئارەزوو     حەزی ئێمە ناکەیت لە خۆت حەزکە زوو

گوێم لێبوو ئەڕۆیشتو ئەیوت: (تاك).

هاودەمیی ڕۆژی نەوێت شەمشەمە     شەوقی بازاری ڕۆژی پێ ناشکێ

ئەوەی وتو ڕۆیشت بۆ سەفەر. پەرێشانی لە من کاری کرد. (شیعر):

فَقَدْتُ زَمانَ الْوَصْلِ وَ الْمَرْءُ جاهِلٌ     بِقَدْرِ لَذِيذِ العَيْشِ قَبلَ المَصائِبِ

ونم کرد کاتی وەسڵ، ئینسان نەزانە     بە قەدری خۆشیی ژین پێش کاتی قەومان

(تاك):

بێرۆ و بمکوژە لەلای تۆ مردن     نەوەك بەبێ تۆ ژین بەسەر بردن

بەڵام بە هۆی سوپاسو شانازیی خواوە دوای کاتێك هاتەوە. ئەو قوڕگی داوودییەی تێکچوو بوو، وە ئەو جوانی یوسفی یەی زیانی هێنابوو سێوی چەناگەی وەکوو هێندوانە تۆزی لێ نیشتبوو، ڕەونەقی بازاری جوانیی شکابوو. هیوادار بوو لە باوەشی گرم، خستمە تەنیشتمەوەو وتم: (تاك).

ڕۆژێ کە هەتبوو خەتی دولبەری     لە خاوەن عەقڵ، عەقڵت ئەفڕان
ئیمڕۆ هاتیەوە ئاشتی کەیتەوە     لەسەر ڕوو سەرو بۆرت دانیشان

(هۆنراوە):

تازە بەهارت زەرد بوو بێ هیوا     ئاگری ئێمەیش سارد بووەوە ئەوا
چەند ئەکەی دەعیەو ئەکەی لەنجەولار     بیر ئەکەیتەوە لە دەوڵەتی پار
بڕۆ لای کەسێ کە کڕیارتە     ناز لای کەسێ کە داواکارتە

(پارچە):

وتراوە سەوزە لە باغا خۆشە     کەسێ ئەزانێ بەم واتە ئەدوێ
یانی لەسەر ڕووی جوانان خەتی سەوز     دڵی عاشقان زۆرتری ئەوێ
بەڵام باغی تۆ گەندە زارێکە     هەڵت کەندوە زوو هەم دیسان ئەڕوێ

اتفاقاً به خلافِ طبع از وی حرکتی بدیدم که نپسندیدم؛ دامن از وی درکشیدم و مُهره‌ی مِهرش برچیدم و گفتم:

برو هرچه می‌بایدت پیش گیر  سرِ ما نداری، سرِ خویش گیر

شنیدمش که همی رفت و می‌گفت:

شب‌پره گر وصلِ آفتاب نخواهد  رونقِ بازارِ آفتاب نکاهد

این بگفت و سفر کرد و پریشانی او در من اثر کرد.

فَقَدْتُ زَمانَ ٱلْوَصْلِ وَ ٱلْمَرْءُ جاهِلٌ  بِقَدْرِ لَذیذِ ٱلْعَیْشِ قَبْلَ ٱلْمَصائِبِ

***

باز آی و مرا بکُش که پیشت مردن  خوش‌تر که پس از تو زندگانی کردن

امّا به شُکر و منّتِ باری، پس از مدّتی باز آمد، آن حَلقِ داودی متغیّر شده و جمالِ یوسفی به زیان آمده، بر سیبِ زنخدانش چو بِهْ گردی نشسته و رونقِ بازارِ حُسنش شکسته، متوقّع که در کنارش گیرم، کناره گرفتم و گفتم:

آن روز که خطِّ شاهدت بود  صاحب نظر از نظر براندی
و امروز بیامدی به صلحش  کش فتحه و ضمّه برنشاندی

***

تازه بهارا ورقت زرد شد  دیگ منه کآتشِ ما سرد شد
چند خرامیّ و تکبّر کنی؟  دولتِ پارینه تصوّر کنی؟
پیشِ کسی رو که طلبگارِ تست  ناز بر آن کن که خریدارِ تست

***

سبزه در باغ، گفته‌اند: خوش است  داند آن کاین سخن همی گوید
یعنی از روی دلبران خطِ سبز  دلِ عشّاق بیشتر جوید
بوستانِ تو گَنْدنازاری است  بس که برمی‌کنی و می‌روید

***

(پارچە):

سەبرت بێ بۆ مووی بناگوێ یا نەبێ[١] دەوڵەتـی ڕۆژانـی جـوانـی دێتـەسەر

دەستی گیانم گەر ئەبوو وەك تۆ بە ڕیش تا قیامەت نەمئەهێشت خۆ بێتەدەر[٢]

(پارچە):

وتـم: بـپرسە جـەماڵت چ بـوو ئـەبینی وەك

لە دەوری مـانگ مـێلـووڕە گـردو پـڕ جـۆشـە

وەڵامـی دامـێ چـوزانـم کـەچی لە ڕوم ڕووی‌دا

مەگەر لە مـاتەمی جـوانـیمە وا کـە ڕەش‌پۆشـە

## چیرۆك)[٣]

پرسیم لە یەکێ لە «موستەعریبان»[٤]: ما القَوْلُ في المردان؟ (چـی ئـەڵێت لە بـاتی لووسانەوە؟). لا خَيْرَ فِيهِم، مادامَ أَحَدُهُمْ لَطيفاً يتَخاشَنُ، فَـإذا خَشِـنَ يَـتَلاطَفُ. (وتـی: چاکی‌یان تیا نییە. هەتا یەکێکیان نەرمە زبری ئەنوێنێ. جاکە زبر بوو نەرمی ئەنوێنێ).

لووس هەتا کاتێ جوانـەو شیرین ڕوو وتـاری تـاڵە، بـۆ خـۆیشـی تـونخوو

لەگـەڵ ڕیشـی هـات کـەوتە بـەلاغەت تێکەڵیی ئەوێ‌و مەیل‌و مـەحەببەت[٥]

## چیرۆك (١١)

یەکێ لە زانایەکی پرسی: کەسێ لەگەڵ مانگ‌ڕوویەکا لە ژوورێکی تەنیایی‌یا دانیشت، دەرگا داخراو چاودێران نووستوو. نـەفس داوائـەکـات‌و هـەوەس زاڵ، وەکـوو عـەرەب ئەڵێت: خورما گەیشتووەو باخەوان بەرهەڵستیی ناکات. هـیچ ئـەبێ بـە پـارێزگـاری بـە

(١) پێم وابێ لە هەندێ لە شیعرەکانا، وەزن‌و کێشی نیوەیەك لەگەڵ نیوەکەی تـرا زۆر بـاش نایێتەوە، بۆ نموونە: لەم پارچەدا وەزنی نیوەی ئەوەڵ لەگەڵ نیوەکەی پاش خۆیا بڕێ تەفاوتیان تیا بەدی ئەکرێ، یا لانی کەم زەوقی من وایە. «ك».

(٢) واتە: ئەگەر وەك تۆ کە توانایت بەسەر ڕیشا هەیە و ناهێڵی بێتە دەر منیش توانایم بە سەر گیانمدا ببوایە، تا قیامەت نەمئەهێشت بێتە دەر (نەمئەهێشت گیانم دەرچێ)،ـ ع.

(٣) لە هەندێ نووسخەدا ئەم چیرۆکە نییە.

(٤) موستەعریب: بەکەسێ ئەڵێن ئەسڵی عەرەب نییەو بووە بە عەرەب.

(٥) لە نووسخەیەکدا نووسراوە: کە بوو بەلەعنەت.

گــر صـبر کـنی ور نکـنی مـوی بـناگـوش
ایــن دولتِ ایّــامِ نکــویی بــه ســر آیــد
گر دست به جان داشتمی هـمچو تـو بـر ریش
نگــذاشــتمی تــا بــه قـیامت کـه بـرآیـد

***

ســؤال کـردم و گـفتم: جـمالِ روی تـو را
چه شد که مورچه بر گردِ ماه جوشیده‌ست؟
جــواب داد: نــدانــم چـه بـود رویـم را
مگـر بـه مـاتمِ حُسـنم سـیاه پـوشیده‌ست

## حکایت [۱۱]

یکی را از علما پرسیدند که کسی با ماه‌رویی در خلوت نشسته و درها بسته و رفیقان خفته و نفسْ طالب و شهوتْ غالب، چنان‌که عرب گوید: اَلتَّمْرُ یانِعٌ وَ اَلنّاطُورُ غَیرُ مانِعٍ،

سەلامەت بمێنێ؟ وتی: ئەگەر لە مانگ‌روویان بە سەلامەت بمێنێ، لە بەدگۆیان بێ تەشەر نابێ. (شیعر):

لَئِنْ سَلِمَ الاِنْسانُ مِنْ سُوءِ نَفْسِهِ     فَمِنْ سُوءِ ظَنِّ المُدَّعی لَیْسَ یَسْلِمُ

لە پیسیی نەفسی خۆی پیاو بوو سەلامەت     لە پیسیی زەننی بەدگۆ نابێ ڕزگار

(تاك):

ئەتوانی ئیشی خۆت وازلێ‌بێنی     ناتوانی دەمی خەڵکی ببەستی

## چیرۆك (١٢)

توتی‌یەکیان لەگەڵ قەلێ کردبوە قەفەسەوە، لە پیسیی سەیر کردنی لە ڕەنجا بوو، ئەیوت: ئەمە چ سروشتێکی بێزلێ‌کراوە چ دیمەنێکی مەلعوونەو ئەندامێکی ناڕێکە، ئەی قەلی ڕەشی دوور![1] کاشکی نێوان من و تۆ نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بوایە. (پارچە):

بەری بەیانی کەسێ ڕووبەڕووت هەڵسێ لە خەو

بەیانی ڕۆژی سەلامەت ئەبێ لە ڕاستی بە شەو[2]

ئێسك گرانێ وەکوو خۆت لەگەڵ خۆتا دانێ

بەلا کەسی وەکوو تۆ لەم جیهانەدا کوانێ؟

سەیرتر ئەوەیە قەلەڕەشیش لە هاوسێ‌یەتیی توتی هاتبوە گیان، (لا حول ولا)ی ئەکرد، لەگەردشی دەوران ئەی‌ناڵان، دەستەکانی وەکوو زیان‌دیدە بە یەکا ئەهانی کە ئەمە چ بەختێکە سەروژێرو چ ئەستێرەیەکی نزم و ڕۆژانی ڕەنگاوڕەنگە، شایانی قەدرو پایەی من ئەوە بوو لەگەڵ قەلێ لەسەر دیواری باخێ بە لەنجەولار بڕۆشتمایە. (تاك):

بەسە بۆ خواپەرست ئەوەن زیندان     کە بچێتە تەویلەی ڕندان

چ تاوانێکم کردووە کە ڕۆژگارم بە سزا خستمیە هەودای هاوڕێ‌یەتی شتێکی خۆپەسەندی ناڕەسەنی زۆر بلێ لەم بەندیخانەیەدا دوچاری کردم؟ (پارچە):

---

(١) غُراب البین: قەلە ڕەشی دووری و فیراق؛ عەرەب لەو باوەڕەدا بوون کە قەلەڕەش بەدیومنە و ئەگەر لە جێگایەك دانیشێت و بخوێنێ دووری ئەخاتە نێوان دۆستان،ـع.

(٢) یانی: لە بەد فەڕی تۆ، ڕۆژی لێ ئەبێ بە شەو،ـع.

هیچ باشد که به قوّتِ پرهیزگاری از وی به سلامت بماند؟ گفت: اگر از مه‌رویان به سلامت مانَد از بدگویان نمانَد.

وَ إِنْ سَلِمَ ٱلْإِنْسَانُ مِنْ سُوءِ نَفْسِهِ          فَمِنْ سُوءِ ظَنِّ ٱلْمُدَّعی لَیْسَ یَسْلَمُ

***

شاید پسِ کار خویشتن بنشستن          لیکن نتوان زبانِ مردم بستن

## حکایت [۱۲]

طوطیی را با زاغی در قفس کردند و از قبحِ مشاهده‌ی او مجاهده همی بُرد و می‌گفت: این چه طلعتِ مکروه است و هیأتِ ممقوت و منظرِ ملعون و شمایلِ ناموزون؟ یَا غُرابَ ٱلْبَیْنِ، یَا لَیْتَ بَیْنی وَ بَیْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَیْنِ.

عَلَی ٱلصَّباح به روی تو هرکه برخیزد

صباحِ روزِ سلامت بر او مَسا باشد

بد اختری چو تو در صحبتِ تو بایستی

ولی چنان که تویی، در جهان کجا باشد؟

عجب‌تر آن که غراب از مجاورتِ طوطی هم به جان آمده بود و ملول شده، لاحَولَ کنان از گردشِ گیتی همی نالید و دست‌های تغابُن بر یکدیگر همی مالید که این چه بختِ نگون است و طالعِ دون و ایّامِ بوقلمون! لایقِ قدرِ من آنستی که با زاغی به دیوارِ باغی بر، خرامان همی رفتمی.

پارسا را بس این قَدَر زندان          که بوَد هم‌طویله‌ی رندان

تا چه گنه کردم که روزگارم به عقوبتِ آن در سلکِ صحبتِ چنین ابلهی خودرای، ناجنس، خیره درای، به چنین بندِ بلا مبتلا گردانیده است؟

کـــەس نـــایەتە بـــن پـایەی دیـوار    کـە وێنـەت بکـا تـیا نـەخش و نـیگار
گەر تۆ لە بەهەشت جێگەت دەس کەوێ    خــەڵکـیکە دۆزەخ ئـەکـەن ئـیختیار

ئەم وتەی پیشینانەم بۆ ئەوە وت هەتا بزانی ئەوەندەی دانا لە نادان بێزارە، نـادانیش ئەوەندە لە دانا ئەسڵەمێتەوە. (پارچە):

زاهیدێ کەوتە کۆمەڵی ڕەنـدان    وتی لەو ناوە دولبەرێ بـەڵخـی
تـرش ڕوو دامــەنیشە بـێزاری    تۆیش لە ناو ئێمە تفتی و تەڵخی

(چواری):

کـــۆمـــەڵێ تـــێکـــەڵ وەك گـــوڵ و لاولاو
تـــــۆ وەك داری وشك لە نــــــاویان ڕواو
چـەشنی بـای نـارێك، وەك سـەرمای نـاخۆش
وەك بـــەفری کـــەوتوو، ســـەهۆڵی بـەستراو

## چیرۆك (١٣)

هاوڕێیەکم هەبوو کە ساڵەها پێکەوە سەفەرمان کردبوو، وە نان و نمەکی یـەکمان خواردبوو، وە حقووقی هاوڕێیەتی بێپایانمان هـەبوو، دوایـی بـە هـۆی قـازانجێکی کەمەوە ئازاری دڵی بە ڕەوا دیم و دۆستایەتی کرد بە سوپەر[1]. لەگـەڵ ئـەم هـەمووە لە هـەردوو لاوە دڵمـان پـێکـەوە بـەستراوی هـەبوو، لەبـەر ئـەوە کـە بـیستبووم ڕۆژێ لە ئەنجومەنێکا دوو شیعری وتبوم. (پارچە):

بە خەندەی سوێری خۆی بێ لە دەر نیگار    زیـاتر خـوێ ئـەکـا بـە زامـی زامـدار
گەر سەری زوڵفی خۆش بۆم دەس کەوێ    چـەشنی داوێنـی سـەخی بـۆ هـەژار[2]

(١) شێخی سەعدی نووسیویەتی: «دوستی سپری شد» واتە: دۆستی لە نێوان ئێمـەدا دوایـی هات،ـع.
(٢) ئەم شیعرەی سەعدی لە (ریسالەی ساحیبییە)دایە، بڕوانە : کلیات، چاپی م، فـروغی، ل ٧٦٥. «ع.م».

کس نـــیاید بـــه پـــای دیـــواری — که بر آن صـــورتت نگـــار کـــنند
گر تو را در بهشت بـــاشد جـــای — دیگـــران دوزخ اخـــتیار کـــنند

این ضرب‌المثل بدان آوردم تا بدانی که صد چندان که دانا را از نادان نفرت است، نادان را از دانا وحشت است.

زاهـــدی در ســـماعِ رنـــدان بـــود — زان میان گـــفت شـــاهدی بـــلخی
گر ملولی ز مـــا، تُـــرُش مـــنشین — که تو هـــم در دهـــانِ مـــا تـــلخی

***

جمعی چو گـــل و لاله بـــه هـــم پـــیوسته — تـــو هـــیزم خشک در مـــیانی رســـته
چون بادْ مخالف و چـــو ســـرما نـــاخوش — چون برف نشسته‌ای و چون یـــخ بســـته

## حکایت [۱۳]

رفیقی داشتم که سال‌ها با هم سفر کرده بـودیم و نـمک خـورده و بـی‌کران حـقوقِ صحبت ثابت شده، آخر به سببِ نفعی اندک آزارِ خاطرِ من روا داشت و دوستی سپری شد و با این همه از هردو طرف دل‌بستگی بود به حکمِ آن که شنیدم که روزی دو بیت از سخنانِ من در مجمعی همی گفتند که:

نگارِ من چو درآیـــد بـــه خـــنده‌ی نـــمکین
نـــمک زیـــاده کـــند بـــر جـــراحتِ ریشـــان
چه بودی ار سرِ زلفش به دســـتم افـــتادی
چو آســـتینِ کـــریمان بـــه دستِ درویشـــان

دەستەیەك لە دۆستان بە جوانیی ئەم وتەیە نەوەك بە جوانیی ڕەوشتی من شاهیدی‌یان دابوو،[1] وە ئافەرین‌یان کردبوو. ئەو دۆستەیش لە ناو ئەوانا ستایشی زیادی کردبوو، وە لەسەرفەوتانی هاوڕێ‌یەتی دێرین داخی خواردبوو، وە دانی نابوو بەهەڵەی خۆیا. دەرکەوت کە لەلای ئەویشەوە ئارەزوو هەیە. ئەم شیعرانەم بۆ ناردو ڕێ کەوتم: (پارچە).

نەبوو لە جیهان پەیمانو وەفا    لامان وا کردت بەد عەهدی‌و جەفا
یەکجار لە جیهان دڵم پێ‌بەستی    نەمزانی وا زوو پەیمان شکستی
بێ ئەگەر سەودای ڕێکیت لا چاکە    خۆشەویست‌تری لەلام لەوساکە

## چیرۆك (١٤)

پیاوێ ژنێکی خاوەن جەماڵی ڕۆیشت [(فەوتی کرد)]. دایکی ژنە پەرپووت بوو بە هۆی مارەیی‌یەوە لە ماڵا مایەوە لە هاودەمی چارەی نەئەدی هەتاکۆمەڵێ لە هاوڕێ‌یانی هاتن بۆ پرسینی حاڵی. یەکێ وتی: چۆنی لە دووریی ئەو یارە شیرینە؟ وتی: نەبینینی ژن ئەوەندە گران نییە وەك بینینی دایکی ژن «خەسوو». (تاك):

گوڵ بە تاڵان ڕۆیی، ماوە دڕكو خار    خەزنەیان هەڵگرت‌و ما لەوجێ‌یە مار

(چواری):

چاوی خۆت لەسەرنووکی ڕم دیتن    خۆشترە لەوەی بینینی دوژمن
پێویستە هەزار دۆست وازلێ‌بێنی    نەوەك ڕووی یەکێ دوژمن ببینی

## چیرۆك (١٥)

دێتە یادم لە ڕۆژانی جوانیما هاتوچۆم هەبوو بۆ شوێنێ‌و، تە ماشام هەبوو بۆ مانگ ڕوویێ. لە تەمووزێکا کە بای گەرمی شەوی ئاوی دەمی وشك ئەکردەوەو بای گەرمی ڕۆژی مۆخی لە ئێسقانا ئەهێنایە جۆش بە هۆی بێ‌هێزیی ئادەمیزادییەوە، توانای گەرمی دووریم نەبوو، پەنام بردە بەر سێبەری دیوارێ، چاوەڕوان بووم کەسێ گەرمای تەموزیم بە ئاوێکی سارد بنیشێنێتەوە. ناکاو لە تاریکی داڵانی ئەو خانووەوە ڕووناکی‌یەك

---

(١) لە هەندێ نووسخەدا بەم شێوەیە: دەستەیەك لە دۆستان، لە بەر دەروون پاکی خۆیان شاهیدی‌یان لە سەر جوانی ئەم وتەیە دابوو،ـ ع.

طایفه‌ی دوستان بر لطفِ این سخن نه، که بر حُسنِ سیرتِ خویش گواهی داده بودند و آفرین کرده و آن دوست هم در آن جمله مبالغت نموده و بر فوتِ صحبتِ دیرین تأسف خورده و به خطای خویش اعتراف کرده. معلوم شد که از طرفِ او هم رغبتی هست؛ این بیت‌ها فرستادم و صلح کردیم.

نه ما را در میان عهد و وفا بود؟ جفا کردیّ و بدعهدی نمودی
به یک بار از جهان دل در تو بستم ندانستم که برگردی به زودی
هنوزت گر سرِ صلح است باز آی کزان محبوب‌تر باشی که بودی

## حکایت [۱۴]

یکی را زنی صاحب‌جمال درگذشت و مادر زنِ فرتوت به علّتِ کابین در خانه متمکّن بماند. مرد از محاورتِ وی به جان رنجیدی و از مجاورتِ او چاره ندیدی؛ تا گروهی آشنایان به پرسیدن آمدندش. یکی گفتا: چگونه‌ای در مفارقتِ یارِ عزیز؟ گفت: نادیدنِ زن بر من چنان دشوار نمی‌نماید که دیدنِ مادر زن.

گُل به تاراج رفت و خار بماند گنج برداشتند و مار بماند
دیده بر تارَکِ سِنان دیدن خوش‌تر از رویِ دشمنان دیدن
واجب است از هزار دوست برید تا یکی دشمنت نباید دید

## حکایت [۱۵]

یاد دارم که در ایّامِ جوانی گذر داشتم به کویی و نظر با رویی. در تموزی که حَرورش دهان بخوشانیدی و سَمومش مغزِ استخوان بجوشانیدی، از ضعفِ بشریّت تابِ آفتابِ هَجیر نیاوردم و التجا به سایه‌ی دیواری کردم، مترقّب که کسی حَرِّ تموز از من به بَردِ آبی فرو نشانَد که همی ناگاه از ظلمتِ دهلیزِ خانه‌ای روشنایی بتافت یعنی جمالی که زبانِ

بریسکایەوە یانی جەماڵێ کە زمانی فەساحەتو ڕەوانی لە بەیانی جوانی‌یا بێ‌دەسەڵاتە، وەکوو لە شەوێکی تاریکا بەیان دەرکەوێت، یا لە تاریکستانا ئاوی زیندەگانی هەڵقوڵێ، پەرداغێ بەفراوی بە دەستەوە گرتووەو شەکری تێ کردووەو گوڵاوی تێکەڵ کردووە. نازانم بە گوڵاو وا بۆنی خۆش کردبوو یا چەند دڵۆپێ لە گوڵی ڕووی تکابوە ناوی. بە کورتی شەکراوم لەو دەستە جوانە وەرگرتو خواردمەوە ژیانم سەرلەنوێ وەرگرت. (شیعر):

ظَمأٌ بِقَلْبِی لایَکادُ یُسِیغُهُ     رَشْفُ الزُلالِ وَلَوْ شَرِبْتُ بُحوراً

تینوێتی دڵم بۆ نابی تێرئاو     با بش‌خۆمەوە چەند دەلیایەك ئاو[١]

(چواری):

شادی بۆ پیرۆزبەختیی ئەو کەسە
ڕووی وەها بینێ بەیان هەڵسێ لەخەو
مەستی ساقی سوبحی مەحشەر دێتە هۆش
مەستی مەی بێدار ئەبێ خۆ نیوەشەو

## چیرۆك (١٦)

ساڵێ موحەممەد خوارەزم‌شا، ڕەحمەتی خوای لێ‌بێ، بۆ کارسازی ڕێکەوتنی بە باش ئەزانی لەگەڵ «خەتا» دا[٢]. هاتمە مزگەوتی کاشغەر. کوڕێکم دی لەوپەڕی ڕێك ئەندامی‌یا، وە دوا پایەی جەماڵ وەکوو پێشینان فەرموویانە: (هۆنراوە).

مامۆستا شۆخی‌و دولبەریی فێر کرد     دووری‌و گلەو ناز زۆرداریی فێر کرد[٣]

---

(١) لە گیانی ئارەزووما، گرشەیێکی     گەلاوێژ کوێر ئەکا، هەر ورشەیێکی
ئەوەن تینووم بە ئاوی بەحری عەشقت     تەواو بت‌خۆمەوە هەر پرشەیێکی،-«ك».

(٢) د. ڕوستەم علی‌یف لای وایە کە باسی ئەو ئاشتییە ئەکات کە لە ساڵی ١٢١٠ دا لە نێوان خوارەزمشاه مەحمودو قەرەکیتابا مۆرکرا. ئەگەر سەعدی حیکایەتەکەی وەرنەگرتبێ، ئەوا بوونی ئەو لە کاشغەر لەم کاتەدا شتێکی زۆر گرنگە لە مێژووی ژیانی‌دا. «ع.م».

(٣) لە هەندێ نووسخەدا دوای ئەم شیعرە ئەم شیعرەش هەیە:

دگر نه عزم سیاحت کند نه یاد وطن     کسی که بر سر کویت مجاوری آموخت

واتە:

نە یادی وەتەن ئەکا نە سەفەر     ئەوە کە بوو بە دراوسێی تۆ،-ع.

فصاحت از بیانِ صباحتِ او عاجز آید، چنان‌که در شبِ تاری صبح برآید یا آبِ حیات از ظلمات به در آید، قدحی برفاب بر دست و شکر در آن ریخته و به عَرَق برآمیخته. ندانم به گُلابش مُطیّب کرده بود یا قطره‌ای چند از گُلِ رویش در آن چکیده. فی الجمله، شراب از دستِ نگارینش برگرفتم و بخوردم و عمر از سر گرفتم.

ظَـمَاٌ بِـقَلْبِی لاَ یَکـادُ یُسـیغُهُ　　　رَشْفُ ٱلزُّلالِ وَ لَوْ شَرِبْتُ بُحُوراً

***

خرّم آن فرخنده طـالع را کـه چشـم　　　بـر چـنین روی اوفـتد هـر بـامداد
مستِ مـی بـیدار گـردد نـیم‌شب　　　مستِ سـاقی، روزِ مـحشر بـامداد

## حکایت [۱۶]

سالی محمّدِ خوارزمشاه، رَحْمَةُ اللهِ عَلَیْه، با ختا برای مصلحتی صلح اختیار کرد، به جامعِ کاشغر درآمدم، پسری دیدم به خوبی به غایتِ اعتدال و نهایتِ جمال، چنان‌که در امثالِ او گویند:

معلّمت همه شـوخیّ و دلبـری آمـوخت　　　جفا و ناز و عتاب و سـتمگری آمـوخت

بەم قەدو شێوەو خوو ڕەوشت ئینسان          نەبووە لە پەری شێوەی کرد نیشان

موقەددیمەی نەحوی زەمەخشەریی لە دەستا بوو ئەیخوێندەوە (ضَرَبَ زَید عَمْرواً) (واتە: زەید دای لە عەمر). وتم: ئەی کوڕ! خوارەزمو خەتا ڕێکەوتن، زەیدو عەمر هێشتا دوژمنایەتی‌یان ماوە! پێکەنی، نیشتمانی لێ‌پرسیم، وتم: خاکی پاکی شیراز. وتی: لە وتارەکانی سەعدی چی‌ئەزانی؟ وتم:

بُـلِيتُ بِـنَحْوِيٍّ يَـصُولُ مُـغاضِباً          عَـلَيَّ، كَـزَيْدٍ فـی مُـقابلةِ العَـمرِو

عَلیٰ جَرِّ ذَيْـلٍ لَـيسَ يَـرْفَعُ رأْسَـهُ          وَ هَلْ يَسْتَقِيمُ الرَّفْعُ مِنْ عامِلِ الجَرِّ

واتە:

دوچاری نەحوی‌یێك بووم کە لێم ئەدا پەلامار

بەقینەوە، بە چەشنی زەیدی بەرامبەری عەمر

لە سەرکێشانی دامەن هەڵنابڕێ سەریشی

بەلێ ناڕێکیی نەحوو ڕەفعە لە عامیلی جەر

هەندێ چووە بیر کردنەوە، وتی: شیعرەکانی ئەو لەم زەمینە [(ولاتە)] زۆرتر فارسییە. ئەگەر فارسی بڵێیت لە تێ‌گەیشتن نزیك‌تر ئەبێ. (كَلِّمِ النّاسَ عَلیٰ قَدْرِ عُقُولِهِم). لەگەڵ خەلکا بە پێی عەقڵو تێ‌گەیشتنیان بدوێ وتم:

تاوەکوو تەبعت هەوسی نەحوی کرد          شێوەیی عەقڵی لە دڵم مەحو کرد

ئـــەی دڵی دڵدار لە داوی تـــۆدا          ئێمە خەریکی تۆو، تۆ عەمرو زەید

بەیانی‌یەك کە نیازی سەفەرمان کردبوو، تووەمەز کەسێك پێی وتبوو فلان کەس سەعدی‌یە. بە ڕاکردن هات لوتفی نواندو داخی خوارد کە ئەم چەند کاتە بۆچی نەت وتووە کە فلانم، هەتا بە سوپاسی هاتنی گەورە پیاوان کەمەری خزمەتم ببەستایە. وتم: (نیو شیعر)

تۆ لە شوێنێکی لە من دەنگ نایە بۆ واتەی منم

وتی: چی ئەبێ ئەگەر لەم خاکە ڕۆژێ بحەسێیتەوە هەتا لە خزمەتتا بەهرەمەند ببین؟ وتم: ناتوانم ڕێکی ئەم چیرۆکە هۆنراوە:

دگر نه عزمِ سیاحت کند نه یادِ وطن　　کسی که بر سرِ کویت مجاوری آموخت
من آدمی به چنین شکل و خوی و قدّ و روش　　ندیده‌ام مگر این شیوه از پری آموخت

مقدمه‌ی نحوِ زَمَخْشَری در دست و همی خواند: ضَرَبَ زَیْدٌ عَمْرواً وَکانَ اَلْمُتَعَدّی عَمْرواً. گفتم: ای پسر، خوارزم و ختا صلح کردند و زَید و عَمرو را همچنان خصومت باقی است؟ بخندید و مولدم پرسید. گفتم: خاکِ شیراز. گفت: از سخنانِ سعدی چه داری؟ گفتم:

بُلیتُ بِنَحْوِیٍّ یَصُولُ مُغاضِباً　　عَلَیَّ کَزَیْدٍ فِی مُقابَلَةِ اَلْعَمْرو
عَلَیٰ جَرِّ ذَیْلٍ لَیْسَ یَرْفَعُ رَأْسَهُ　　وَ هَلْ یَسْتَقِیمُ اَلرَّفْعُ مِنْ عامِلِ اَلْجَرِّ؟

لختی به اندیشه فرو رفت و گفت: غالبِ اشعارِ او در این زمین به زبانِ پارسی است؛ اگر بگویی به فهم نزدیک‌تر باشد. کَلِّمِ اَلنّاسَ عَلَیٰ قَدْرِ عُقُولِهِمْ. گفتم:

طبعِ تو را تا هوسِ نحو کرد　　صورتِ عقل از دلِ ما محو کرد
ای دلِ عشّاق به دامِ تو صید　　ما به تو مشغول و تو با عمرو و زید

بامدادان که عزمِ سفر مصمّم شد، گفته بودندش که فلان سعدی است. دوان آمد و تلطّف کرد و تأسّف خورد که چندین مدّت چرا نگفتی که منم تا شکرِ قدومِ بزرگان را به خدمت میان بستمی. گفتم: با وجودت ز من آواز نیاید که منم. گفتا: چه شود اگر در این خطّه روزی چند برآسایی تا به خدمت مستفید گردیم؟ گفتم: نتوانم به حکمِ این حکایت:

گەورەیێکم دی لە پای کۆساریێ | لە جیهان ڕازی بە ژووری غاریێ
وتم: تەشریفت بۆنایەیتە شار | لە دڵ لابدەی عەزمی بەندی غار
وتی: شار پڕیە لە پەری ڕویان | گڵ کاتێ زۆر بوو فیلی خلیسکان

ئەوەم وتو سەرو ڕووی یەکترمان ماچ کردو ماڵئاواییم خواست. (مەسنەوی):

کـەڵکـی کـوا مـاچی سـەرکوڵمـەی دڵدار
بـــۆ دوعـــاخوایـــی لە یـەكکـەن هـاوار
بـــۆچ ســـێو لە یـاران دوعـاخوایـی کـرد
نیوەی ڕووی سوورەو نیوەکەی کەی زەرد؟[١]

إنْ لَـــــمْ أَمُتْ يَـــوْمَ الوِداعِ تَأَسُّـــفاً
لاتَـــحْسَبُونی فـــی المَـــوَدَّةِ مُـــنصِفاً

ڕۆژی مـاڵئـاوایـی نـەمرم گـەر لە داخـانا بـرا
وامەزانـە خـاوەن ئـینسافم لە عـیشقی دولبـەرا

## چیرۆك (١٧)

خەرقە پۆشێ لە کاروانی حیجازا هاوڕێمان بوو، یەکێ لە سەردارانی عـەرەب سـەد دیناری دایە کە قوربانی بۆ بکات[٢]، دزانـی هـۆزی خـوفاجی لە نـاکـاو دایـان بـەسەر کاروانەکەدا پاکیان برد. بازرگانەکان دەسیان کرد بە گریانو زاریو هاواری بێسوودیان ئەکرد. (شیعر):

گەر زاری بکەی یا هاواری وا | ماڵێ دز بردی نـایگێڕێتـە دوا

تومەز دەروێشێکی پیاوچاك[٣] لەسەرشێوەی خۆی مابوو، تێك نەچوبوو، پێم وت: بۆچی ئەوەی لای تۆیان نەبرد؟ وتی: بەڵێ بردیان بەڵام ئەوەندەم خوونەدابـوویـە کـە لە کاتی جیابوونەوەیا بۆی نەخۆشکەوم. (شیعر):

---

(١) چـەندە نـاخۆشـە لە بـۆ هـاودەردان | لە دوای ماچو مووچ دەس لە یەك بەردان
چـونکە دوچـارە سـێویش بـەم دەردە | لایـێکـی سـوورەو لایـێکـی زەردە،،«ك».

(٢) لە نووسخەکەی بەر دەستمان نووسراوە: «تا نفقهٔ فرزندان کند» واتە: تا بیکا بـە خـەرجـی منالەکانی،ـع.

(٣) ئەوایە وابوایە: «دەروێشە پیاوچاکەکە» مەبەست خەرقە پۆشەکەیە،ـع.

بـــزرگی دیـدم انـدر کـوهساری — قـناعت کـرده از دنـیا بـه غـاری
چرا، گفتم، به شـهر انـدر نـیایی؟ — که باری، بـندی از دل بـرگشایی
بگفت: آن جـا پـری‌رویانِ نـغزند — چو گِل بسیار شـد، پـیلان بـلغزند

این بگفتم و بوسه بر روی هم دادیم و وداع کردیم.

بوسه دادن به روی دوست چه سـود؟ — هـم در آن لحـظه کـردنش بـدرود
سـیب گـویی وداعِ یـاران کـرد — روی از این نیمه سرخ و زان سـو زرد

***

إِنْ لَمْ أَمُتْ يَوْمَ ٱلْـوَداعِ تَأَسُّـفاً — لاَ تَحْسَبُونی فِی ٱلْمَوَدَّةِ مُنْصِفاً

## حکایت [۱۷]

خرقه‌پوشی در کاروانِ حجاز همراهِ ما بود؛ یکی از امرای عرب مر او را صد دینار بخشیده بود تا نَفَقه‌ی فرزندان کند. دزدانِ خَفاجه ناگاه بر کاروان زدند و پاک ببردند؛ بازرگانان گریه و زاری کردن گرفتند و فریادِ بی‌فایده خواندن.

گر تضرّع کنی و گـر فـریاد — دزد زر باز پس نخواهـد داد

مگر آن درویشِ صالح که بر قرارِ خویش مانده بود و تغیّری در او نیامده. گفتم: مگر آن معلومِ تو را دزد نبُرد؟ گفت: بلی بردند ولیکن مرا با آن الفتی چنان نبود که به وقتِ مفارقت خسته دلی باشد.

مەبستە بە کەس بە هیچەوە دڵ وەرگرتنەوەی دڵ کارێکە موشکڵ

وتم: ئەوەی وتت ڕێکی حاڵی منە لەگەڵ جوانێ لەکاتی گەنجیما وا ڕێکەوت تێکەڵی و خۆشەویستی یەکی ڕاستمان هەبوو، تا ڕادەیەك قیبلەی چاوم جەماڵی، وە سوودو سەرمایەی ژیانم ویساڵی بوو. (چواری):

مەگەر فریشتە لەسەر ئاسمان وەهابێ جوان

بە جوانی شێوەی ئەو لەم زەمینە نابێ کەس

قەسەم بە دۆستی، حەرامە لەسەر ئەوا هەمدەم

لە تووی ئادەمی ئینسان وا نەکەوتە دەس

لەناکاوێ پێی بوونی بە گڵی نەبوونا ڕۆچوو، وە دووکەڵی جیایی لە بنەچەیەوە بەرز بووەوە. ڕۆژەها لەسەر خاکی هەمنشینیم کرد. لە ڕیزی ئەو شتانەی لە دووری ئەوا وتم: یەکێ ئەمە بوو: (پارچە).

خۆزگە ئەو ڕۆژەی بە پێی تۆدا ئەچوو دڕکی ئەجەل

دەستی گیتی تیغی فەوتانی ئەنامە تەوقی‌سەر

تاکوو بێ‌تۆو لەم جیهانە نەی‌دیایە چاوی من

چۆن لەسەر خاکت منم دانیشتووم خاکم بەسەر

(پارچە):

ئەو کەسەی نەیبوو هیچ ئارامو خەو تا گوڵو نەسرین نەسرەوتایە شەو[1]

وا دەستی گیتی گوڵی ڕووی وەران لەسەر خاکەکەی ئەو دڕکی ڕوان

لە دوای جیابوونەوەی ئەو خۆم وا دڵنیا کرد کە ئیتر فەرشی ئارەزوو ڕانەخەم، وە نزیکی کەس دانەنیشم. (پارچە):

کەڵکی دەلیا زۆرە نەبوایە ئەگەر ترسی شەپۆل

هەمدەمی گوڵ خۆشە نەتبێ تۆ ئەگەر ترسێ لە خار

(١) نیوەی دووهەمی ئەم شیعرە لە نووسخەی بەردەستی ئێمە بەم شێوەیە: «تا گل و نسرین نفشاندی نخست» واتە: هەتا گوڵ و نەسرینی نەوەشاندایە بەسەر جێگەو بانی خۆی دا نە دەخەوت....ع.

نباید بستن اندر چیز و کس دل    که دل برداشتن کاری است مشکل

گفتم: موافقِ حالِ من است آن چه گفتی که مرا در عهدِ جوانی با جوانی اتّفاقِ مخالطت بود و صدقِ مودّت، به مثابتی که قبله‌ی چشمم جمالِ او بودی و سود و سرمایه‌ی عمرم وصالِ او.

مگر ملایکه بر آسمان وگر نه بشر
به حُسنِ صورت او در زمی نخواهد بود
به دوستی که حرام است بعد از او صحبت
که هیچ نطفه چنو آدمی نخواهد بود

ناگهی پای وجودش به گِلِ عدم فرورفت و دودِ فراق از دودمانش برآمد. روزها بر سرِ خاکش مجاورت کردم و از جمله که در فراقِ او می‌گفتم این دو بیت بود:

کاش کان روز که در پای تو شد خارِ اجل
دستِ گیتی بزدی تیغِ هلاکم بر سر
تا در این روز جهان بی‌تو ندیدی چشمم
این منم بر سرِ خاکِ تو که خاکم بر سر!

***

آن که قرارش نگرفتی و خواب    تا گل و نسرین نفشاندی نخست
گردشِ گیتی گُلِ رویش بریخت    خاربُنان بر سر خاکش برُست

بعد از مفارقتِ وی عزم کردم و نیّت جزم که بقیّتِ زندگانی فرشِ هوس درنوردم و گردِ مجالست نگردم.

سودِ دریا نیک بودی گر نبودی بیمِ موج
صحبتِ گُل خوش بُدی گر نیستی تشویشِ خار

دوێنێ وەك تاوس لە باغی وەسڵی ئەو نازم ئەکـرد

ئیمرۆ دوور کەوتە لە یارم پێچ ئەخۆم مـانەندی مـار

## چیرۆك (۱۸)

وتاری لەیلو مەجنوون، شۆڕو شێوەی ئەویان، بە یەکێ لە پادشایانی عەرەب وت: کە بە تەواوی فەزڵو بەلاغەتەوە لە بیابانا سەری ناوەتەوە، وە جڵەوی دەسەڵاتی لە دەست داوە. فەرمانیدا هێنایانە ڕوو کەوتە تانووت لێدانی کە لە شەرەفی نـەفسی ئـادەمیزاد چ کەمو کوڕیت دی کە خووت گرتووە بە جانەورانی دەشتەوە، وە وازت لە هـاونوشینیی ئادەمیزاد هێناوە؟ مەجنوون ناڵانی، وتی: (شیعر).

| | |
|---|---|
| وَ رُبَّ صَـدیقٍ لامَـنی فـی وِدادِهـا | اَلَمْ یَرَها یَوماً فَیُوضَحُ لی عُذْرِی؟[1] |
| زۆر هاوڕێ تـانەی لە حـوبی لێدام | بۆ نـەیدی ڕۆژی بـیانووم دەرکـەوێ |
| خـۆزگـە ئـەوانـەی تـانەم لێ ئـەدەن | ئـەی‌یار! ئـەیاندی ڕووی دولبـەرێ |
| تـا تـۆیـان ئـەدی لە بـاتی تـرنج | بـێ ئـاگـا دەسـتی خـۆیـان ئـەبڕی |

هەتا ڕاستی مەعنا لەسەر شێوەی دەعوام شەهادەتی بدایە ﴿فَذٰلِکُنَّ الَّذِی لُـمْتُنَّنِی فِیْهِ﴾ (ئەوەتان بوو تانووت‌تان لێ ئەدام).[2]

پادشا بە دڵیا هات جەماڵی لەیلا ببینێ هەتا بزانێ چ شێوەیەکی هەیە کە بووەتە هۆی ئەم بەڵاو فیتنەیە؟ فەرمانی دا بۆی بێنن. بە تیرەکانی عەرەباگەڕان، تا هێنایانە دەست، وە لە خەیمەی پادشادا دایاننا. لە شێوەی ورد بـووەوە، بـە کـەم هـاتە بـەرچـاوی چـونکە کەمترین کارەکەری ناو ماڵی بە جـەماڵو زینەت لەو زیـاتر بـوو. مـەجنوون بـە ژیـری تێ‌گەیشت. وتی: لە دەروازەی چاوی مەجنوونەوە سەیر کردن پێویست بوو هەتا وردی تەماشا بۆ تۆ دەرکەوتایە! (شیعر):

---

(۱) گەلێ لۆمەم دکەن یاران، لە بەرچـی بـوومە وێڵ گـەردت
شەمی ڕووی تۆ ببینن، جا دەزانن بـۆچـی مـن شـێتـم،-«ك».
(۲) واتە: ئەوە هەر ئەو کەسەیە، کە تانەو تەشەری عەشقی ئەوتان لێ ئەدام. «ك»

دوش چون طاووس می‌نازیدم اندر باغِ وصل
دیگر امروز از فراقِ یار می‌پیچم چو مار

## حکایت [۱۸]

یکی را از ملوکِ عرب حدیثِ مجنونِ لیلی و شورشِ حالِ وی بگفتند که با کمالِ فضل و بلاغت سر در بیابان نهاده است و زمامِ اختیار از دست داده. بفرمودش تا حاضر آوردند و ملامت کردن گرفت که در شرفِ انسان چه خلل دیدی که خوی بهایم گرفتی و ترکِ عشرتِ مردم گفتی؟ گفت:

وَ رُبَّ صَدِیقٍ لاٰمَنی فِی وِدادِها     أَلَمْ یَرَها یَوْماً فَیُوضِحَ لِی عُذْری؟

***

کاش کانان که عیبِ من جُستند     رویت، ای دلستان، بدیدندی
تا به‌جای ترنج در نظرت     بی‌خبر دست‌ها بریدندی

تا حقیقتِ معنی بر صورتِ دعوی گواه آمدی که فَذٰلِکُنَّ ٱلَّذِی لُمْتُنَّنِی فِیهِ. مَلِک را در دل آمد جمالِ لیلی مطالعه کردن تا چه صورت است موجبِ چندین فتنه؛ پس بفرمودش طلب کردن. در احیاءِ عرب بگردیدند و به دست آوردند و پیشِ مَلِک در صحنِ سراچه بداشتند. مَلِک در هیأتِ او تأمّل کرد و در نظرش حقیر آمد، به حکمِ آن که کمترین خدمِ حرمِ او به جمال از وی در پیش بود و به زینت بیش. مجنون به فراست دریافت، گفت: از دریچه‌ی چشمِ مجنون بایستی در جمالِ لیلی نظر کردن تا سرِّ مشاهده‌ی او بر تو تجلّی کند.

مـــا مَـــرَّ مِـــنْ ذِكْـــرِ الحِـــمىٰ بِـــمَسْمِعِي
لَـــوْ سَـــمِعَتْ وُرْقُ الحِـــمىٰ صــاحَتْ مَـعي
يـــــامَعْشَرَ الخُـــــلّانِ قُـــــولُوا لِـــــلْمُعا
فـــــىٰ: لَسْتَ تَـــــدْرِي مـــابِقَلْبِ المُـــوجَعِ

ناوی کۆی دێته گوێم گەر کۆتـری ئـەو کـۆیـە وا
بێتە گوێ هاوار ئەکا ڕێك هەروەکو هاواری من
ئەی گەلی دۆستان بڵێن بەو تەندروستە ڕستە تۆ
پـێت نـەزانـیوە دڵی پـڕ ئێشـو پـڕ ئازاری مـن

(تاك):

دەردی زام نـــییە لای تـــەندروستان — مەڵێ دەردی خۆت مەر بە هاودەردان
بـــــێ ســـــوودە وتـــــن لە زەردەواڵە — بـــەوەی نـەیدیوە هـەرگیز پـێوەدان
تاتۆیش تێ نەگەیت بە چـەشنی ئـێمـە — حاڵمان ئەنوێنێ لەلات وەك ئەفسان[١]

## چیرۆك (١٩)

ئەگێڕنەوە کە قازی هەمەدان لەگەڵ کوڕە نالبەندێکا سەرخۆش بوو. ناڵی دڵی لە ئاگری ناڕەحەتی ڕۆزگارا بوو، بە ئارەزوو چاوەڕوان ڕێکی حاڵی خۆی ئەیوت:

ئـەو سـەروی قـەد بـڵنـدە لەگـەڵ هـاتە بـر دووچـاو
دڵمـــی لە دەس فـــڕانو دوو پـێمـی لە جـێی خـزان
ئـــەو چـــاوکراوە بـــردی دڵی مـــن بـــە هـــۆی کـــەمەند
تا دڵ نەدەیتە کەس ببەستە دووچاوت لە ڕووی کەسان[٢]

---

(١) لە نووسخەکەی بەردەستمان ئەم شیعرەش هەیە:
سـوز مـن بـا دیگـری نسبت مکـن — او نمک بر دست و من بر عضو ریش
واتە:
ئـێشـم وەک ئـێشـی خـەڵکی مـەزانـە — ئەو خوێی لە دەستەو من لە سەر زامان.ـع.
(٢) ئەم نیوە شیعرە بەم شێوەش ئەوترێ:
دوو چاوت ببەستە باکوو دڵت نەبەن چاوبەسان.ـ«ك».

مَا مَرَّ مِنْ ذِكْرِ اَلْحِمیٰ بِمَسمَعی　　　لَوْ سَمِعَتْ وُرْقُ اَلْحِمی صاحَتْ مَعی

یَا مَعْشَرَ اَلْخُلاَّنِ قُولُوا لِلْمُعا　　　فا لَسْتَ تَدْری مَا بِقَلْبِ اَلْمُوجَعِ

***

تندرستان را نباشد دردِ ریش　　　جز به همدردی نگویم دردِ خویش

گفتن از زنبور بی‌حاصل بوَد　　　با یکی در عمرِ خود ناخورده نیش

تا تو را حالی نباشد هم‌چو ما　　　حالِ ما باشد تو را افسانه پیش

سوزِ من با دیگری نسبت مکن　　　او نمک بر دست و من بر عضوِ ریش

## حکایت [۱۹]

قاضیِ همدان را حکایت کنند که با نعلبند پسری سرخوش بود و نعلِ دلش در آتش؛ روزگاری در طلبش متلهّف بود و پویان و مترصّد و جویان و بر حَسَبِ واقعه گویان:

در چشمِ من آمد آن سروِ بلند　　　بربود دلم ز دست و در پای افگند

این دیده‌ی شوخ می‌برد دل به کمند　　　خواهی که به کس دل ندهی دیده ببند

بیستم لە گوزەرێکا تووشی قازی بوو هەندێکی لەو وتارانە بەرگوێ کەوتبوو، بە ئەندازەیەك ڕەنجابوو بەیان ناکرێت. جنێودانێکی بێپەروایانەی دەس پێ کردو ناشیرینی وت، وە دەستی دایە بەرد هەڵگرتن، لە بێ حورمەتی هیچی نەهێشتەوە. قازی بە یەکێکی وت: لە زانا گەورەکان کە هاودەمی خۆی بوو:

ئـەو دولبـەرە ئـەو گـرتنی قـینەی بـینە

ئەو پەنجە لە ناو بروی ترش‌و شیرینەی بینە

لە وڵاتی عەرەب ئەڵێن: (ضَرْبُ الْحَبِيبِ زَبِيبٌ) لێدانی خۆشەویست مێوژە.

| | |
|---|---|
| لە دەسـتی تـۆ مـستێ بـۆ نـاودەم دان | خۆشترە لە دەستی خۆم پێی بخۆم نان |

هەروەها لە بێ‌شەرمی ئەو جەوانمەردی [چاوپۆشی] دەرئەکەوێت. (شیعر):

| | |
|---|---|
| تـرێ تـازە بـێ تـرشە تـامی لە دەم | بوەستی دوو سێ ڕۆژێ شیرین ئەبێ |

ئەوەی وت وهاتەوە بۆ سەر کورسیی قەزاوەت. چەند کەسێ پیاوی گەورەی عادڵ لە ئەنجومەنی دادگای ئەوابوون زەمینی خزمەتیان ماچ کرد کە بە ئیزنی ئەو چەند وتەیەك لە خزمەتیا ئەڵێن ئەگەرچی بێ‌ئەدەبییە، چونکە گەورەکان فەرموویانە: (شیعر).

| | |
|---|---|
| نەك لە هەر وتار باس کەی ڕەوایە | خـەتا لەگـەورە گـرتن، خـەتایە |

بەڵام لەبەر ئەوەی نیعمەتی ڕابوردووی ئەو گەورەیە لە هەموو ڕۆژانا بۆ بـچووکان بەردەوام بووە، ڕێکی کارێك ببینین‌و پێت نەڵێین جۆرێکە لە خەیانەت. ڕێگـەی ڕاست ئەوەیە لەگەڵ ئەم کوڕە نزیك بە تەمای نەکەویت، و فەرشی خۆشەویستیی لێ ڕانەخەیت. پایەی قەزاوەت پایەیەکی بەرزو پتەوە تاوانی ناشیرینی لێ هەڵمەسوو، دۆستەکەت ئەوە بوو کە دیت، وە وتاری ئەوە بوو کە بیستت! (مەسنەوی):

| | |
|---|---|
| پیاوێ بـێ ئـابروو بـووبێ فـراوان | چ باکی هەیە لە ئابرووی کەسان؟ |
| زۆر ناوی پاکی کـاتی پـەنجاساڵ | بە نـاوێکـی پیس ئـەبێ پـایەماڵ |

قازی ئامۆژگاری یارانی لا پەسەند هات بە دڵ، و ئافەرینی هەست‌و بیریانی کـرد و وتی: ئەی خۆشەویستەکانم ورد بوونەوە لە کارسازی منا عـەینی ڕاستییە و وتـارێکـی بێ‌وەڵامە، بەڵام: (شیعر).

شنیدم که در گذری پیشِ قاضی بازآمد برخی از این معامله به سمعش رسیده و زایدالوصف رنجیده؛ دشنام بی‌تحاشی داد و سَقَط گفت و سنگ برداشت و هیچ از بی‌حرمتی نگذاشت. قاضی یکی را گفت از علمای معتبر که هم‌عنانِ او بود:

آن شاهدی و خشم گرفتن بینش وان عُقده بر ابروی تُرُش، شیرینش

عرب گوید: ضَربُ ٱلْحَبیبِ زَبیبٌ.

از دستِ تو مشت بر دهان خوردن خوش‌تر که به دستِ خویش نان خوردن

همانا که از وقاحتِ او بوی سماحت می‌آید.

انگورِ نو آورده تُرُش طعم بوَد روزی دو سه صبر کن که شیرین گردد

این بگفت و به مسندِ قضا بازآمد. تنی چند از بزرگانِ عدول که در مجلسِ حُکمِ وی بودندی زمینِ خدمت ببوسیدند که به اجازت سخنی در خدمت بگوییم، اگرچه ترکِ ادب است و بزرگان گفته‌اند:

نه در هر سخن بحث کردن رواست خطا بر بزرگان گرفتن خطاست

ولیکن به حکمِ آن که سوابقِ اِنعامِ خداوندی مُلازمِ روزگارِ بندگان است، مصلحتی که بینند و اِعلام نکنند نوعی از خیانت باشد. طریقِ صواب آن است که با این پسر گردِ طمع نگردی و فرشِ ولع درنوردی که منصبِ قضا پایگاهی منیع است تا به گناهی شنیع ملوّث نگردانی. حریف این است که دیدی و حدیث این که شنیدی.

یکی کرده بی‌آبرویی بسی چه غم دارد از آبروی کسی؟
بسا نامِ نیکوی پنجاه سال که یک نامِ زشتش کند پایمال

قاضی را نصیحتِ یارانِ یکدل پسند آمد و بر حسنِ رای قوم آفرین خواند و گفت: نظرِ عزیزان در مصلحتِ حالِ من عینِ صواب است و مسأله بی‌جواب ولیکن:

لَـــوْ اَنَّ حُـــبّاً بِـــالْمَلامِ يَـــزُول لَسَـــمِعْتُ اِفْكاً يَـــفْتَرِيهِ عَـــذُول

گەر خۆشەویستی بە تانووت لاچێ ئەبێ بوختانی چاکـانم بیستبێ(١)

(تاك):

هـەرچـی ئـەتوانـی نـەسیحەت وتـن بەڵام کەی ئەشێ ڕەنگی ڕەش شتن

(تاك):

یادی تۆم زۆرە لە دڵ غافڵ لە تـۆ نـابم بـە هـیچ

ماری سەرکوتراوەمو توانـام نـییە بـێ تـاب و پـێچ

ئەمەی وتو چەند کەسی بە دوای کوڕەدا وێڵ کردو بەخشایشی زۆری ڕژان وتوویانە: هەرکەسێ زەڕی زۆری لە ترازووە، هێزی زۆری لە بازووە. (تاك):

هەرکەس زەڕی دی سەری دانـەوان تـرازووی ئـاسن بـبێ لەسـەر شـان

بە کورتی شەوێ خەڵوەتی بۆ سەرگرت. هەر لەو شەوە پاسەوانانی شار پێیان زانی کە قازی لە خۆشی‌یا خەوی لێ نەکەوتووەو بە گۆرانییەوە ئەمانە ئەڵێ: (هۆنراوە).

ئیمشەو کەڵەشێر لە کات ناخوێنـێ عـاشق بـاوەش‌و مـاچی لا مـاوە(٢)

زیـنهار تـاچاوی فـیتنە نـووستووە بـێدار بـە ژیـان نـەڕوا بـە بـاوە

تا نەبیسیت بانگی مزگەوتی جومعە یا زرمەی دەهۆڵ لەلای سەراوە(٣)

بە قوقەی پووچی کـەڵەشـێر، لادان لێوت لەسـەر لێو، شـێتیی تـەواوە

قازی لەو حاڵەدا بوو یەکێ لە خزمەتکارانی هات‌و وتی: بۆچ دانیشتوویت، هەڵسەپێ هەتا پێی ڕاکردنت هەیە ڕاکە، حەسوودان لەسەرتۆ یەکیان گرتووە بەڵکە ڕاستی‌یان وتووە تا ئاگری ئاشووب کەمە بەڵکو بە ئاوی تەدبیر بنیشێتەوە، سبەینێ کە بەرز بووەوە عالەمێ داگیرئەکا قازی بە زەردەخەنەوە تەماشای کردو وتی:

---

(١) مەڵێن عارە، ئەم‌و ئەو با نـەزانـێ گڕی دڵ شـوورەیی عـەیبە چـوزانـێ
ئەوەی ئەوڕۆکە ڕسـوابـوو، سـبەینێ دەبێتـە خـاوەنی نـام‌و نـیشانێ.-«ك».

(٢) لە نووسخەکەی مۆسکۆدا ئەم بەیتەش هەیە:
لە پێچی زوڵفی تـەڕا مـەمکی یـار ئـەڵێیت گوێ عاجە وا لەناو قەفی گۆچانی ئابەنوسا

(٣) سەرای ئەتابوك، ئەتابەك.

نصیحت کن مرا، چندان که خواهی    که نتوان شستن از زنگی سیاهی

***

از یادِ تو غافل نتوان کرد به هیچم    سرکوفته مارم نتوانم که نپیچم

این بگفت و کسان را به تفحّصِ حالِ وی برانگیخت و نعمتِ بی‌کران بریخت و گفته‌اند: هرکه را زر در ترازوست زور در بازوست و آن‌که بر دینار دسترس ندارد در همه دنیا کس ندارد.

هرکه زر دید سر فرود آرد    ور ترازوی آهنین دوش است

فی الجمله، شبی خلوتی میسّر شد و هم در آن شب شحنه را خبر شد. قاضی همه شب شراب در سر و شباب در بر، از تنعّم نخفتی و به ترنّم بگفتی:

امشب مگر به وقت نمی‌خواند این خروس

عشّاق بس نکرده هنوز از کنار و بوس

یک دم که دوست فتنه‌ی خفته‌ست، زینهار

بیدار باش تا نرود عمر بر فسوس

تا نشنوی ز مسجدِ آدینه بانگِ صبح

یا از درِ سرای اتابک غریوِ کوس

لب بر لبی چو چشمِ خروس ابلهی بوَد

برداشتن، به گفتنِ بیهوده‌ی خروس

قاضی در این حالت بود که یکی از خدمتگزاران درآمد و گفت: چه نشینی؟ خیز و تا پای داری گریز که حسودان بر تو دَقّی گرفته‌اند بلکه حقّی گفته‌اند تا مگر آتشِ فتنه که هنوز اندک است به آبِ تدبیر فرونشانیم؛ مبادا که فردا چو بالا گیرد عالَمی فراگیرد.

قاضی متبسّم در او نظر کرد و گفت:

پـەنجە لە ڕاوا ئـەگـەر شێری گـرت چـی ئـەبێ ئـەگـەر ڕێوی بـوەستی[١]
ڕووکەرە ڕووی دۆست وازبێنە دوژمن بـا هـەر بـیگەزێ کـە پشـتەدەستی

هەر لەو شەوەدا پادشایان ئاگادار کرد کە لە وڵاتی تۆدا کردەوەیەکی وەها ناشیرین ڕووی داوە، چی ئەفەرموویت؟ پادشا وتی: من بە فـازیلی زەمـانو یـەکـتای ڕۆژگـاری ئەزانم، ڕەنگە دوژمنانی تیا سەرگەرم بووبن .ئەم وتەیە نایەتە گوێی قوبووڵی منەوە مەگەر خۆم ببینم. حەکیمان وتوویانە: (شیعر).

بە توندیو پەلە دەست بۆ تیغ بردن پـەشیمانییەو پشـتی دەست گـەزتن

بیستم لە بەرەبەیانا پادشا لەگەڵ چەند پیاوێکی تایبەتی یا گەیشتە ژوورسەری قازی. ئەوەی لە ناشرینی بیستبووی چاوی پێ کەوت. قازی لە خەوی مەستی یا ئاگاداری پادشا نییە. پادشا وردە وردە بە نەرمی خەبەری کردەوە، وتی: هەڵسـە ڕۆژ هـەڵاتـووە، قـازی تێ گەیشت مەسەلە چییە، وتی: لە کام لاوە هەڵاتووە؟ [پادشا پێی سـەیر بـوو] وتـی: لە ڕۆژهەڵاتەوە. وتی: سوپاس بۆ خـوا کـە هـێشـتا دەرگـای تـەوبە ئـاواڵەیـە، بـە گـوێرەی فەرموودەی پێغەمبەر ـسەلامی خوای لەسەربێ ـکە فەرموویەتی:

«لا تُغْلَقُ بابُ التَّوْبَةِ عَلَى العِبادِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِها». (واتە: دەرگای تەوبە لەسەر خەلك داناخرێ تا ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵنەیەت). «اَسْتَغْفِرُكَ اللّٰهُمَّ وَ اَتُوبُ اِلَيْكَ». (خوایە داوای لێ خۆش بوونت لێ ئەکەمو تەوبەت لا ئەکەم). (پارچە):

دوو شت بوون منیان خستە ناو تاوان عەقڵی ناتەواوو بەختی ڕەش دوان[٢]
گـــورفتار بـــووم شـایانی ئـەوەم بـمبەخشی چـاتر نـەوەك سـزادان

---

(١) فارسیەکەی ئاوایە:
پنجە در صـید بـردە ضـیغم را چە تفاوت کند کە سگ لایـد
دەکرێ بەم شێوە تەرجەمە بکرێتەوە:
پەنجەی شێر ئەگـەر بـەن بـوو لە ڕاوی حەپەی سەگ چییە یا دەنگی ڕاوی، ـع.

(٢) ئەڵێ: یەکەم لەو شتانە کە تاوانی بە سەرما هێنا عەقڵی نا تەواوم بـوو، دوەمـیان بـەختی ڕەشم. ڕەنگە بەم جۆرەش مەعنا بکرێت: عەقڵی کورتو بەختی ڕەش دواندمیانو لەگەڵم بوون بۆیە وام بەسەر هات. بەڵام هەر ئەوەڵەکە جوانترە. «ك».

پـــنجه در صـــید بـرده ضَـیغَم را　　چـه تـفاوت کـن کـه سگ لایـد
روی در روی دوست کـن بگـذار　　تـــا عـــدو پشتِ دست مـی‌خاید

مَلِک را هم در آن شب آگهی دادند که در مُلکِ تو چنین مُنکَری حادث شده است، چه فرمایی؟ مَلِک گفت: من او را از فضلای عصر می‌دانم و یگانه‌ی روزگار، باشد کـه معاندان در حقِ وی خوضی کرده‌اند؛ پس این سخن در سمعِ قبول من نیاید مگر آن‌گه‌که معاینه گردد که حکیمان گفته‌اند:

به تندی سبُک دست بردن بـه تـیغ　　بـه دنـدان بَـرَد پشتِ دستِ دریـغ

شنیدم که سحرگاهی با تنی چند خاصّان به بالینِ قاضی فراز آمد. شمع را دید ایستاده و شاهد نشسته و مِی ریخته و قدح شکسته و قاضی در خوابِ مستی، بی‌خبر از مُلکِ هستی. به لطف اندک اندک بیدار کردش که خیز که آفتاب برآمد. قاضی دریافت که حال چیست، گفت: از کدام جانب برآمد؟ سلطان عجب داشت گفت از جانبِ مشرق چنان که معهودست. گفت: اَلْحَمْدُ لِلّٰه که درِ توبه هم‌چنان بازست به حکمِ این حـدیث: لاَ یُغْلَقُ عَلَیٰ اَلْعِبَادِ حَتّیٰ تَطْلُعَ اَلشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِها، أَسْتَغْفِرُکَ اَللّٰهُمَّ وَ أَتُوبُ إِلَیْکَ.

این دو چیزم بر گـناه انگـیختند　　بختِ نـافرجـام و عـقلِ نـاتمام
گـر گـرفتارم کـنی، مسـتوجبم　　ور بـبخشی عـفو بـهتر کـانتقام

پادشا وتی: لەم حاڵەدا کە ئاگاداری تاوانی خۆت بوویت سوودی نییە ﴿فَلَمْ يَكُ يَنْفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا﴾. (واتە: لە کاتی دوچاری سزا بوونیانا باوەڕکردنیان سوودی نە دانێ).

نەتوانی کەمەن بگریتە سەرکۆشك — چ سوودی هەیە تەوبەت لە دزی
باڵاکورت دەستی ناگاتە سەر لق — بە میوە بڵێ بەسیەتی بەرزی[1]

تۆ لە دوای ئەم ئیشە ناشیرینە کە دەرکەوت ڕێگەی ڕزگاریت بۆ پەیدا نابێ و سزا پێ سپێرراوان سزایان هاویشتە سەر. وتی: لە خزمەت پادشادا یەك وتەم ماوە، پادشا بیستی، وتی: چییە؟ وتی: (پارچە).

بەم بێ لوتفییە ئەیدەی بەسەرما — بە تەما مەبە ئەبم دەست بەردار
گەر لەم تاوانەیش ڕزگارم نەبێ — بە بەخشایشت هەرهەم هیوادار

پادشا وتی: ئەم وردییەت بێ وێنە بوو، وە ئەم نەستەقەت نایاب بوو، بەڵام ڕێکی عەقڵ نییە کە بە زانایی و زمانڕەوانی لە چنگی سزای من ڕزگاریت دەسکەوێ. کاری ڕێك لەوەدا ئەبینم کە لەسەر قەڵاوە سەرەوژێرت کەم تا کەسانی تر ئامۆژگاریت لێ وەرگرن و پێی وریابنەوە. وتی: ئەی خاوەندی جیهان! من پەروەردەی نیعمەتی ئەم خانەدانەم، وە ئەم تاوانە لە جیهانا وەنەبێ هەر من کردبێتم کەسێکی کە بخەرە خوارێ هەتا من وریا ببمەوە. پادشا پێکەنین گرتی وە بە چاوپۆشی لە تاوانەکەی بوورد، وە وتی: بە وانە کە بە سەختی بڕیاری کوشتنیان دابو:

هەموو هەڵگری عەیبی خۆتانن — بەس تانووت بدەن لە عەیبی کەسان

## چیرۆکی هۆنراوە (٢٠)

گەنجێکی پاکدەست پاکژ دەم و ڕوو — لەگەڵ جوانێکا سەودای عەشقی بوو
خوێندمەوە کەوا لە دەلیای ئەعزەم — کەوتنە گێژاوێ هەردوو دڵ بە غەم
مەلەوانێ هات کە دەستی بگرێ — تا ڕزگاری کا لە گێژاو نەمرێ

(١) نیوەی شیعری دوهەم ئەگەر بەم شێوەبێت لە فاسییەکەوە نزیکترە:
بەو بەرزە بڵێ: میوە نەدزێ! ـع.

مَلِک گفتا: توبه در این حالت که بر گناه و عقوبتِ خویش اطلاع یافتی سودی نکند؛ **فَلَمْ یَكُ یَنْفَعُهُمْ إِیْمَانُهُمْ لَمّا رَأَوْا بَأْسَنا.**

**چه سود از دزدی آن گه توبه کردن — که نتوانی کمند انداخت بر کاخ؟**
**بلند از میوه گو کوتاه کن دست — که کوته خود ندارد دست بر شاخ**

تو را با وجودِ چنین مُنکَری که ظاهر شد سبیلِ خلاص صورت نبندد. این بگفت و موکّلانِ عقوبت در وی آویختند. گفت: مرا در خدمتِ سلطان یکی سخن باقی است. مَلِک بشنید و گفت: آن چیست؟ گفت:

**به آستینِ ملالی که بر من افشانی**
**طمع مدار که از دامنت بدارم دست**
**اگر خلاص مُحال است از این گنه که مراست**
**بدان کرم که تو داری امیدواری هست**

مَلِک گفت: این لطیفه بدیع آوردی و این نکته غریب گفتی ولیکن مُحالِ عقل است و خلافِ نقل که تو را فضل و بلاغت امروز از چنگِ عقوبتِ من رهایی دهد. مصلحت آن می‌بینم که تو را از قلعه به زیر اندازم تا دیگران نصیحت پذیرند و عبرت گیرند. گفت: ای خداوندِ جهان، پرورده‌ی نعمتِ این خاندانم و این جُرم نه تنها من کرده‌ام در جهان؛ دیگری را بینداز تا من عبرت گیرم. مَلِک را خنده گرفت و به عفو از سرِ جُرمِ او برخاست و متعنّتان را که به کشتنِ او اشارت همی کردند گفت:

**هرکه حمّالِ عیبِ خویشتنید — طعنه بر عیبِ دیگران مزنید**

## حکایت [۲۰]

**جوانی پاک‌بازِ پاک‌رَو بود — که با پاکیزه‌رویی در گرَو بود**
**چنین خواندم که در دریای اعظم — به گردابی درافتادند با هم**
**چو ملاّح آمدش تا دست گیرد — مبادا کاندران حالت بمیرد**

لەو گـــــــێژاوەدا وا هــــاتە گـــوفتار
لە مـــن وازبـــێنـــە، ڕزگــارکە دڵدار

لەم گـــــــوفتارەدا شـــێوا جـــیهانی
ئەیانبیست بـە دەم دەرچـوونی گـیانی

ئــەیوت درۆیــە کـە پیاوی بـە هـۆش
عــەشق لە ســەختی بکــا فـەرامـۆش

یـــاران ئـــەیانکرد وا زیــــندەگـانی
پــرسە لێ کــەوتوو ئــەگــەر نــازانــی

ســـەعدی ئـــەزانــێ کــە عــەشقبازی
هــەروەکــوو بـەغداو زمـانی تـازی[1]

دڵارامت بــــــوو پـــێوە دڵ بـــەستە
ئـیتر لە عــالەم هــەموو چــاو بــەستە

بـــێنـــەوە ژیــان لەیــلاوو مــەجنوون
وتـاری عــەشقی نـامەم ئـەنووسن[2]

---

(١) تازی: عەرەبیی فەسیحە.
(٢) لە دەقەکەشدا هەروایە دیارە کێشەکەی لەنگە،ـع.

همی گفت از میانِ موج و تشویر  مرا بگذار و دستِ یارِ من گیر
در این گفتن جهان بر وی برآشفت  شنیدندش که جان می‌داد و می‌گفت
حدیثِ عشق ازان بَطّال منیوش  که در سختی کند یاری فراموش
چنین کردند یاران زندگانی  ز کارافتاده بشنو تا بدانی
که سعدی راه و رسمِ عشق‌بازی  چنان داند که در بغداد تازی
دلارامی که داری دل در او بند  دگر چشم از همه عالَم فروبند
اگر مجنونِ لیلی زنده گشتی  حدیثِ عشق از این دفتر نِبِشتی

بەندی شەشەم:

# لاوازی و پیری

## چیرۆك (١)

لەگەڵ دەستەیەك تێگەیشتووان لە مزگەوتی شامدا باسێکم ئەکرد، گەنجێ هات وتی: لەم ناوەدا کەسێ هەیە فارسی بزانێ منیان نیشاندا. پێم وت: خێرە؟ وتی: پیرێکی سەدو پەنجا ساڵە لە حاڵی گیاندانە بە زمانی فارسی شتێك ئەڵێ ئێمە لێی تێناگەین ئەگەر بە پیاوەتی ڕەنج بکێشی پاداشت هەیە، ڕەنگە وەسیەتێکی هەبێ، کاتێ گەیشتمە ژوورسەری ئەم بەیتەی ئەخوێندەوە: (پارچە).

وتم: بەرمە سەر چەند دەمێ ئارەزوو — دریغا کە گرتویە ڕێگەی نەفەس

لە خوانی هەمووڕەنگی ژین چەند دەمێ — دریغا کە خواردمانو وتیان بەس

مەبەستی ئەم وتارەم بە شامی یەکان وت، لێی سەرسام بوون لە درێژی تەمەنو داخ خواردنی بەو جۆرە بۆ ژیانی جیهان. وتم: چۆنی لەم حاڵەدا؟ وتی: [چی بلێم] (پارچە).

چ سەختی ئەگا بە گیانی کەسێ — لە دانەکانی دەر بێنی دانێ

لێوە بڕوانە لە سەعاتێکا — دەرچی لە لەشی شیرینی گیانێ

**باب ششم:**

## در ضعف و پیری

### حکایت [۱]

با طایفه‌ی دانشمندان در جامعِ دمشق بحثی همی کردم که جوانی درآمد و گفت: در این میان کسی هست که زبانِ پارسی بداند؟ غالب اشارت به من کردند. گفتمش: خیرست. گفت: پیری صد و پنجاه ساله در حالتِ نزع است و به زبانِ عجم چیزی همی گوید و مفهومِ ما نمی‌گردد. اگر به کَرَم رنجه شوی مزد یابی، باشد که وصیّتی همی کند. چون به بالینش فراز آمدم این می‌گفت:

**دمی چند گفتم برآرم به کام　　　دریغا که بگرفت راهِ نفس**

**دریغا که بر خوانِ اَلوانِ عمر　　　دَمی خورده بودیم، گفتند: بس**

معانیِ این سخن را به عربی با شامیان همی گفتم و تعجّب همی کردند از عمرِ دراز و تأسّف او هم‌چنان بر حیاتِ دنیا. گفتم: چگونه‌ای در این حالت؟ گفت: چه گویم؟

**ندیده‌ای که چه سختی همی رسد به کسی**

**که از دهانْش به در می‌کنند دندانی؟**

**قیاس کن که چه حالش بوَد در آن ساعت**

**که از وجودِ عزیزش به در رود جانی**

وتم: یادی مردن لە دڵ دەرکەو ڕێگە بە وەهم مەدە داگیرت بکا. فەیلەسووفانی یونان وتوویانە میزاجو تەبیعەت ئەگەرچی ڕاست بێ، پشت بەمانەوە بەستن شایان نییە، وە نەخۆشی هەرچەند گران بێت نیشانەی تەواو نییە لەسەر مردن. ئەگەر ئەفەرموویت پزیشکێکت بۆ بانگ بکەین چارت بکا. چاوی گێڕاو [پێکەنیو] وتی: (مەسنەوی).

دەست بەدەستا ئەدا پزیشکی چاك | دی کە پەرپووتەیاری کەوتوو لە خاك
گەورە بیری لە نەخشی هەیوانە | لە بناغە کە خانوو وێرانە
پیرەمێرد گیان ئەداتو ئەشناڵێ | پیرەژن سەندەلی لە لەش ئە مالێ
کاتێ تێکچوو بەرابەری لە مەزاج | چارە ناکا کەسێ دوعاوو عیلاج

## چیرۆك (٢)

ئەگێڕنەوە پیرێ گەنجێکی خواستبوو، ژووری بە گوڵ ڕازاندبووەوە، بە تەنیا لەگەڵیا دانیشتبوو، چاوو دڵی پێوە بەستبوو، شەوهای درێژ نە ئەنووست، قسەی نەستەقو خۆشی بۆ ئەکرد بەڵکە سڵی لێنەکاو قیزی لێنەیەتەوە لەگەڵیا ڕابوێرێ، لەوانە شەوێك پێیوت: بەختی بڵندت یارو چاوانی دەوڵەتت بێدار بوون کە کەوتیتە هاوڕێیەتیی پیرێکی پوختە پەروەری جیهاندیدەو، بە ئارام سەرماو گەرما کێشاوو چاكو خراپ تاقی کەرەوە کە مافی هاوڕێیەتی ئەزانێو مەرجی خۆشەویستی ئەهێنێتە جێ. دڵ نەرمو میهرەبان خۆش سروشتو شیرین زمان. (مەسنەوی):

هەتا ئەتوانم دڵت دێنمە دەست | ئازارم بدەی ناتکەم ئازوردە
گەر وەکوو توتی هەر شەکەر بخۆیت | بە گیانی شیرین ئەتکەم پەروەردە

دوچار نەبوویت بە دەست جوانێکی لە خۆ بایی، کەللەسەر تیژی، پێ سووك، کە هەردەمە هەوەسێ وەرگرێتو، هەرئانێ بڕیاری بڕیارێك لێبدا، وە هەر شەوێ لە جێگەیەك بکەوێت، وە هەر ڕۆژە یارێ بگرێت. (پارچە):

جەوانان هەرچەند ماه ڕوخسارن | بەڵام لەگەڵ کەس نییە وەفایان
بە تەما مەبە وەفای بولبولان | هەردەم بۆ گوڵێ ئەکەونە ئەلحان

بە پێچەوانەی پیران کە بە عەقڵو ئەدەب ژیان ئەبەنە سەر، نە وەك هەواخواهی نەزانیو جوانی. (تاك):

گفتم: تصوّرِ مرگ از خیال به در کن و وهم را بر طبیعت مستولی مگردان که فیلسوفانِ یونان گفته‌اند: مزاج ارچه مستقیم بوَد، اعتمادِ بقا را نشاید و مرض گرچه هایل، دلالتِ کلّی بر هلاک نکند؛ اگر فرمایی طبیبی را بخوانیم تا معالجت کند. دیده برکرد و بخندید و گفت:

دست بر هم زند طبیبِ ظریف — چون خرف بیند اوفتاده حریف
خواجه در بندِ نقشِ ایوان است — خانه از پایْ‌بست ویران است
پیرمردی ز نزع می‌نالید — پیرزن صندلش همی مالید
چون مخبّط شد اعتدالِ مزاج — نه عزیمت اثر کند نه علاج

## حکایت [۲]

پیری حکایت کند که دختری خواسته بودم و حجره به گُل آراسته و به خلوت با او نشسته و دیده و دل در او بسته، شب‌های دراز نخفتمی و بذله‌ها و لطیفه‌ها گفتمی، باشد که مؤانست پذیرد و وحشت نگیرد. از جمله شبی همی گفتم: بختِ بلندت یار بود و چشمِ دولتت بیدار که به صحبتِ پیری افتادی پخته، پرورده، جهان‌دیده، آرمیده، گرم و سرد چشیده، نیک و بد آزموده که حقوقِ صحبت بداند و شروطِ مودّت به‌جای آورد، مُشفق و مهربان و خوش‌طبع و شیرین‌زبان.

تا توانم دلت به دست آرم — ور بیازاریم، نیازارم
ور چو طوطی شکر بوَد خورشت — جانِ شیرین فدای پرورشت

نه گرفتار آمدی به دستِ جوانی مُعجَب، خیره‌رای، سر تیز، سبک‌پای، که هر دم هوسی پزد و هر لحظه رایی زند و هر شب جایی خسبد و هر روز یاری گیرد.

جوانان خرّمند و خوب رخسار — ولیکن در وفا با کس نپایند
وفاداری مدار از بلبلان چشم — که هر دم بر گُلی دیگر سرایند

خلافِ پیران که به عقل و ادب زندگانی کنند نه به مقتضای جهل و جوانی.

لە خـۆت چـاکـتر پـەیاکـە هـەڵبزانـە لەگەڵ وەك خۆت ئەکەی ون ئەو ژیانە

وتی: لەم شێوەیە هەرچەندێ وتم وامزانی دڵی هاتوەتە زنجیری منەوە، وە بـووە بـە نێچیرم. لەپڕ هەناسەیەکی ساردی لە دڵی پڕ دەردەوە هەڵکێشاو وتی: ئەوەندە وتار کە تۆ وتت لە تەرازووی عەقڵی مناگرانی ئەو یەك وتەیەی نییە، کاتێ بیستم لە لەلەی[1] خۆم کە ئەیووت: ژنی جوان تیرێ لە تەنیشتیابێ باشترە لە پیرێ.

لَمّا رَأَتْ بَيْنَ يَـدَيْ بَـعْلِها شَيْئاً كَأَرْخىٰ شَفَةِ الصّـائِمِ
تَـقُولُ هٰـذا مَـعَهُ مَـيِّتٌ وَ إِنَّـما الرُّقـىٰ لِـلنّا ئِـمِ

واتە:

ژن دی لەبـەر دەسـتی مێردی شـتێکـی شــۆڕتــر لە لچـی پـیاوی ڕۆژووەوان
ئــەڵێت پــێی ئــەمە لەلای مـردووە بۆ نـووستوو نـووشتە ئـەنووسن کـەسان

(چواری):

ژن لەگەڵ مێردی ئـێسك قـورس هـەڵسا لەو مــــاڵە ئــیتر قـــڕەو هـــەرایـــە
پـیرێ نـەتوانـێ لەجێی خـۆی هـەڵسێ بــــە عــــەسانەبی، بــافتی عــەسایە

بە کورتی ڕەنگی ڕێکەوتنی نەبوو، ڕووی کردە جیابوونەوە. کاتێ عیدەی بەسەرچوو مارەیان کرد لە جوانێکی تووڕەو ترش ڕوو، کەمدەستو بەدخوو. جەورو جەفای ئەدیو ڕەنجو سزای ئەکێشا. سوپاسی خوای بەجێئەهێنا کە سوپاس بۆ خوا لەو سزا بـەئێشـە ڕزگارم بوو، وە بەم خۆشییە پایەدارە گەیشتم! (تاك):

بە هەموو جەورو هەموو توند خـوویی نازت ئەکێشـم چـونکە شـیرین ڕووی

(پارچە):

ڕوومــەتی جـوانو هـەم کـراسـی جـوان سەندەڵو عوودو ڕەنگو ڕووی هەوەس
جــــوانــــییە بـۆ ژنــان ئـەمانە گشـتی مـەردییە جـوانـی پـیاوە، ئـیتر بـەس![2]

---

(١) لەلە: دایە، دایەن، کەسێکە کە تەرخان کرابێ بۆ ئامۆژگاری وئاگاداری کـردنی مـناڵ. لەلە: شوێنێکە کە لە دارێ یا شتێ دابڕابێ بە خاتر ئەوە مەبەستێ لە نێودایە لە بیر نەچێتەوە. «ك».
(٢) لە نووسخەیەکدا ئەم نیو بەیتە بە جۆرێکی تر نووسرابوو، لامان ڕەوا نـەبوو بـێ‌نووسین. «ع.م».

ز خود بهتری جوی و فرصت شمار          که با چون خودی گم کنی روزگار

گفت: چندان بر این نمط بگفتم که گمان بردم که دلش در قیدِ من آمد و صیدِ من شد. ناگه نفسی سرد از درونِ سینه‌ی پردرد برآورد و گفت: چندین سخن که بگفتی در ترازوی عقلِ من وزنِ آن یک سخن ندارد که وقتی شنیده‌ام از قابله‌ی خویش که گفت: زنِ جوان را اگر تیری در پهلو نشیند بِهْ که پیری.

لَمّا رَأَتْ بَیْنَ یَدَیْ بَعْلِها          شَیْئاً کَأَرْخیٰ شَفَةِ ٱلصّائِمِ
تَقُولُ هٰذا مَعَهُ مَیِّتٌ          وَ إِنَّما ٱلرُّقْیَةُ لِلنّائِمِ

***

زن کز برِ مرد بی‌رضا برخیزد          بس فتنه و جنگ ازان سرا برخیزد
پیری که ز جای خویش نتواند خاست          الاّ به عصا، کی‌اَش عصا برخیزد

فی الجمله امکانِ موافقت نبود به مفارقت انجامید. چون مدّتِ عِدّت برآمد، عقدِ نکاحش بستند با جوانی تند، ترش‌روی، تهی‌دست، بدخوی؛ جور و جفا می‌دید و رنج و عَنا می‌کشید و شکرِ نعمتِ حق هم‌چنان می‌گفت که اَلْحَمْدُ لِلّٰه که ازان عذابِ الیم برهیدم و بدین نعیمِ مقیم برسیدم.

با این همه جور و تندخویی          بارت بکشم که خوب‌رویی

***

(پارچە):

لەگـــەڵ تـــۆ ســـووتان لە نـاو ســزادا　　لەگەڵ یەکێ‌تر نـەك بـچمە بـەهەشت[١]

بـــۆنـــی پـیاز لەدەم جـوانـێ چـاترە　　نەك گوڵێ لە دەست ناشیرین‌و زوشت[٢]

## چیرۆك (٣)

میوانی پیریك بووم لە دیاربەکر کە ماڵێکی فراوانی هەبوو لەگەڵ کوڕێکی ڕەنگ‌و روو جوان. شەوێك باسی بۆ کردم کە لە ژیانما هەر ئەم کوڕەم هەیە، درەختێ وا لەم دۆڵە دایە زیارەتگایە، خەڵکی ئەچن بۆ زیارەتی. شەوهای درێژ لە بنی ئەو درەختەدا ناڵاندوومە تا خوا ئەم کوڕەی پێ‌بەخشیم. گوێم لێ‌بوو ئەم کوڕە بە ئەسپایی بە هاوڕێکانی وت: ئەگەر ئەو درەختەم بزانیایە کامەیە ئەچووم لەبنی‌دا ئەپاڕامەوە خوا باوکم بکوژێ! مامۆستا[٣] شادمانە کە کوڕی عاقڵە، کوڕیش تانووت لێ‌ئەدا کەوا باوکی پەرپووتە. (پارچە):

ســـاڵەهـا ئـەڕوا بـۆت ڕێ‌نـاکـەوێ　　گـۆڕی بـاوکی خـۆت بکـەی زیـارەت

تۆ بۆ باوکی خۆت چیت کردووە بە خێر　　تـا چـاو بـبڕیـتە خـێری کـوڕەکـەت

## چیرۆك (٤)

ڕۆژێ بـە سـەرکێشـیی جـوانـی خـێرا ڕۆیشتبووم، شـەو لە بـناری کـێوێکـا سـست مابوومەوە. پیرەمێردێکی لاواز لە دوای کاروانەوە ئەهات، وتی: بۆچی کەوتوویت، کەی ئێرە جێگەی نووستنە؟ وتم: چۆن بڕۆم قاچی ڕۆیشتنم نەماوە؟ وتی: ئەوەت نەبیستووە کە خاوەن دڵان وتوویانە ڕۆیشتن‌و دانیشتن چاترە لە ڕاکردن‌و سست بوون. (پارچە):

بە هەوایـی قـۆنـاغ پـەلەپەل مـەکـە　　پـەندم وەرگـرە تـوانـا فـێربـە وا

بە پەلە ئەڕوا دوو غار ئەسپی چـاك　　حوشتر بە هێواش شەوو ڕۆژ ئەڕوا

---

(١) بەخشیمە بە تۆ سەروی ڕە وانـم، سـەرومالّم
ئەم مەسرەف‌و بەخشینە بە سـەرفی سـەرو مـالّە
دیـــداری ئـەوین لازمـە بـۆ مـن کـە لەوێدا
یا مەرگە، وە یاخەنجەرە، یـا تـیری غـەزالّە،«ك».

(٢) زوشت: ناشیرین «ع.م».

(٣) لە فارسییەکەدا: خواجە: واتە: گەورە، نووسراوە،ع.

با تو مرا سوختن اندر عذاب  بِهْ که شدن با دگری در بهشت
بوی پیاز از دهنِ خوب‌روی  بِهْ به حقیقت که گُل از دستِ زشت

## حکایت [۳]

مهمانِ پیری بودم در دیارْ بَکْر که مالِ فراوان داشت و فرزندی خوب‌روی. شبی حکایت کرد که مرا در عمرِ خویش به جز این فرزند نبوده است. درختی در این وادی زیارتگاه است که مردمان به حاجت خواستن آن جا روند. شب‌های دراز در آن پای درخت به حق بنالیده‌ام تا مرا این فرزند بخشیده است. شنیدم که پسر با رفیقان آهسته همی گفت: چه بودی گر من آن درخت بدانستمی کجاست تا دعا کردمی و پدرم بمردی.

خواجه شادی کنان که پسرم عاقل است و پسر طعنه زنان که پدرم فرتوت.

سال‌ها بر تو بگذرد که گذار  نکنی سوی تربتِ پدرت
تو به‌جای پدر چه کردی خیر؟  تا همان چشم داری از پسرت

## حکایت [۴]

روزی به غرورِ جوانی سخت رانده بودم و شبانگه به پای گَریوه‌ای سست مانده. پیرمردی ضعیف از پسِ کاروان همی آمد و گفت: چه خُسبی که نه جای خفتن است؟ گفتم: چون رَوَم که نه پایِ رفتن است؟ گفت: این نشنیدی که صاحب‌دلان گفته‌اند: رفتن و نشستن بِهْ که دویدن و گسستن.

ای که مشتاقِ منزلی مشتاب  پندِ من کاربند و صبر آموز
اسبِ تازی دوتگ رَوَد به شتاب  و اشتر آهسته می‌رود شب و روز

## چیرۆك (٥)

نەوجوانێکی نازكو چوست دەم بەپێکەنین شیرین زمان لە ڕیزی ڕابردووانی ئێمەدا بوو کە هیچ جورە غەمێ نە ئەهاتە دڵیەوە، وە لێوی لە پێکەنین نە ئەکەوت ڕۆزگارێکی بەسەرا هات کە بەیەك گەیشتنمان ڕێك نەکەوت، دوای ئەوە دیم ژنی خواستبوو، وە منالی پەیدا کردبوو، ڕیشەی شادمانیی بڕاوەو، گوڵی ڕووی پەژموردە بووە، پرسیم چ حاڵێکە؟ وتی: تا منالانم پەیدا کرد ئیتر منالیم نەکرد.

ماذا الصِّبیٰ وَ الشَّیْبُ غَیَّرَ لِمَّتِی ... وَ کَفیٰ بِتَغْییرِ الزَّمانِ نَذِیراً

منالی چی، سپی کرد پیری وا سەر ... بەسە ترسێنەری گۆڕینی دەوران

لە منالی خۆت ببە دەس بەردار ... پیرە، یاریی خۆت بدە هەرزەکار

(مەسنەوی):

شادی جوان لە پیر تۆ مەکە داوا ... ئاو لە جۆگە ڕۆی ناگەڕێتە دوا

زەرعات کە گەیشت بە کاتی درەو ... سەوز نابێتەوە ئیتر سەر لەنەو

(پارچە):

کاتی جوانیم ئەوا لە دەس چوو ... ئاخو داخمە بۆ خۆمی دڵگیر

هێزی سەرپەنجەی شێریم لانەما ... ئێستا کە ڕازیم وەك یوز بە پەنیر

ڕەشی کردبوو پیرەژنێ مووی خۆی ... وتم: ئەی دایکە دێرینەکەی پیر

بە فێڵ وا مووی خۆت ڕەش کردەوانێ ... پشتی کۆم چلۆن ڕاست ئەکەی وەك تیر

## چیرۆك (٦)

کاتێ بە نەفامی جوانی شیڕاندم بەسەر دایکما. بە دڵێ خەمگینەوە لە گۆشەیەکا دانیشتو بە دەم گریانەوە ئەیوت: بۆچی وردی خۆتت لە یاد نەماوە وا ئێستا درشتی ئەکەی بە سەرما؟

چ خۆشی فەرموو پیرێ بە فەرزەن ... کە دی فیل ئەخاو بۆتە فیل تەن

گەر کاتی وردی ئەهاتە یادت ... کە منالێ بووی لە باوەشی من

ئیمرۆ نەت ئەکرد لەگەڵ من جەفا ... کە تۆ شێر پیاوی، ئەمن پیرەژن

## حکایت [۵]

جوانی چُست، لطیف، خندان، شیرین‌زبان در حلقه‌ی عشرتِ ما بود که در دلش از هیچ نوع غم نیامدی و لب از خنده فراهم. روزگاری برآمد که اتّفاقِ ملاقات نیفتاد، بعد ازان دیدمش زن خواسته و فرزندان خاسته و بیخِ نشاطش بریده و گُلِ هوس پژمریده. پرسیدمش چگونه‌ای و چه حالت است؟ گفت: تا کودکان بیاوردم دگر کودکی نکردم.

مَاذَا ٱلصِّبیٰ وَ ٱلشَّیْبُ غَیَّرَ لِـمَّتی　　　وَ کَفیٰ بِتَغْییرِ ٱلزَّمانِ نَذِیراً

***

چون پیر شدی ز کودکی دست بدار　　　بازیّ و ظرافت به جوانان بگذار

***

طربِ نوجوانان ز پیر مجوی　　　که دگر ناید آبِ رفته به جوی

زرع را چون رسید وقتِ درو　　　نخرامد چنان که سبزه‌ی نو

***

دورِ جوانی بشد از دستِ من　　　آه و دریغ آن زَمَنِ دلفروز!

قوّتِ سرپنجه‌ی شیری برفت　　　راضیم اکنون به پنیری چو یوز

پیرزنی مویْ سیه کرده بود　　　گفتمش ای مامکِ دیرینه روز

موی به تلبیس سیه کرده، گیر　　　راست نخواهد شدن این پشتِ کوز

## حکایت [۶]

وقتی به جهلِ جوانی بانگ بر مادر زدم، دل‌آزرده به کُنجی نشست و گریان همی گفت: مگر خُردی فراموش کردی که درشتی می‌کنی؟

چه خوش گفت زالی به فرزندِ خویش　　　چو دیدش پلنگ‌افگن و پیلتن

گر از عهدِ خُردیت یاد آمدی　　　که بی‌چاره بودی در آغوشِ من

نکردی در این روز بر من جفا　　　که تو شیرمردیّ و من پیرزن

## چیرۆك (٧)

دەوڵەمەندێکی چرووك[1] کوڕێکی نەخۆش بوو، خێر خواهان پێیان وت: مەسڵەحەت وایە بۆ ئەم کوڕە یا خەتمێکی قورئان یا قوربانی‌یەکی بۆ بکەیت. تۆزێ بیری کردەوە، وتی: خەتمی قورئان باشترە چونکە ڕان دوورە. خاوەن دڵێ بیستی وتی: خەتمەکەی بۆیە لا باشترە چونکە قورئان وا لەسەر زمان، بەڵام پارە وا لەناو گیان.

(مەسنەوی):

داخەکەم گەردەن بۆ تاعەت دانان لەگەڵیا بوایە ئەگەر پارەدان
بە دیناریێ وەك کەر لە قوڕ ئەمێنێ ئەلحەمدێ بڵێیت ئەو سەد ئەخوێنێ[2]

## چیرۆك (٨)

لە پیرەمێردێکیان پرسی: بۆچی ژن ناهێنی؟ وتی: بە پیرەژنانەوە ڕانەهاتووم. ویتان: جوانێ بێنە. وتی: جا ئەوانەیش کە جوانن لەگەڵ مناکە پیرم چۆن پێکەوە ئەلکێن؟

پیری حەفتا ساڵ جوان ئەکا بە یاد بە تەمای چاوە کوێری مادەرزاد
زۆرێ پێویستە خاتوون، نەوەك زەڕ لە دە مەن گوشتی دۆستترە گێزەر

## چیرۆکی هۆنراوە (٩)

بیستم لەم بەینە پیرێکی پەڕیوت خەیاڵی بەستە سەربەستنی جووت
کچێکی جوانڕووی هێنا گەوهەر ناو قوتووی گەوهەری کە ون بوو لە چاو
بەشێوەی بووکی ڕووی کردە پێویست بەڵام لەیەکەم گوژما عەسای نووست
کەمانی کێشا نەیدا لە نیشان سووژنی پۆلا ئەدووریێ کۆیان
کەوتە گلەیی لەگەڵ دۆستانی کە هەرچی ماڵم هەبوو فەوتانی

---

(١) چرووك: کەم دیتە، پەست، ڕژد، دغەل، قەڵب، چەپەڵ، قرچۆك، کەنەفت، پیسکە. «ك».

(٢) دل کە هێلانەی ڕژدی و ڕیا بێ کوڕنووشی خاڵی بە هیچێ نابێ
ئێمە کە بە دین، دونیا ئەسێنین جا با هەر شەوێ خەتمێ بخوێنین.ـ«ك».

## حکایت [۷]

توانگری بخیل را پسری رنجور بود. نیک‌خواهانش گفتند: مصلحت آن است که ختمِ قرآن کنی از بهرِ وی یا بذلِ قربان. لختی به اندیشه فرو رفت و گفت: مُصحفِ مهجور اولی‌ترست که گله‌ی دور. صاحب‌دلی بشنید و گفت: ختمش به علّتِ آن اختیار آمد که قرآن بر سرِ زبان است و زر در میانِ جان.

دریغا گردنِ طاعت نهادن    گرش همراه بودی دستِ دادن
به دیناری چو خر در گِل بمانند    وَر اَلْحَمدی بخواهی صد بخوانند

## حکایت [۸]

پیرمردی را گفتند: چرا زن نکنی؟ گفت: با پیرزنانم عیشی نباشد. گفتند: جوانی بخواه، چون مکنت داری. گفت: مرا که پیرم با پیرزنان الفت نیست پس او را که جوان باشد با من که پیرم چه دوستی صورت بندد؟

پِسرِ هَفْطاثَلَه جَوْنی می‌کند    عُشْغِ مُقْرِی وَ خَوْ بِنی چِشِ رَوْشْت
زور باید نه زر که بانو را    گَزَری دوست‌تر که ده من گوشت

## حکایت [۹]

شنیده‌ام که در این روزها کهن پیری
خیال بست به پیرانه‌سر که گیرد جفت
بخواست دخترکی خوب‌روی، گوهر نام
چو دُرج گوهرش از چشمِ هم‌گنان بنهفت
چنان که رسمِ عروسی بوَد، تماشا بود
ولی به حمله‌ی اوّل عصای شیخ بخفت
کمان کشید و نزد بر هدف که نتوان دوخت
مگر به سوزنِ فولاد، جامه‌ی هنگفت
به دوستان گله آغاز کرد و حجّت ساخت
که خان و مانِ من، این شوخ‌دیده پاک برُفت

ژنو مێرد شەڕیان هەڵساو هاتەدی    لای قازیو پۆلیس، جا وتی سەعدی
ژن بێ تاوانە بەسیبێ تەشەر    دەستت ئەلەرزێ ناسمی گەوهەر

میان شوهر و زن جنگ و فتنه خاست، چنان
که سر به شحنه و قاضی کشید و سعدی گفت:
پس از خلافت و شنعت، گناهِ دختر نیست
تو را که دست بلرزد، گهر چه دانی سُفت؟

## بەندی حەوتەم:

# کەڵك و سوودی پەروەردەکردن

### چیرۆك (١)

یەکێ لە وەزیران کوڕێکی کەم فامی هەبوو، ناردیە لای زانیارێك کە ئەو کوڕە پەروەردەکا بەڵکو عاقڵ ببێت. ڕۆژەها پەروەردەی کردو خەریکی بوو، سوودی نەبەخشی. ناردیەوە بۆ باوکی کەوا عاقڵ نابێت و خۆمی شێت کردا! (پارچە):

| | |
|---|---|
| ئەسڵ، جەوهەرێ کە خۆی شایانە | پەروەردە لەوا چاك ئەکا ئەسەر |
| زاخاو ناتوانێ پاکی کاتەوە | ئاسنێ کە خۆی پیس بێ و بەد گەوهەر |
| سەگ لە حەوت دەلیا ئەگەر بشۆری | زۆرتر پیس ئەبێ کاتێ ئەبێ تەڕ |
| گەر کەری عیسا بچێتە مەککە | هاتەوە هێشتا هەر کەرەو هەر کەر! |

### چیرۆك (٢)

دانایەك پەندی کوڕەکانی دائەدا کە ئەی گیانی باوك هونەر فێربن چونکە دەوڵەت و موڵکی جیهان شایانی پشت پێبەستن نین، وە زیوو زەڕیش جێی مەترسین یا دز بەجارێ ئەیانبا، یا خاوەنی جیاجیا ئەیان خۆن. بەڵام هونەر چاوگەیەکی هەمیشە ئاوەو دەوڵەتێکی پایەدارە. ئەگەر هونەروەر نەکەوێتە دەوڵەتەوە باکی نییە چونکە هونەر خۆی دەوڵەتە بچێتە هەر شوێنێ قەدری ئەبینن و لەلای سەرەوە دای ئەنێن. بەڵام بێهونەر پاروویەك [کۆ] ئەکاو[تەوە] مەینەتێکی دێتە ڕێ. (تاك):

باب هفتم:

# در تأثیر تربیت

## حکایت [۱]

یکی را از وزرا پسری کودن بود؛ پیش یکی از دانشمندان فرستاد که مر این را تربیت می‌کن مگر عاقل شود. روزگاری تعلیم کردش و مؤثر نبود. پیش پدرش کس فرستاد که این عاقل نمی‌شود و مرا دیوانه کرد.

چون بود اصل گوهری قابل — تربیت را در او اثر باشد
هیچ صیقل نکو نداند کرد — آهنی را که بدگهر باشد
سگ به دریای هفت‌گانه بشوی — که چو تر شد پلیدتر باشد
خرِ عیسی گرش به مکّه برند — چون بیاید هنوز خر باشد

## حکایت [۲]

حکیمی پسران را پند همی‌داد که جانانِ پدر هنر آموزید که مُلک و دولتِ دنیا اعتماد را نشاید سیم و زر در سفر به محلِّ خطر است یا دزد به یک بار ببرد یا خواجه به تفاریق بخورد. امّا هنر چشمه‌ی زاینده است و دولتِ پاینده و اگر هنرمند از دولت بیفتد غم نباشد که هنر در نفسِ خود دولت است؛ هرجا که رود قدر بیند و بر صدر نشیند و بی‌هنر لقمه چیند و سختی بیند.

دوای قەدر حوکم لە شان دیتگران | بە ناز فێربوونو زۆری مەردمان

(پارچە)

کاتێ کەوتە شام فیتنەو بەڵایەك | هەرکەسێ بۆ خۆی خزایە لایەك
بچووكزادەکان کە بوویان هونەر | لای پادشا بوونە وەزیرو یاوەر
کوڕە وەزیران کە بێهونەر بوون | لە گەدایی دا مانەوەو کەر بوون[١]

## چیرۆك (٣)

یەکێ لە زانا بەرزەکان پادشازادەیەکی فێری زانیاری ئەکردو بێپەروا لێی ئەداو بێئەندازە لێی تووڕە ئەبوو. جارێکیان کوڕە لەبەر بێتاوانی شکاتی بردە بەر باوکی، کراسی لەسەر لەشی بریندازی لادا باوکی دڵی هاتەوەیەك مامۆستای بانگ کرد پێیوت: کوڕانی ئەهالی ئەوەندەی کوڕەکەی من ئازار نادەیت. هۆی ئەمە چییە؟ وتی: هۆی ئەوەیە لە وتارو ورد بوونەوەو گفتوگۆو جووڵانەوەی پەسەند بۆ هەموو کەس بە گشتی پێویستە، وە بۆ پادشایان بە تایبەتی، لەبەر ئەوەی هەرچی بەسەر دەستو زمانیانا بێت وا بەسەردەمی هەموو خەڵکەوە، وتاریو کرداری هیتر ئەوەندە گرنگ نییە. (پارچە):

ئەگەر سەد عەیبی بێ دەروێشی کەم دەس | لە هاوڕێی سەد یەکی نازانێ پێی کەس
وەگەر یەك کردەوەی شا ناپەسەند بوو | لە ئیقلیمێ بە ئیقلیمێ ئەگا زوو

کەوابوو پێویستە بۆ مامۆستای شازادان لە تەهزیبوو ڕێکخستنی ئەخلاقو ڕەوشتی گەورەزادەکانان «أَنْبَتَ اللّٰهُ نَبَاتاً حَسَناً» کۆششێکی زیاتر بکەن لەوەی دەربارەی منداڵانی عەوامو گشتی ئەیکەن. (پارچە):

کەسێ بە وردی فێر نەبێ ئەدەب | لە گەورەییدا نابینێ ڕزگار
داری تەڕ چۆنت ئەوێ پێچی دە | وشك بێئاگر ڕاست نابێ لە کار

---

(١) ئەم تاكو پارچەیە لە نووسخەیەکا هەیە:

میراتی باوکت ئەوێ فێربە عیلم | بە ڕۆژێ ماڵی باوکت خەرج ئەکەیت
بێباکە خاوەن کەماڵ نەبێ ماڵ | سەیری نەیشبێ لەلا سوورو زەرد
پیاوێ کە نەبێ کراس لای هەموان | چاترە نەوەك کراسی بێمەرد

سخت است پس از جاه، تحکّم بردن    خوکرده به ناز، جورِ مردم بردن

***

وقتی افتاد فتنه‌ای در شام    هرکس از گوشه‌ای فرا رفتند

روستازادگانِ دانشمند    به وزیریِّ پادشاه رفتند

پسرانِ وزیرِ ناقص عقل    به گدایی به روستا رفتند

## حکایت [۳]

یکی از فضلا تعلیمِ ملک زاده‌ای همی کرد و ضربِ بی‌محابا زدی و زجرِ بی‌قیاس کردی. باری، پسر از بی‌طاقتی شکایت پیشِ پدر برد و جامه از تنِ دردمند برداشت. پدر را دل به‌هم برآمد؛ استاد را بخواند و گفت: پسرانِ آحادِ رعیت را چندین جفا و توبیخ را روا نمی‌داری که فرزندِ مرا؛ سبب چیست؟

گفت: سبب آن که سخنِ اندیشیده باید گفتن و حرکتِ پسندیده کردن همه‌ی خلق را عَلَی الْعُموم و پادشاهان را عَلَی الْخُصوص، به موجب آن که بر دست و زبانِ ایشان هرچه رفته شود، هرآینه به افواه بگویند و قول و فعلِ عوام النّاس را چندان اعتباری نباشد.

اگر صد ناپسند آید ز درویش    رفیقانش یکی از صد ندانند

و گر یک بذله گوید پادشاهی    از اقلیمی به اقلیمی رسانند

پس واجب آمد معلّمِ پادشاه‌زاده را در تهذیبِ اخلاقِ خداوند زادگان، اَنْبَتَهُمُ اللّهُ نَبَاتاً حَسَناً اجتهاد ازان بیش کردن که در حقِ عوام.

هرکه در خُردیش ادب نکنند    در بزرگی فلاح از او برخاست

چوبِ تر را چنان که خواهی پیچ    نشود خشک جز به آتش راست

منالێ کە دی جەوری مامۆستا ئیتر نابینێ جەوری ڕۆژگار[١]

پادشا جوانی ڕاوێژی مەلاو دارشتنی وەڵامی لاڕێك هات، خەڵاتو بەخشایشی دایە و پایەی فەرمانی بەرز کردەوە.

## چیرۆك (٤)

مامۆستای کتێبێکم[٢] لە وڵاتی ڕۆژئاوادیت ترش ڕوو، وتار تاڵ بوو، مەردوم ئازارو بەدخوو بوو، بۆگەنی سروشتی پارێز لێ نەکراو، کە ڕابواردنی موسڵمانان بە چاو پێ کەوتنی بەرباد بوو، وە قورئان خوێندنی دڵی خەڵکی ڕەش ئەکردەوە، کۆمەڵی کوڕانو کچانی پاکژو[٣] عازەب[٤] بە دەس جەفایەوە گرفتار بوون، نە توانای پێکەنینو نە یارای وتارو نە گۆنای زیوینیان تاوی زللەی هەبوو، تاوێ لە یەکێکی ئەداو جارێك قاچی یەکێکی ئەکردە فەلاقە. ڕاستی وتە بیستم کە گوشەیەکی خەیانەتی نەفسی دیاری دا بۆیان، لێیانداو دەریان کرد. لە پاشانا دانشگاکەیان دا بە پیاوێکی کار دروستی خواپەرستی بێئازاری پیاوچاکی دانشمەند کە بەبێ پێویست نەئەهاتە وتار، وە هۆی ئازاری کەسی بە زمانا نە ئەهات. مناڵان سامی مامۆستای پێشوویان لە دڵ دەرچوو، مامۆستای دووەمیان بە ڕەوشتی فریشتەیی‌وە چاو پێ کەوت. یەکەیەکە بوون بەدێو پاڵیان دا بە حیلمو خووی ئەوەوە، زانیاری‌یان لە بیر چووەوە. زۆرکاتیان بە یاری ئەبردە سەر، لەوحو تەختەی نوسینیان لەسەریەکا ئەشکاند. (تاك):

مامۆستاو فێرکەر کە نەیبێ ئازار ئاگر بەرئەدەن مناڵ لە بازار

---

(١) لە هەندێ نووسخەدا نوسراوە:

انَّ الْغُصُونَ اذا قَوَّمْتَها اِعْتَدَلَتْ وَلَيْسَ يَنْفَعُكَ التَّقْوِيمُ بِالْخَشَبِ

تووڵە ڕاستکەوە ڕاست ئەبێتەوە . تەختە بێسوودە لە ڕاست کردنا

(٢) لە فارسییەکەدا نووسراوە: کُتّابی، کتّاب. واتە: مەکتەب، فێرگە، ـع.

(٣) پاگژ: پاك، خاوێن. پاگژترین: خاوێنترین.

(٤) عازەب، یا عازەو: کوڕو کچی لە خەم ڕەخسێو، لاوی تازە باڵغ بوو، کوڕو کچی بێ ژنو مێرد.

مَلِک را حسنِ تدبیرِ فقیه و تقریرِ جوابِ او موافق آمد، خلعت و نعمت بخشید و پایه و منصب بلند گردانید.

## حکایت [۴]

معلّمِ کُتّابی را دیدم در دیارِ مغرب ترش‌روی، تلخ‌گفتار، بدخوی، مردم‌آزار، گداطبع، ناپرهیزگار که عیشِ مسلمانان به دیدنِ او تبه گشتی و خواندنِ قرآنش دلِ مردم سیه کردی. جمعی پسرانِ پاکیزه و دخترانِ دوشیزه به دستِ جفای او گرفتار، نه زهره‌ی خنده و نه یارای گفتار؛ گه عارضِ سیمینِ یکی را تپانچه زدی و گه ساقِ بلورینِ دیگری را شکنجه کردی. القصّه شنیدم که طرفی از خباثتِ نفسِ وی معلوم کردند، بزدند و براندند. پس آنگه مکتبِ وی به مُصلحی دادند، پارسایی سلیم، نیک‌مرد، حلیم که سخن جز به حکمِ ضرورت نگفتی و موجبِ آزارِ کس بر زبانش نرفتی. کودکان را هیبتِ استادِ نخستین از سر به در رفت و معلّمِ دومین را اخلاقِ مَلَکی دیدند و یک یک دیو شدند؛ به اعتماد حلمِ او عِلم فراموش کردند؛ هم‌چنین اغلبِ اوقات به بازیچه فراهم نشستندی و لوح درست ناکرده در سرِ هم شکستندی.

استادِ معلّم چو بود بی‌آزار　　　خرسک بازند کودک در بازار

لە پاش دوو حەفتە بەو مزگەوتەدا تێپەڕیم، مامۆستای پێشووم دی دڵخۆشی یان دابووەو هێنابوویانەوە جێی خۆی، ڕەنجامو (لاحول ولا)م کرد کە بۆچی جارێکی تر شەیتانیان کردەوە بە مامۆستای فریشتان. پیرەمێردێکی قسەخۆشی جیهاندیدە گوێی لێبوو پێکەنی و وتی: (مەسنەوی).

شایەك کوڕی نارد بۆ قوتابخانە لەوحێ زیوینی لە باوەش دانا

بەزەڕ لێی نووسی چاتر بێ لەلات لە ڕەحمی باوك جەوری مامۆستات

## چیرۆك (٥)

جارێك [منداڵی] خواپەرستێك[1]، نیعمەتێکی بێپایانی بە میرات بۆ مایەوە لە مامەکەیەوە، دەستی کرد بە داوێن پیسی و بێدینی، ڕژاندنی ماڵەکەی کرد بە خوو. بە کورتی هیچ گوناهێکی ناشیرین نەما نەیکا، وە هیچ لەوانەی سەرخۆشی بدا نەما نەیخواتەوە. جارێك بە ئامۆژگاری پێم وت: مایەی ئاو ڕەوانی یە و هۆی ئاش گەڕانی یە. خەرجی زۆر بۆ کەسێ دەس ئەداکە دەرامەدێکی دیاری هەبێ. (پارچە):

بێدەرامەد بە هێمنی بە لە خەرج مەلەوانان ئەڵێن بە گۆرانی

کە نەبارێ لە کێوان باران دەجلە وشکە بە ساڵێ نازانی!؟

عەقڵ و ئەدەب بگرە بەر، لە یاری وگەمە وازبێنە، کەسامان بڕایەوە سەختی ئەکێشیت و پەشیمان ئەبیتەوە. کوڕە لە خۆشیی نای و خواردنەوە ئەم وتەیەی منی نەهێنایە گوێی خۆی، وە خراپەی لێگرت. وتی: ڕەحەتی ئێستا بە تەشویش و ناڕەحەتی دوا ڕۆژ لێڵ کردن لەگەڵ بیری عاقڵانا ناگونجێ. (مەسنەوی):

خاوەن ئامانجان خاوەن چاکبەختی بۆ سەختی بگرن لە ترسی سەختی؟

بڕۆ شادی کە ئەی یاری دڵشاد ئیمڕۆ بۆ سبەی غەم مەکە بە یاد

چۆن ئەبێ بۆ من کە لە بەرزی مرووەتا دانیشتووم و پەیمانی نەوجەوانیم بەستبوو، و ناوی سەخاو بەخشایشی من کەوتووەتە ناو دەمی گشتەوە. (مەسنەوی):

ناوی کە دەرکرد بە سەخاو کەرەم نابێ مۆر بدا لە کیسەی درەم

کەسێ بە چاکی کە ناوی دەرچوو ناتوانێ داخا دەرگانە لە ڕوو

---

(١) لە فارسییەکەدا: پارسازادەای،ـع.

بعد از دو هفته در آن مسجد گذر کردم و معلّمِ اوّلین را دیدم که دل‌خوش کرده بودند و به مَقامِ خویش آورده. انصاف برنجیدم و و لا حَولَ گفتم که دگر باره ابلیس را معلّمِ ملایکه چرا کردند! پیرمردی ظریفِ جهان‌دیده بشنید و بخندید و گفت:

پادشاهی پسر به مکتب داد | لوحِ سیمینش بر کنار نهاد
بر سرِ لوحِ او نِبِشته به زر: | جورِ اُستاد بِهْ ز مهرِ پدر

## حکایت [۵]

پارسازاده‌ای را نعمتِ بی‌کران از تَرِکَه‌ی عَمّان به دست افتاد. فسق و فجور آغاز کرد و مبذّری پیشه گرفت. فی الجمله، نماند از سایرِ معاصی مُنکَری که نکرد و مُسکری که نخورد. باری، به نصیحتش گفتم: ای فرزند، دخل آبِ روان است و خرج آسیاءِ گردان یعنی خرجِ فراوان کردن مسلّم کسی راست که دخلِ معیّن دارد.

چو دخلت نیست خرج آهسته‌تر کن | که می‌گویند ملاّحان سرودی
اگر باران به کوهستان نبارد | به سالی دجله گردد خشک رودی

عقل و ادب پیش گیر و لَهو لَعِب بگذار که چون نعمت سپری شود سختی بری و پشیمانی خوری. پسر از لذّتِ نای و نوش، این سخن در گوش نیاورد و بر قولِ من اعتراض کرد و گفت: راحتِ عاجل به تشویشِ محنتِ آجل منغّص کردن خلافِ رأیِ خردمندان است.

خداوندانِ کام و نیک‌بختی | چرا سختی خورند از بیمِ سختی؟
برو شادی کن، ای یارِ دل‌افروز | غمِ فردا نشاید خوردن امروز

فَکیفَ مرا که در صدرِ مروّت نشسته‌ام و عقدِ فتوّت بسته و ذکرِ اِنعام در افواهِ عوام افتاده.

هرکه عَلَم شد به سَخَا و کرم | بند نشاید که نهد بر دِرَم
نامِ نکویی چو برون شد به کوی | در نتوانی که ببندی به روی

سەیرم کرد ئامۆژگاریی من وەرناگرێت‌و دەمی گەرمی من لە ئاسنی ساردی ئەو کارناکات. وازم لە ئامۆژگاریی هێناو ڕووم لە هاوڕێیەتیی وەرگێڕا وە بە وتاری دانشمەندان کارم کرد کە فەرموویانە (بَلِّغْ مَا عَلَيْك فَإِنْ لَمْ يَقْبَلُوا ماعَلَيْك). (یانی: ئەوەی لەسەرتە بێگەیێنە، ئەگەر لێی وەرنەگرتی هیچت لەسەر نییە). (پارچە):

تۆ بڵێ با بزانی لێت نابیسن — چی ئەزانی لە هەر نەسیحەت‌و پەند

بێ‌هونەر زۆری ناوێ ئەیبینی — بە دوو پێوە کە کەوتە کۆت‌و بەند

دەست بە دەستا ئەداو ئەڵێ داخم — بۆچی نەم‌بیست وتاری دانشمەند

هەتا لەپاشان ئەوەی بە خەیاڵما هاتبوو لە نەگبەتیی حاڵی بەو شێوە دیتم کە پارچە پارچەی بەسەر یەکا ئەدروو، پاروو پارووی کۆ ئەکردەوە، لە لاوازی حاڵی دڵم هاتەیەك. وە بە مروەتیشم نەزانی لە حاڵێکی وەهادا ڕێشی دەروێش بە تانووت بکولێنمەوەو خوێی پێوەکەم. لەبەر خۆمەوە وتم: (مەسنەوی):

هاوڕێی سپڵە پیاو لە جۆشی مەستی — بیر ناکاتەوە لە تەنگ دەستی

درەختێ بەهار خۆی سەوز ئەبینێ — بێ‌گومان زستان بێ‌بەرگ ئەمێنێ

## چیرۆك (٦)

یەکێ لە پادشایان کوڕێکی دایە دەست ئەدیبێ، پێی‌وت: وای پەروەردە بکا وەکوو یەکێ لە مناڵەکانی خۆی. مامۆستا [وتی: فەرمانبەردارم و چەن] ساڵێ کۆششی لەگەڵا کرد بە هیچ نەگەیشت. وە کوڕەکانی ئەدیبەکە خۆی لە فەزڵ‌و بەلاغەت‌و زمان ڕەوانی‌یا گەیشتنە ئەوپەڕی. پادشا دانشمەندەکەی گرت‌و سەرزەنشتی کرد کە پەیمانت نارێك بوو، و بەجێت‌نەهێنا. وتی: ئەی پادشای ڕووی زەمین شارراوە نەبێ کە پەروەردە کردنی هەموان یەکسان بوو، بەڵام سروشتی‌یان جیاجیا. (پارچە):

زیوو زەڕ هەردوو لەبەرد دێنە دەر — لە هەر بەردێکا نییە زیوو زەڕ

گەلاوێژ بۆ گشت نووری یەکسانە — لایەك چەرم ئەکا، لایەك هەمانە[1]

---

(١) لە هەندی نووسخەدا نووسراوە: لە هەندێ شوێن کە ئەستێرەی سوهەیل (گەلاوێژ) هەڵدێت. پێست دەباغی دەکەن وەکوو لە (تایف). وە لە هەندێ نووسخەدا نووسراوە: دەردی ماڵات ئەبێ سەری ئەبڕن، لە پێستەکەی هەمانە دروست ئەکەن.

دیدم که نصیحت نمی‌پذیرد و دَمِ گرم من در آهنِ سردِ وی اثر نمی‌کند، ترکِ مناصحت کردم و روی از مصاحبت بگردانیدم و قولِ حکما را کار بستم که گفته‌اند: **بَلِّغْ ما عَلَيْكَ فَإِنْ لَمْ يَقْبَلُوا ما عَلَيْكَ.**

گرچه دانی که نشنوند، بگوی　　　هرچه دانی ز نیک‌خواهی و پند
زود باشد که خیره‌سر بینی　　　به دو پای اوفتاده اندر بند
دست بر دست می‌زند که دریغ!　　　نشنیدم حدیثِ دانشمند

تا پس از مدّتی آن‌چه اندیشه‌ی من بود از نکبتِ حالش، به صورت دیدم که پاره پاره به‌هم می‌دوخت و لقمه لقمه می‌اندوخت. دلم از ضعفِ حالش به‌هم برآمد و مروّت ندیدم در چنان حالی ریشِ درونش را به ملامت خراشیدن و نمک پاشیدن، پس با دلِ خود گفتم:

حریفِ سفله در پایانِ مستی　　　نیندیشد ز روزِ تنگ‌دستی
درخت اندر بهاران بر فشاند　　　زمستان، لاجرم، بی‌برگ ماند

## حکایت [۶]

پادشاهی پسر را به ادیبی داد و گفت: این فرزندِ تو است، تربیتش هم‌چنان کن که یکی از فرزندانِ خویش. گفت: فرمان بُردارم. سالی چند بر او سعی کرد و به جایی نرسید و پسرانِ ادیب در فضل و بلاغت منتهی شدند. مَلِک دانشمند را مؤاخذت کرد و معاتبت فرمود که وعده خلاف کردی و وفا به‌جای نیاوردی. گفت: بر رأیِ خداوندِ روی زمین پوشیده نماند که تربیت یکسان است ولیکن طبایع مختلف.

گرچه سیم و زر ز سنگ آید همی　　　در همه سنگی نباشد زرّ و سیم
بر همه عالَم همی تابد سهیل　　　جایی انبان می‌کند جایی ادیم

## چیرۆك (٧)

لە یەکێك لە پیرانی تەریقەتم بیست بە موریدێکی ئەوت: ئەوەندەی دڵی ئادەمیزاد پەیوەندی بە ڕزق و مووچەوە هەیە، ئەوەندە بە مووچە[1] دەرەوە ببوایە، پایەی لە پایەی فریشتە تێپەڕ ئەبوو.

فەرامۆشی نەکردی زاتی ئیزەد | لە کاتێ نوتفە بوویت پەنهان و مەدهۆش
کە گیان و عەقڵ و هەست و تەبعی دایتێ | جەماڵ و بیر و واتە و هەستی و هۆش
دە ئەنگوستی لەسەردوو دەست ڕوانی | کە جوانیی دا بە دوو قۆڵ و بە دوو دۆش
دە بێ هیممەت ئەمێستا وا ئەزانی | لە ڕزق و مووچەدا ئەتکا فەرامۆش

## چیرۆك (٨)

عارەبێکی دەشتەکیم دی بە کوڕی خۆی ئەوت: (یابُنَیَّ اِنَّك مَسْؤُلٌ یَوْمَ القیامَةِ فِیما اکْتَسَبْتَ، ولا یُقالُ لِمَنْ انْتَسَبْتَ؟). واتە: ئەی کوڕی خۆم تۆ لە ڕۆژی قیامەتاپرسیاری ئەوەت لێ ئەکەن کە چیت کردووەو، ئەوەت لێ ناپرسن خوت دایە پاڵ کێ و کوڕی کێی؟. (پارچە):

کراسی کەعبە کە ماچی ئەکەن | لە ئاوریشمی وەرنەگرتە ناو
لەگەڵ عەزیزێ چەند ڕۆژێ دانیشت | ئەویش وەکوو ئەو گەورە بوو تەواو

## چیرۆك (٩)

لە نامەکانی پزیشکانا وتراوە کە لەدایك بوونی دووپشك وەك گیان لەبەرانیتر نییە، بەڵکو ناوسکی دایکان ئەخۆن و سکی هەڵئەدرن و ڕێگەی دەرەوە ئەگرنە بەر، وە ئەو پێستانە لە کونی دووپشکا ئەبینرێت هی ئەوەن. جارێك ئەم وتە وردەم لای گەورەیەك ئەگێڕایەوە، فەرمووی بە ڕاستی دڵی من بۆ ئەم وتەیە شایەتی ئەدات، وە ئەگەر وانەبێ نابێ. ئەمانە لە سەردەمی وردی‌یا لەگەڵ باوك و دایکیانا وابوون، بۆیە لە گەورەیی‌دا خۆشەویست و ماقووڵن! (پارچە):

---

(١) مووچە: جیرە، بەرات، کرێ، پشك و بار. مووچە: زەوینی خاوەن‌دار، زەوییەکە کرداری لێ برابێتەوە.

## حکایت [۷]

یکی را شنیدم از پیرانِ مربّی که مریدی را همی گفت: چندان که تعلّقِ خاطرِ آدمی‌زادست به روزی اگر به روزی‌دِه بودی به مقام از ملایکه درگذشتی.

فراموشت نکرد ایزد در آن حال — که بودی نطفه‌ی مدفونِ مدهوش
روانت داد و عقل و طبع و ادراک — جمال و نطق و رای و فکرت و هوش
ده انگشتت مرتّب کرد بر کف — دو بازویت مرکّب ساخت بر دوش
کنون پنداری، ای ناچیز همّت، — که خواهد کردنت روزی فراموش

## حکایت [۸]

اعرابیی را دیدم که پسر را همی گفت: **يا بُنَيَّ إِنَّكَ مَسْؤُولٌ يَوْمَ ٱلْقِيامَةِ مَاذَا اكْتَسَبْتَ وَ لاٰ يُقالُ بِمَنِ ٱنْتَسَبْتَ**، یعنی تو را خواهند پرسیدن که هنرت چیست، نگویند که پدرت کیست.

جامه‌ی کعبه را که می‌بوسند — او نه از کرمِ پیله نامی شد
با عزیزی نشست روزی چند — لاجرم هم‌چو او گرامی شد

## حکایت [۹]

در تصانیف حکما آورده‌اند که کژدم را ولادت معهود نیست چنان که دیگر حیوانات، بل احشای مادر را بخورند پس شکمش را بدرند و راه صحرا گیرند و آن پوست‌ها که در خانه‌ی کژدم بینند اثرِ آن است. باری این نکته پیشِ بزرگی همی گفتم. گفت: دلِ من بر صدقِ این سخن گواهی می‌دهد و جز چنین نتواند بودن، در حالتِ خُردی با مادر و پدر چنین معاملت کرده‌اند لاجَرَم در بزرگی چنین مُقلبند و محبوب!

باوکێ کوڕی خۆی ئامۆژگاری کرد وتی: جەوانمەرد لێم وەرگرە پەند
کەسێ کە نەیبێ بۆ کەسی وەفا ڕووی دۆستی نابێ‌و نابێ دانشمەند

(وینە): بە دووپشکیان وت: بۆچی بە زستان دەرناکەویت؟ وتی: بە هاوین چ حورمەتێکم هەیە تا بە زستان بێمە دەرەوە!.

## چیرۆك (١٠)

ژنی دەروێشێ سکی‌پڕ بوو، وە کاتێ تەواو بوو دەروێش لە هەموو تەمەنیا منالی نەبووبوو، وتی: ئەگەر خوای گەورە کوڕێکم پێ‌ببخەشێ جگە لەم خەرقەیە لەبەرمایە هەرچی ترم هەیە ئەیکەم بە بەخشش بۆ دەروێشان. وارێکەوت کوڕی بوو وەکوو بڕیاری دابوو خوانی بۆ دەروێشان دانا. لە دوای چەند ساڵێ لە سەفەری شام گەرامەوە، بە گەڕەکی ئەو دۆستەدا گەڕام، ئەحواڵیم پرسی، ویتان: وا لە زیندانی شاردا. وتم: لە بەرچی؟ ویتان: کوڕەکەی شەرابی خواردووەتەوە، قیڕەی کردووەو خوێنی یەکێکی ڕشتوەو ڕای‌کردووە بە هۆی ئەوەوە زنجیر لە ملی‌و کۆت لە پێی‌دایە. وتم: ئەم بەڵایە ئەویە کەلە خوای داوا کرد. (پارچە):

ژنانی بەردار ئەی مەردی هۆشیار کاتی منال بوون ئەگەر ببینێ مار
بەلای عەقڵەوە چاترە لەوەی کوڕێکی ببێ خوارو ناهەموار

## چیرۆك (١١)

منال بووم لە گەورەیەك بلووغم پرسی، وتی: لە کتێبا سێ نیشانەی نووسراوە: یەکەم پازدە ساڵی، دووەم شەیتانی بوون، سێ‌هەم مووی بەر. بەڵام لە ڕاستی‌یا یەك نیشانەی هەیەو بەس، ئەوەی کە ڕەزای خوای گەورەو بەرزو بڵندی لا زیاتر بێ لە بەشی نەفس، کەسێ وانەبێ لای ئەهلی تەحقیق بە باڵغی ناژمێرن. (پارچە):

وێنەی ئادەمی ئەبێ، دەنکێ ئاو چل ڕۆژ لە ڕەحەم بمێنێتەوە
ئەگەر چل ساڵ بێ‌و بێ‌عەقڵ‌و ئەدەب کەس بە ئادەمی ناخوێنێتەوە

(پارچە):

پسری را پدر وصیّت کرد — کای جوان‌مرد یاد گیر این پند
هرکه با اهل خود وفا نکند — نشود دوستْ‌روی و دولتمند

مَثَل: کژدم را گفتند: چرا به زمستان بیرون نمی‌آیی؟ گفت: به تابستان چه حرمت دارم که به زمستان نیز بیرون آیم.

## حکایت [۱۰]

فقیره‌ی درویشی حامله بود مدّتِ حمل به سر آورده؛ درویش را همه عمر فرزند نیامده بود، گفت: اگر خداوند تعالیٰ مرا پسری بخشد جز این خرقه که پوشیده دارم هرچه در ملکِ من است ایثارِ درویشان کنم. اتفاقاً پسر آورد و سفره‌ی درویشان به موجبِ شرط بنهاد. پس از چند سال که از سفرِ شام بازآمدم به محلّتِ آن دوست برگذشتم و از چگونگیِ حالش خبر پرسیدم. گفتند: به زندانِ شحنه دَرَست. سبب پرسیدم؛ کسی گفت: پسرش خمر خورده است و عربده کرده و خونِ کسی ریخته و از میان گریخته و پدر را به علّتِ او سلسله در پای است و بندِ گران بر دست. گفتم: این بلا را او به حاجت از خدای خواسته است.

زنانِ باردار، ای مردِ هشیار، — اگر وقتِ ولادت مار زایند
ازان بهتر به نزدیکِ خردمند — که فرزندانِ ناهموار زایند

## حکایت [۱۱]

طفل بودم که بزرگی را پرسیدم از بلوغ. گفت: در مسطور آمده است که سه نشان دارد: یکی پانزده سالگی و دوم احتلام و سوم برآمدنِ مویِ پیش؛ اما در حقیقت یک نشان دارد و بس: آن که در بندِ رضای حق، جلَّ و عَلا، بیش ازان باشی که در بندِ حظِّ نفسِ خویش و هر که در او این صفت موجود نیست به نزدِ محقّقان بالغ نشمارندش.

به صورت آدمی شد قطره‌ی آب — که چل روزش قرار اندر رَحِم ماند
وگر چل ساله را عقل و ادب نیست — به تحقیقش نشاید آدمی خواند

***

جوانمەردیو لوتفە پێی ئەڵێن ئینسان    ئەم نەخشو ماددە هیچ نییە لە کار
هونەری ئەوێت کە بکرێ وێنە    لە هەیوانانا بە بۆیەو ژەنگار[1]
جیهان خستنە دەس هیچ هونەر نییە    دڵێ بێنە دەس ئەتوانی ئەی یار[2]

## چیرۆك (١٢)

ساڵێك بەربەرەکانێ کەوتبوە ناو حاجییە پیادەکانەوەو منیش لەو سەفەرەدا پیادە بووم، ئینساف بدەم کەوتینە سەرو ڕووی یەکترو جنێوو ناسزا بەیەکدان. کەژاوە نشینێ بە هاوتای خۆی وت: زۆر سەیرە پیادەی شەترەنج ئەگەر خانەکانیان بردە سەر ئەبن بە فەرزینو چاکتر ئەبن لەوسایان، کەچی حاجییە پیادەکان بیابان ئەبەنە سەرو بەدتر ئەبن.

لەبری من بڵێ بە حاجی بەلاف    کە پێستی خەڵکی ئەدرێ بە ئازار
کە تۆ حاجی نیت حوشتر حاجییە    خۆراکی دڕکەو ئەگرێتە شان بار

## چیرۆك (١٣)

هیندویەك یاری نەوت هاویشتن فێر ئەبوو، دانشمەندێ پێیوت: تۆ کە ماڵەکەت قامیشە ئەم یارییەت بۆ ناشێ بیکەی بە پیشە!

دوو وتە مەڵی یەکێ ناسەواب    دووەم خراپ بێ بۆ وەڵامو جواب

## چیرۆك (١٤)

پیاوێك چاوی ئەیەشا، چووە لای بەیتالێ بۆی دەرمان بکات. بەیتاڵ ئەو دەرمانەی چوارپێی پێدەرمان ئەکرد هێنای بە چاویا، کوێر بوو. شکاتیان بردە لای دادگەر، وتی: بڕۆ! هیچ تاوانێ نییە، ئەگەر ئەمە کەر نەبوایە نەئەچوو بۆلای بەیتال. مەبەست لەم وتەیە

---

(١) وەرگێر، وشەی (شنگرف)ی بە بۆیە واتە: بۆیاخ لێکداوەتەوە، بەڵام شەنگرف چەرمێکە سوورکە لە جیوەو گۆگردو چەن شتیتر دروست ئەبێ، ژەنگار یا (زنگار)یش چەرمێکە سەوزکە لە تێکەڵاوکردنی ئاسنو مسو چەن شتیتر بەدەس دێ، وە ئەم دوانیشە لە هونەری وێنگەری ونەقاشیدا بەکار ئەربرێن. «ك».

(٢) لە نووسخەکەی بەردەستی ئێمەدا ئەم بەیتەش هەیە:

«چو انسان را نباشد فضل و احسان    چە فرق از آدمی تا نقش دیوار»
کە ئینسان نەیبێ گەورەیی و ئیحسان    نەخشی دیوارە بێشك و گومان،ـع.

جوان‌مردی و لطف است آدمیّت — همین نقشِ هیولانی مپندار
هنر باید، که صورت می‌توان کرد — به ایوان‌ها در، از شنگرف و زنگار
چو انسان را نباشد فضل و احسان — چه فرق از آدمی تا نقشِ دیوار
به دست آوردنِ دنیا هنر نیست — یکی را گر توانی دل به دست آر

## حکایت [۱۲]

سالی نزاعی در پیادگانِ حُجّاج افتاده بود و داعی در آن سفر هم پیاده بود. انصاف در سر و روی هم فتادیم و دادِ فسوق و جدال بدادیم. کجاوه نشینی را دیدم که با عدیلِ خویش می‌گفت: یاَلْلعَجَبْ! پیاده‌ی عاج چون عرصه‌ی شطرنج به سر می‌بَرَد فرزین می‌شود یعنی بهْ ازان می‌شود که بود و پیادگانِ حاج بادیه به سر بردند و بتر شدند!

از من بگوی حاجیِ مردم گزای را
کو پوستینِ خلق به آزار می‌درد
حاجی تو نیستی شترست از برای آنک
بی‌چاره خار می‌خورد و بار می‌برد

## حکایت [۱۳]

هندویی نفط اندازی همی آموخت. حکیمی گفت: تو را که خانه نیین است، بازی نه این است.

تا ندانی که سخن عینِ صواب است مگوی
وانچه دانی که نه نیکوش جواب است، مگوی

## حکایت [۱۴]

مردکی را چشم درد خاست. پیشِ بیطار رفت تا دوا کند. بیطار از آن چه در چشمِ چهارپایان می‌کند در چشمِ وی کشید و کور شد. حکومت پیشِ داور بردند؛ گفت: بر او هیچ تاوان نیست، اگر این خر نبودی پیشِ بیطار نرفتی. مقصود از این سخن آن است تا

ئەوەیە هەتا بزانی هەرکەس ئیش بە ئیش‌نەزان بکات پەشیمان ئەبێتەوە، وە لای خاوەن عەقڵانیش بە سووك عەقڵ دەدرێتە قەڵەم.

| | |
|---|---|
| پیاوی بە هۆشی ڕووناك بیر ئاسان | گرنگ ئیش نادا بە پیاوی نەزان |
| کەسێ بای‌بدا لە بانی حەسیر | بۆ بادان نایەن بۆ کارگەی حەریر |

## چیرۆك (١٥)

یەکێ لە پێشەواگەورەکان کوڕێکی مرد. لێیان پرسی: چی لە سنۆقی گۆڕی کوڕەکەی بنووسن؟ فەرمووی ئایەتی قورئانی پیرۆز لەوە عەزیزترە لەو شوێنەدا بنووسرێت کە دوارۆژ بکەوێتە خوارەوەو خەڵکی بەسەریا بڕۆن‌و سەگ پیاهەڵمیزێ. ئەگەر هەر زۆر پێویستە شتێك بنووسن با ئەم شیعرە بێ بەسە: (پارچە).

| | |
|---|---|
| ئای کە هەر کاتێ سەوزە لە باخان | ئەڕۆی چەند خۆشە ئەوسا دڵی من |
| تۆیش وەرە ئەی یار ببینە بەهار | سەوزە ڕواوە لەسەر گڵی من |

## چیرۆك (١٦)

خواپەرستی بە لای یەکێ لە خاوەن نیعمەتەکانا ڕۆیشت کە دەس‌و قاچی کۆیلەیەکی بەستبوو، سزای ئەدا. وتی: ئەی کوڕ وەك خوای بەرزرو بڵند بەندەیەکی دیلی دەسەڵاتی تۆ کردووەو دەسڵاتی بە تۆ داوە، سوپاسی بەخشایشی خوای بەرزو بڵند بێنەجێ‌و، ئەوەندەت جەورو جەفا لاپەسەند نەبێ بۆ ئەم کۆیلەیە، نەوەك سبەینێ کە ڕۆژی قیامەت دێ لە تۆ چاکتر بێ‌و تووشی شەرمەزاری ببی. (مەسنەوی):

| | |
|---|---|
| لەسەر کۆیلەکان قین مەخەرە کار | زۆریان لێ مەکەو مەیاندە ئازار |
| وا بە دە درم کڕێت دەست خست | خۆ بە دەسەڵات نەت‌کردوە سروشت |
| هەتا کەی زۆرو سەرکەشی‌یو قین | گەورەتر هەیە: جیهان ئافەرین |
| خاوەن ئەرسەلان[1]، ئەی خاوەن ئاغوش | فەرمان دەرانت مەکە فەرامۆش[2] |

---

(١) ئەم وشە، وشەیەکی تورکییە لە زۆر زمانا ناوی کوڕ بەم ناوە دەنرێت. ئەرسەلان:شێر، شێر دڕندە، شێوەی مەجاز دەبێتە پیاوی دلێرو شوجاع. «ك».

(٢) ئەرسەلان ئاغوش: دوو ناوی بڵاوی تورکین. لێرەدا ناوی دوو کۆیلەن،«ع.م».

بدانی که هر آن که ناآزموده را کارِ بزرگ فرماید، با آن که ندامت بَرَد، به نزدیکِ خردمندان به خفّتِ رأی منسوب گردد.

نـدهد هوشمندِ روشن رای　　به فرومایه کارهای خطیر
بوریاباف اگرچه بافنده‌ست　　نبرندش به کارگاهِ حریر

## حکایت [۱۵]

یکی را از بزرگان ایمّه پسری وفات یافت. پرسیدند که بر صندوقِ گورش چه نویسیم؟ گفت: آیاتِ کتابِ مجید را عزّت و شرف بیش ازان است که روا باشد بر چنین جای‌ها نِبشتن که به روزگار سوده گردد و خلایق بر او گذرند و سگان بر او شاشند، اگر به ضرورت چیزی همی نویسند این قدر بیت کفایت است:

وه که هرگه که سبزه در بُستان　　بدمیدی، چه خوش شدی دلِ من
بگذر، ای دوست، تا به وقتِ بهار　　سبزه بینی دمیده بر گِلِ من

## حکایت [۱۶]

پارسایی بر یکی از خداوندانِ نعمت گذر کرد که بنده‌ای را دست و پای بسته عقوبت همی کرد. گفت: ای پسر هم‌چو تو مخلوقی را خدای عَزَّوَجَلَّ، اسیرِ حکمِ تو گردانیده است و تو را بر وی فضیلت نهاده، شکرِ نعمتِ باری تَعالیٰ به‌جای آر و چندین جفا بَرْ وی مپسند شاید که فردای قیامت بِهْ از تو باشد و شرمساری بری.

بر بنده مگیر خشم بسیار　　جورش مکن و دلش میازار
او را تو به ده دِرم خریدی　　آخر نه به قدرت آفریدی
این حکم و غرور و خشم تا چند؟　　هست از تو بزرگ‌تر خداوند
ای خواجه‌ی ارسلان و آغوش　　فرماندهِ خود مکن فراموش

لە حەدیسا هەیە لە گەورەی عالەمەوە سەلامی خوای لێبێ کە فەرموویەتی: گەورەترین داخ لە ڕۆژی قیامەتا ئەوەیە کە کۆیلەکی خواپەرست ئەبەنە بەهەشتو خاوەنە بێدینەکەی ئەبەنە دۆزەخ. (پارچە):

کۆیلەیەك وا ئەکا خزمەتی تۆ ڕقی لێمەگرە، مەیکە زۆر دڵگیر

ئابروو چوونە لە ڕۆژی دوایی‌دا کۆیلە ئازادو گەورە پێ زنجیر

## چیرۆك (١٧)

ساڵێ لە بەڵخ لەگەڵ شامی‌یان سەفەرم کردو ڕێگە لەبەر جردە پڕ ترس بوو. گەنجێ بۆ ئاگاداری هاوڕێمان بوو، سوپەر بازو کەوان ئەندازو سیلاح شۆڕو خاوەن زۆر، کە دە پیاو نەیان‌ئەتوانی کەوانی ئەو ڕاکێشن‌و زۆردارانی ڕووی زەوی پشتیان لە زەوی نەئەدا. بەڵام وەکوو ئەزانی لە نیعمەتا بووبوو وە لەسێبەرا پەروەردە بووبوو، نە جیهان دیدە بوو وە نە سەفەرکەر. گرمەی تەپڵی دلاوەران بە گوێی نەگەیشتبوو، وە بریقەی شمشێری سوارانی نەدیبوو. (شیعر):

بە دەستی دوژمن نەکرابوو ئەسیر نەی دیبوو لە شەڕ تیربارانی تیر

واڕێکەوت لەگەڵ منا دوا بە دوای یەك ئەڕۆیشتین، بە هەردیوارێکی کۆن ئەگەیشت بە هێزی بازووی ئەی‌خست، وە هەر دارێکی گەورەی ئەدی بەزوری سەر پەنجەی هەڵی ئەکەند. بە شانازیەوە وتی:

فیل کوا تا ببینێ دوو بازووی گوردان شێر کوا تا ببینێ سەرپەنجەی مەردان

ئێمە لەو حاڵەدا بووین دوو جەردە لە پەنا بەردێ سەریان هێنایە دەرو ڕوویان تێکردین بۆ جەنگ یەکێکیان دارێکی بەدەستەوە بوو، ئەوی تریشیان مێکوتێکی لە بن دەستا بوو. بە جوانەکەم وت: خەریکی چیت وا دوژمن هات. (شیعر):

دە فەرموو ئەوە لاتە زەبرو زۆر دوژمن بە پێی خۆی ئەوا هاتە گۆڕ

دیتم جوانەکە تیرو تیروکەوانەکەی لە دەست کەوتە خوارو ئێسکی هاتە لەرزین. (تاك):

در خبرست از سیّدِ عالَم، صَلَّی اَللّٰهُ عَلَیْهِ وَ سَلَّمْ، که گفت: بزرگ‌ترین حسرتی روزِ قیامت آن بوَد که بنده‌ی صالح را به بهشت برند و خداوندگارِ فاسق به دوزخ.

بر غلامی کـه طَـوعِ خـدمتِ تست　　خشم بـی‌حد مـران و طـیره مگـیر
کـه فـضیحت بـوَد بـه روزِ شـمار　　بـــنده آزاد و خـــواجـه در زنـجیر

## حکایت [۱۷]

سالی از بلخ بامیانم سفر بود و راه از حرامیان پر خطر؛ جوانی به بدرقه همراهِ ما شد سپر باز، چرخ انداز، سلحشور، بیش زور که به ده مردِ توانا کمانِ او را زه کردندی و زور آورانِ روی زمین پشتِ او بر زمین نیاوردندی امّا چنان که دانی متنعّم بود و سایه پرورده نه جهان‌دیده و سفر کرده، رعدِ کوسِ دلاوران به گوشش نرسیده و برقِ شمشیرِ سواران ندیده.

نـــیفتاده در دستِ دشـــمن اسـیر　　به گِردش نه بـاریده بـارانِ تـیر

اتّفاقاً من و این جوان، در پیِ هم دوان، هر آن دیوارِ قدیمش که پیش آمدی به قوّتِ بازو بیفگندی و هر درختِ عظیم که دیدی به زورِ سرپنجه برکندی و تفاخر کنان گفتی:

پیل کو تا کَتِف و بازوی گُـردان بـیند　　شیر کو تا کف و سر پنجه‌ی مردان بیند

ما در این حالت که دو هندو از پسِ سنگی سر برآوردند و آهنگِ قتالِ ما کردند بـه دستِ یکی چوبی و بغلِ آن دیگر کلوخ کوبی. جوان را گفتم: چه پایی؟

بـیار آن چـه داری ز مـردیّ و زور　　که دشمن به پای خود آمد به گـور

نە هەرکەسێ کە بە تیر مووی قڵاشتو پۆشی زرێ

لە ڕۆژی هەڵمەتی جەنگا بە پێوە خۆی ئەگرێ

لەوە زیاتر چارەیەکمان نەدی کە وڵاغو چەكو جلو بەرگمان وازلێهێناو گیانمان بە سەلامەتی دەرکرد. (پارچە):

لە ئیشو کاری گران مەردی کاردیدەی ئەوێ

کە شێری شەرزە بهێنێتە ناوی پێچی کەمەند

جەوان ئەگەرچی فیلتەنو هێزی بازووی بێ

لەشەڕ لە دوژمن ئەترسێو ئەپچڕێ لێی پەیوەند

نەبەرد ئەزانێ کەسێ تەجرەبەی لە مەیدان بێ

وەکو لە مەسئەلەی شەرع ئەزانێ دانشمەند

## چیرۆك (١٨)

دەوڵەمەندزادەیەکم دی لەسەر گۆڕی باوكو دایکی دانیشتبوو، و لەگەڵ بێچوە دەروێشێ لە بەربەرەکانێدا بوو کە سندووقی گۆڕی باوکی من بەردەو شتی جوانی لێنووسراوە، و بەردی مەڕمەڕی لە ژێردا داخراوە، و خشتی پیرۆزەی لێ دامەزراوە. چۆن لە گۆڕی باوکی تۆ ئەچێ کە خشتێ دوانی لێپێکەوەنراوە و دوو سێ مست خۆڵی تێکراوە. کوڕە دەروێش ئەوەی بیست وتی: هەتا باوکت لە ژێر ئەو هەموو بەردە گرانانە دێتە دەرێ، باوکی من ئەگاتە بەهەشت. (تاك):

| | |
|---|---|
| کەر هەتا شانی سووکتر بێ لە بار | ئاسانتر ئەبێ بێگومان بۆ غار |

* * *

| | |
|---|---|
| دەروێش کە زۆری هەژاری کێشا | لە قاپی مەرگا سووك ئەبێ باری |
| کەسێ لە نازو نیعمەتا ژیا | مردن لەلای ئەو زۆرە ئازاری |
| دیلێ ڕزگاری بووبێ لە زیندان | چاتر لە میرێ بووبێ دوچاری |

تیر و کمان را دیدم از دستِ جوان افتاده و لرزه بر استخوان.

نه هرکه موی شکافد به تیرِ جوشن خای
به روز حملهٔ جنگاوران بدارد پای

چاره جز آن ندیدیم که رخت و سلاح و جامه رها کردیم و جان به سلامت بیاوردیم.

به کارهای گران مردِ کاردیده فرست   که شیرِ شرزه درآرد به زیرِ خمِّ کمند
جوان اگرچه قوی یال و پیل‌تن باشد   به جنگِ دشمنش از هول بگسلد پیوند
نبرد پیشِ مصاف آزموده معلوم است   چنان که مسألهٔ شرع پیشِ دانشمند

## حکایت [۱۸]

توانگرزاده‌ای را دیدم بر سرِ گورِ پدرش نشسته و با درویش بچه‌ای مناظره در پیوسته که صندوقِ تربتِ پدرم سنگین است و کِتابه رنگین و فرشِ رُخام انداخته و خشتِ زرّین در او ساخته، به گورِ پدرت چه مانَد: خشتی دو فراهم آورده و مشتی دو خاک بر او پاشیده؟

درویش پسر این بشنید و گفت: تا پدرت زیرِ آن سنگ‌های گران بر خود بجنبیده باشد، پدرِ من به بهشت رسیده باشد.

خر که کمتر نهند بر وی بار   بی‌شک آسوده‌تر کند رفتار

***

مردِ درویش که بارِ ستمِ فاقه کشید
به درِ مرگ همانا که سبک‌بار آید
وان که در دولت و در نعمت و آسانی زیست
مردنش زین همه، شک نیست که دشوار آید
به همه حال اسیری که ز بندی برهد
بهتر از حالِ امیری که گرفتار آید

## چیرۆك (١٩)

لە گەورەیەکم پرسی: مەبەست لەم فەرموودەیە چییە کە پێغەمبەر، سەلامی خوای لێ بێ، فەرموویەتی: «اَعْدیٰ عَدُوِّك نَفْسُك الَّتِي بَيْنَ جَنْبَيْك» (واتە: دوژمنترین دوژمنی تۆ ئەو نەفسەتە لە نێوانی دوو پەراسووتایە). فەرمووی هۆی ئەوەتە هەر دوژمنێ خزمەتی بکەی ئەبێ بە دۆست، نەفس نەبێ تا خزمەتی بکەی ناپەسندتر ئەبێ.

فریشتە خوو ئەبێ ئینسان بە مەرجی کەم خواردن

بە چەشنی لاشەیی بێگانە، گەر بخوا وەکوو حەیوان

مەبەستی هەر کەسێ بێنیتە جێ ئیتاعەت ئەکا

نەفس نەبێ، مەبەسی دی ئیتر ئەدا فەرمان

## بەربەرەکانێی سەعدی لەگەڵ موددەعی بە لاف لە بەیانی دەوڵەمەندو دەرویشی یا

یەکی لە وێنەی دەروێشان، نەوەك لەسەر ڕەوشتی ئەوان، لە ئەنجومەنێکا دیم دانیشتووە، دەستی کردووە بە ناشیرینی، دەفتەری شکاتی کردووەتەوەو خراپەی دەوڵەمەند ئەڵێ. وتاری گەیشتە ڕادەیەك کە دەروێش دەستی دەستەڵاتی بەستراوەو زەنگین پێی ڕاستی شکاوە. (تاك):

سەخی پیاو نییە لە دەستیا درەم　　　خاوەنی سامان لای نییە کەرەم

منیش کە پەروەردەی دەستی بەخششی گەورەکانم، ئەم قسەیەم لا گران بوو، وتم: ئەی دۆست دەوڵەمەندان دەرامەتی کەمدەستانن‌و زەخیرەی گۆشەنشینان. مەبەستی خاوەن نیازان‌و پەنای سەفەرکەران‌و هەڵگری باری گرانن بۆ حەسانەوەی کەسان. کاتێ دەست بۆ خواردن ئەبەن کە دەس‌و پێوەندو ژێر دەستانیان بخۆن. زیادەی بەخشایشی ئەوان ئەگا بە بێوەژنان‌و پیران‌و خزمان‌و دراوسێیان. (هۆنراوە):

بۆ دەوڵەمەندە لە وەقف‌و لە نەزرو میوانی

زەکات‌و فیترەو ئازادی دیاریی قوربان

## حکایت [۱۹]

بزرگی را پرسیدم در معنیِ این حدیث که: اَعْدیٰ عَدُوِّكَ نَفْسُكَ اَلَّتی بَیْنَ جَنْبَیْكَ. گفت: به حکم آن که هر آن دشمنی که با وی احسان کنی دوست گردد مگر نفس را که چندان مدارا بیش کنی مخالفت زیادت کند.

**فرشته خوی شود آدمی به کم خوردن　　وگر خورد چو بهایم، بیوفتد چو جماد**
**مرادِ هرکه برآری مطیعِ امرِ تو گشت　　خلافِ نفس که فرمان دهد چو یافت مراد**

## جدالِ سعدی با مدّعی در بیانِ توانگری و درویشی

یکی در صورتِ درویشان نه بر صفتِ ایشان در محفلی دیدم نشسته و شُنعتی در پیوسته و دفترِ شکایت باز کرده و ذمِّ توانگران آغاز کرده، سخن بدین جا رسانیده که درویش را دستِ قدرت بسته است و توانگران را پای ارادت شکسته.

**کریمان را به دست اندر، دِرَم نیست　　خداوندانِ نعمت را کرم نیست**

مرا که پروردهی نعمتِ بزرگانم این سخن سخت آمد؛ گفتم: ای یار، توانگران دخلِ مسکینانند و ذخیرهی گوشهنشینان و مقصدِ زایران و کهفِ مسافران و مُحتملِ بارِ گران از بهرِ راحتِ دگران؛ دستِ تناول به طعام آنگه برند که متعلّقان و زیر دستان بخورند و فضلهی مکارمِ ایشان به اَرامِل و پیران و اَقارِب و جیران رسیده.

**توانگران را وقف است نذر و مهمانی　　زکوة و فِطره و اِعتاق و هَدْی و قربانی**

لە کوێ ئەگەیتە دەوڵەتی ئەو تۆ کەناتوانی

مەر ئەم دوو ڕەکعەتە نوێژە بە سەد پەرێشانی

ئەگەر دەسەڵاتی بەخشش‌و جوودە یا هێزی سجوودە بۆ دەوڵەمەند باشتر ئەچێتە سەر کەماڵێکی پوخت‌و بەرگێکی پاك‌و زەمینێکی ئاگاداری کراوو دڵێکی بەتاڵی هەیەو هێزی خواپەرستی لە پارووی نازك‌و توانای خواپەرستی لە جل‌و بەرگی پاك پەیدا ئەبێ کە لە سکی خاڵی چ هێزێ دیتەدەر، وە لە دەستی بەتاڵ چ مروەتێ، لە قاچی بەستراو چ ڕویشتنێ‌و لە دەستی برسی چ خێرێ (پارچە):

شەو پەراگندە ئەنوێ هەرکەسێ ئەو ڕووی نەبینرا لە ڕووی بەیانا

مێروو هاوین کە کردو کۆشە ئەکات دەست بەتاڵ بێ هەتا لە زستانا[1]

فەراغەت‌و دڵنیایی بە هەژارییەوە ناوەستێ، وگردی (کۆمەڵی) لە تەنگ‌دەستی‌یا وێنە ناگرێت. یەکێ (الله اکبر)ی شێوان بڵێ‌و یەکێ چاوەڕوانی شێو بێ چۆن وەکوو یەك ئەبن؟

خاوەنی ڕۆژی خەریك یەزدانە پەرێشان ڕۆژی دڵ پەرێشانە[2]

پاشان، خواپەرستیی ئەوان لە وەرگرتن نزیکترە چونکە گردو دڵ لە جێن، نەوەك پەرێشان‌و پەراگەندە دڵ. هۆی ژیانیان ڕێك [خستووە]‌و وە بە عیبادەت‌و خواپەرستییەوە خەریکن. عەرەب ئەڵێ (أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنَ الْفَقْرِ الْمُكِبِّ وَ جِوارِ مَنْ لا يُحِبّ). (پەنا ئەگرم بە خوا لە هەژاری بەسەرا کەوتوو وە لە دراوسێیەتیی کەسێ خۆشی نەوێم). لە فەرموودەی پێغەمبەرایە، سەلامی خوای لێ‌بێ، (الفَقْرُ سَوادُ الوَجْهِ فِي الدارَيْنِ) واتە: هەژاری مایەی ڕوو ڕەشی هەردوو دنیایە. وتی: ئەوەت بیستووە، بەڵام ئەوەت نەبیستووە کە فەرموویەتی (الفَقْرُ فَخْرِي) واتە: هەژاری مایەی شانازیی منە. وتم: بێ‌دەنگ‌بە ئامانجی گەورەی عالەم، سەلامی خوای لێ‌بێ، بۆ دەستەیەك بووە کە مەردی مەیدانی ڕەزان‌و سوپەری تیری قەزان، نەوەك ئەوانە خەرقەی ئەوان ئەپۆشن‌و پارووی ئەوان ئەفرۆشن. (چواری):

---

(١) بێنەوا بیری لەلای نان‌و جلە شەو هەوای بۆ نایە ژێ‌تاری شلە
ئای لە مێروو چەندە هاوین کار ئەکا بۆ چلەی زستان زەخیرەی چل چلە،-«ك».

(٢) ڕۆژی لە هەردوو بەیتەکەدا بە مانا رزق‌و ڕۆزییە.

**تو کی به دولتِ ایشان رسی که نتوانی    جز این دو رکعت و آن هم به صد پریشانی**

اگر قدرتِ جودست وگر قوّتِ سجود توانگران را بِهْ میسّر می‌شود که مالِ مُزَکّیٰ دارند و جامه‌ی پاک و عِرضِ مصون و دلِ فارغ؛ و قوّتِ طاعت در لقمه‌ی لطیف است و صحّتِ عبادت در کِسوتِ نظیف. پیداست که از معده‌ی خالی چه قوّت آید و از دستِ تهی چه مروّت و از پایِ بسته چه سَیر آید و از دستِ گرسنه چه خیر.

**شب پراگنده خُسبد آن که پدید    نبوَد وجهِ بامدادانش**
**مور گرد آورد به تابستان    تا فراغت بوَد زمستانش**

فراغت با فاقه نپیوندد و جمعیّت در تنگدستی صورت نبندد؛ یکی تَحْرِمه‌ی عِشا بسته و دیگری منتظرِ عَشا نشسته، هرگز این بدان کی مانَد؟

**خداوندِ مُکنت به حق مُشتَغِل    پراگنده روزی، پراگنده دل**

پس عبادتِ اینان به قبول نزدیک‌تر است و جمعند و حاضر نه پریشان و پراگنده خاطر، اسباب معیشت ساخته و به اورادِ عبادت پرداخته؛ عرب گوید: **أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنَ ٱلْفَقْرِ ٱلْمُکِبِّ وَ جِوارِ مَنْ لا اُحِبُّ**؛ و در خبر است: **أَلْفَقْرُ سَوادُ ٱلْوَجْهِ فِی ٱلدّارَیْنِ**. گفت: این شنیدی و آن نشنیدی که فرمود: **أَلْفَقْرُ فَخْری**. گفتم: خاموش که اشارتِ خواجه، عَلَیهِ‌ٱلسَّلام، به فقرِ طایفه‌ای است که مردِ میدانِ رضایند و تسلیمِ تیرِ قضا، نه اینان که خرقه‌ی ابرار پوشند و لقمه‌ی ادرار فروشند.

ئـەی وەك تـەپڵی بـانگ لە نـاوەوە هـیچ　　چــارەی تـوێشــووکە نـیهایەت هـیچە
پیاویت، ڕووی تەماع لە خەڵك وەرگێڕە!　　هــەزارەی تـەزبێح لە دەست مــەپێچــە

دەروێشی نەفام ئارام ناگرێت هەتا ئیشی ڕوو نەکاتە کوفر (**كَادَ الفَقْرُ اَنْ يَكُونَ كُفْراً**) واتە: نزیکە هەژاری بە کوفر. بێ‌نیعمەت‌و سامان ڕووتی بۆ پۆشتە ناکرێتەوەو بۆ ڕزگار بوونی گورفتار کوشش ناکات. کێ دەستەی ئێمە بە پایەی ئەوان ئەگەیەنێت‌و دەستی بەرز کەی لە دەستی نزم ئەچێت، وە خوایەك کە ستایشی ئـەو گـەورەیە لە قـورئانێکـا کـە لە مەعنای لانادرێ، لە نازو نیعمەتی دانیشتوانی بەهەشت هـەواڵی لێ‌داوەو فـەرموویەتی ﴿**أُولَئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَعْلُومٌ**﴾. واتە ئەوانەی لە بەهەشتان مووچەیەکی دیاری کراویان هەیە.

تـینوو لە شــەوا کــە ئـەچێتـە خـەو　　سەرچاوەی ئاوە لەبەر چاوی ئـەو[1]

لەم حاڵەدا من ئەم وتەیەم ئـەوت جـڵەوی تـوانـای دەروێش لە دەسـتی خـۆگـرتنی دەرچوو، تێغی زمانی ڕاکێشا، ئەسپی فەساحەتی لە مەیدانی بێ‌شەرمی‌یا تاو داو وتی: ئەوەندەت زیادە لە بەیانی ڕەوشتی ئەوانا وتو ئەوەندەت وتاری پەرێشان وت کە خەیاڵ وا بزانێ ئەمانە تریاقن یا کلیلی خانووی ئەرزاقن. کـۆمـەڵێ خـاوەن دەعـیەو، سـەرکەشی خۆپەسەند، لە خەڵکی بە فیز، خەریکی حاڵ‌و نیعمەت‌و، شەیدای گەورەیی‌و حورمەت‌و سەروەت نادوێن مەگەر بە تکا لێ کردن، تەماشا ناکەن مەگەر بە مۆنی، زانایان بە سواڵکەر ئەزانن‌و، هەژاران بە بێ‌سەرو پێ تانووت لێ‌ئەدەن بە هۆی ماڵێکەوە کە هەیانەو بە پایەو حورمەتێ کە گومانی ئەبەن، لە ژوور هەموانەوە دائەنیشن. نە ئەوەیان لە سەرایە سەیری کەسێ بکەن. بێ‌ئاگا لە فەرموودەی دانشمەندان کە وتوویانە هەرکەسێ بە خواپەرستی لەویتر کەمترە، و بە نیعمەت زۆرتر، دیمەن دەوڵەت‌دارەو بە مەعنا هەژارە. (تاك):

گەر دەعیە کا بە ماڵی لەسەر عاقڵا ئەو کەرە

تۆ بەکەری بزانـە ئـەگـەر گـاوی عـەنبەرە[2]

---

(١) زۆر زەربولمەسەل (وێنە لێ‌دان)، (پەندی پێشینیان) فۆلکلۆری بـە زمـانی کـوردی هـەیە لەگەڵ ئەم شیعرەدا دەقاودەق دێنەوە، وەکوو: کەڵەشێری برسی، خەو بە خەرمانی ئاو بردووە دەبینێ. خەلە سێن، هەر هەواڵی مەن ئەپرسێ. «ك».

(٢) عەنبەر: شتێکی بۆن خۆشە. گاوی عەنبەر: ماسی عەنبەر: جۆرە گیانداریکی لە زەریا دەژی

ای طبلِ بلند بـانگِ در بـاطن هـیچ بی‌توشه چه تدبیر کنی وقتِ بسیچ؟
رویِ طمع از خلق بـپیچ، ار مـردی تسبیحِ هـزار دانـه بـر دست مـپیچ

درویشِ بی‌معرفت نیارامد تا فقرش به کفر انجامد، کَادَ ٱلْفَقْرُ اَنْ یَکُونَ کُفْراً، که نشاید جز به وجودِ نعمت برهنه‌ای پوشیدن یا در استخلاصِ گرفتاری کوشیدن، و ابنای جنسِ ما را به مرتبه‌ی ایشان که رسانَد و یَدِ عُلْیا به یَدِ سُفْلیٰ چه مانَد؟ نبینی که حق، عَزَّ وَ عَلا، در محکمِ تنزیل از نعیمِ اهلِ بهشت خبر می‌دهد که: اُولٰئِکَ لَهُمْ رِزْقٌ مَعْلُومٌ، تا بدانی که مشغولِ کفاف از دولتِ عفاف محروم است و مُلکِ فراغت زیرِ نگینِ رزقِ معلوم.

تشـــنگان را نـماید انـدر خـواب همه‌ی عالَم به چشم، چشمه‌ی آب

حالی که من این سخن بگفتم عنانِ طاقتِ درویش از دستِ تحمّل برفت؛ تیغِ زبـان برکشید و اسبِ فصاحت در میدانِ وقاحت جهانید و گفت: چندان مبالغه در وصفِ ایشان بکردی و سخن‌های پریشان بگفتی که وهم تصوّر کند که تریاقند یا کلیدِ خزانه‌ی ارزاق؛ مشتی متکبّر، مغرور، مُعجَب، نَفور، مُشتغلِ مال و نعمت، مُفتَتَنِ جاه و ثروت که سخن نگویند الّا به سفاهت و نظر نکنند الّا به کراهت؛ علما را به گدایی منسوب کنند و فقرا را به بی‌سر و پایی طعنه زنند؛ به غرّتِ مالی که دارند و عزّتِ جاهی که پندارند برتر از همه نشینند و خود را بهتر از همه بینند؛ نه آن در سر دارند که سر به کسی بردارند، بی‌خبر از قولِ حکیمان که گفته‌اند: هر که به طاعت از دیگران کم است و به نعمت بیش، به صورت توانگر است و به معنی درویش.

وتم: خراپ وتنی ئەمانە ڕەوا مەبینە کە خاوەنی کەرەمو بەخششن. وتی: هەڵەت وت کۆیلەی درەمن، چ کەڵکیان هەیە هەوری ئازارنو[1] نابارن. سەرچاوەی ڕۆژنو ڕووناکی بەکەس نادەن. سواری وڵاغی دەسەڵاتنو لێ ناخوڕن، هەنگاوێ بۆ خوا دانانێنو درەمێك بەبێ شانازیو ئازار نادەن، بێ ڕەنج ماڵ پێکەوە ئەنێنو بە گرانی ئاگاداری ئەکەنو بە داخەوە بەجێی دێڵن. گەورەکان وتوویانە زیوی پیاوی ڕژد کاتێ لە خاکا دێتەدەر کە ئەو خۆی بچێتە ناو خاکەوە.

بە ڕەنجو کۆششی زۆر ماڵی خستە ژێر چنگی

کەسێکی تر چ بە ئاسان لە دەستی دەر هانی

لە وەڵاما پێم وت: ئاگاداریت بە سەر چرووکی خاوەن نیعمەتەکانا وەرنەگرتووە مەگەر بە هۆی گەدایی‌یەوە، ئەگینا هەرکەس واز لە تەماع بێنێ بەخشایشو چرووکی لا یەکسان ئەنوێنێ. مەحەك ئاڵتوون ئەناسێو گەدایش دەس قووچاو. وتی: بەو تاقی کردنەوەیە ئەیڵێم کە دەسو پەیوەند لە بەردەرگا ڕائەگرن دڵسەختو دڵڕەقەکان هەڵئەبژێرن، هەتا بین بە یاری عەزیزان[2]و دەس بنێن بە سنگی پیاوچاکانەوە، وە ئەڵێن کەس لە ماڵەوە نییەو ڕاس ئەکەن. (تاك):

پیاوێ کە عەقڵو هیممەتو هۆشی نەبوو وکەماڵ

فەرمووی بە دەرگاوان کە بڵێ کەس نییە لە ماڵ

وتم: دوای ئەوە لە دەست گەدایان هاتوونە گیانو لە پارچە قاقەزیان کەوتوونە فوغان ڕەوای عەقڵ نییە کە ئەگەر لمی بیابان ببێ بە دوڕڕو چاوی گەدایانی پێ پڕبێ. (شیعر):

نیعمەتی جیهان چاوی تەماعکار پڕ ناکا وەك چاڵ بە ئاوی شەونم[3]

لە هەر جێیەك سەختی چەشتوویەك ئەبینی یا تاڵی کێشاوێك، بە هۆی چاوچنۆکی‌یەوە خۆی فڕێ ئەداتە [ئیش و] ڕۆژگاری بە ترسو لە سزای دواڕۆژ ناکەوێتە هەراسو حەڵاڵو حەرام لەیەك جیاناکاتەوە. (تاك):

---

و عەنبەر لەوەوە بە دەست دێ،ـع.

(١) ناوی مانگێکی سریانییە.

(٢) لە فارسییەکەیدا: تابارِ عزیزاندهند: واتە: تا ڕێگەی عەزیزان نەدەن،ـع.

(٣) خەسیس تێر نابێ بە دنیا تەواو حەوزێ پڕ نابێ بە شەونم، لە ئاو،ـ«ك».

گر بی‌هنر به مال کند فخر بـر حکـیم　　　کونِ خرش شمار وگر گـاوِ عـنبرست

گفتم: مذمّتِ اینان روا مدار که خداوندِ کرمند. گفت: غلط گفتی که بنده‌ی درَمند؛ چه فایده؟ چون ابرِ آذرند و نمی‌بارند و چشمه‌ی آفتابند و بر کس نـمی‌تابند؛ بـر مـرکبِ استطاعت سوارند و نمی‌رانند؛ قدمی بهرِ خدا ننهد و دِرَمی بی مَنّ وَ اَذیٰ ندهند؛ مالی به مشقّت فراهم آرند و به خسّت نگاه دارند و به حسرت بگذارند؛ چنان که بزرگان گفته‌اند: سیمِ بخیل از خاک وقتی برآید که وی در خاک رَوَد.

به رنج و سعی کسی نـعمتی بـه دست آرد
دگـر کس آیـد و بـی‌رنج و سـعی بـردارد

گفتمش بر بخلِ خداوندانِ نعمت وقوف نیافته‌ای الّا به علّتِ گدایی وگرنه هر که طمع یک سود نهد کریم و بخیلش یکی نماید؛ محک داند که زر چیست و گدا داند که مُمسِک کیست. گفتا به تجربتِ آن می‌گویم که متعلّقان بر در بدارند و غلیظانِ شدید برگمارند تا بارِ عزیزان ندهند و دستِ جفا بر سینه‌ی صاحب تمیزان نهند و گویند: کس این جا نیست و به حقیقت راست گفته باشند.

آن را که عقل و همّت و تـدبیر و رای نـیست
خوش گفت پرده‌دار که کس در سرای نـیست

گفتم: به عذرِ آن که از دستِ متوقّعان به جان آمده‌اند و از رقعه‌ی گدایان به فغان؛ و محالِ عقل است که اگر ریگِ بیابان دُر شود چشمِ گدایان پُر شود.

دیده‌ی اهلِ طمع بـه نـعمتِ دنـیا　　　پُر نشود هم‌چنان که چاه به شـبنم

هرکجا سختی کشیده‌ای تلخی دیده‌ای را بینی خود را به شَرَه در کـارهای مـخوف اندازد و از توابعِ آن نپرهیزد و از عقوبتِ ایزد نهراسد و حلال از حرام نشناسد.

ئەگەر کلۆیە بهاویژرێتە سەر سەری سەگ

لە شادمانی وەها تێ ئەگا کە ئێسقانە

دوو کەس کە دارە تەرمێ لەسەرشانیان دائەنێن

چرووك سروشت وەها تێ ئەگا کەوا خوانە

بەڵام خاوەنی جیهان بە چاوی لوتفی خوا سەیر کراوە و بە حەڵاڵو حەرام ئاگاداری کراوە. من کە هێشتا ئەم وتەیەم تەواو نەکردووە، بورهانو دەلیلم بۆت نەهێناوەتەوە، هیواداری ئینسافم، کە هەرگیز دیوتە دەستی دوعایەك بە شانەوە بەسترابێ، و یا بێ تاوانێ لە زیندانا دانیشتبێ یا بێ گوناهێ پەردەی درابێ یا دەستێ لە مەچەکا بڕابێ، مەگەر لەڕووی هەژارییەوە؟ شێر مەردانیان لەبەر کەمدەستی لە کونا گرتووەو کەعبەها[1] یان کون کردووە. جێی بڕوایە کە یەکێ لە هەژارن نەفسی ئەممارەی داوای ئارەزوویەکی لێ بکاو نەتوانێ بیگرێت دوچاری تاوان بێت. سكو ئالەت دوانەن، واتە بە سکێ بوون، هەتا ئەمیان لە جێ دایە ئەویان بە پێوەیە. بیستوومە کە دەروێشێکیان لەگەڵ منداڵێکی پێ گەیشتوو بە ئیشێکی پیسەوە گرت، لەگەڵ ئەوەشا کە شەرمەزار بوو و ترسی سەنگساری بوو، وتی: موسوڵمانینە توانای ژن هێنانم نییەو نایش توانم خۆم بگرم، ئەی چی بکەم؟ (لا رُهْبانِيَّةَ في الْاسْلامِ) واتە ڕەبەنایەتی[2] لە ئیسلامەتی دا نییە. ئەوەی کە هۆی ئارامی و گردی خەیاڵی دەوڵەمەندانە ئەوەیە کە هەرشەوی بوتێ ئەگرنە باوەش و هەر ڕۆژێ جوانێ لە ژوور سەریانە کە ڕۆژی رووناك لە جوانی ئەو دەستی بێ ئارامی وا لەسەر دڵ و سەروی خەرامان لە شەرمەزاری ئەو، پێی لە گڵایە. (تاك):

خوێنی ئازیزی داوە لەو چنگە سەرپەنجەکانی عەننابی ڕەنگە

ڕەوا نییە لەگەڵ جوان ڕووی وادا بە دەوری خراپەدا بگەڕێت یا ڕووبکاتە ناڕەوایی. (شیعر):

دڵێ کە حووری بەهەشتی ڕفاند بە ئازایی کەی ئەو دڵە هەیە باکی بتانی یەغمایی[3]

(١) مەبەس لە کەعبە: قاپوولکە ڕەقەکانی دوو پێن، کە بە فارسی پێی ئەڵێن (شتالنگ). «ك».
(٢) گوشەگیری، تەنیایی.
(٣) بتانی یەغمایی: شۆخانی دڵفڕێن، تاڵانکەری دڵان.

سگـــی را گــر کـلوخی بــر ســر آیـد　　ز شادی برجهد کاین استخوانــی است
وگر نـعشی دو کس بـر دوش گـیرند　　لئیم الطّبع پندارد کـه خـوانـی است

امّا صاحبِ دنیا به عینِ عنایتِ حق ملحوظ است و به حلال از حـرام مـحفوظ. مـن همانا که خود تقریرِ این سخن نکردم و برهان و بیان نیاوردم، انصاف از تو تـوقّع دارم؛ هرگز دیدی دستِ دغایی بر کتف بسته یـا بـی‌نوایـی بـه زنـدان در نشسـته یـا پـرده‌ی معصومی دریده یا کفی از مِعْصَم بریده الّا به علّتِ درویشـی؟ شـیرمردان را بـه حکـمِ ضرورت در نقب‌ها گرفته‌اند و کَعْب‌ها سُفته و محتمل است این که یکی را از درویشان نفسِ امّاره مرادی طلب کند، چون قوّتِ احصانش نباشد به عصیان مبتلی گردد که بطن و فرج توأمند یعنی دو فرزندِ یک شکمند، مادام که این یکی بر جای است آن دگر بر پـا است. شنیده‌ام که درویشی را با حَدَثی بر خبثی بدیدند. با آن که شرمساری بُـرد، بـیمِ سنگساری بود. گفت: ای مسلمانان قوّت ندارم که زن کنم و طاقت نه که صبر کنم؛ چه کنم؟ لاٰ رُهْبانِيَّةَ فِي اَلْاِسْلامِ. و از جمله‌ی مواجبِ سکون و جمعیّتِ درون که توانگر را میّسر می‌شود یکی آن که هر شب صنمی در بر گیرد که هر روز بدو جوانی از سر گیرد، صبحِ تابان را دست صَباحتِ او بر دل و سروِ خرامان را پای از خجالتِ او در گِل.

به خونِ عـزیزان فـروبرده چـنگ　　سرانگشت‌هـا کـرده عـنّاب رنگ

محال است که با حسنِ طلعتِ او گردِ مناهی گردد یا رایِ تباهی زند.

دلی که حورِ بهشتی ربود و یـغما کـرد　　کـی التـفات کـند بـر بُـتانِ یـغمایی؟

***

(شیعر):

مَـــنْ كـــانَ بَـــيْنَ يَــــدَيْهِ مَـــااشْـــتَهیٰ رُطَبٌ
يُـــــــغْنِيهِ ذٰلِك مِـــــــنْ رَجْـــــمِ الْـــعَناقِدِ

لە بەینی دوودەسی خۆی بێ، کەسێ مەیلی لە خورمایە
چ پێویستی بهاوێ بەرد لە بۆ هێشوو لە سەردایە

زۆرتر دەست بەتاڵان داوێنی پاکیان لە گوناهەوە ئەئاڵێنن و برسی‌یان نان ئەرفێنن.

(شیعر):

گەر گۆشتی دەس‌کەوێ سەگی برسی چ باکی‌یە
هی حوشتری جەنابی ساڵحە، یا هی کەری دەجاڵ

چەند پارێزگاران بە هۆی هەژاییەوە کەوتوونەتە عەینی فەسادەوە و نامووسی بەرزیان بە بای ناوی ناشیرینەوە بەرباد بووە. (تاك):

هێزی پارێزگاری نامێنێ لەگەڵ برسی‌یەتی‌یا
ڕەشحەیی تەقوا نەبوونی زوو لە دەستی دەرئەدا

ئەوەی وتت کە دەرگا لە ڕووی هەژاران ئەبەستن، حاتەمی تەی کە بیابان نشین بوو ئەگەر لە شارێکا بوایە لە جۆشی گەدایان بێچارە ئەبوو و کراسیان لەبەرا پارچە پارچە ئەکرد وەکوو لە (طيبات)دا هاتووە. (تاك):

تەماشام مەکە با کەسانی‌تر نەکەن تەماشا
لەدەس گەدایان کەسێ ناتوانی خێرێ کات حاشا

وتی: ئەی من بەزەییم بەوانا نایەتەوە؟ وتم: نەء، داخ بۆ ماڵی ئەوانە ئەخۆیت.

ئێمە واین بەم جۆرە لە ناو وتارو هەردو بە یەکتر دوچار. هەر پیادەیەك ئەو لێی بخورێ کۆشش ئەکەم بۆ بەر هەڵستی، و هەر شایەك بانگ ئەکا بە سوارێ دای‌ئەپۆشم[1]. هەتا نەقدی کیسەی هیممەتی هەموو خەرج کردو تیری جەعبەی دەلیلی هەموو هاویشت.

(١) لێرەدا مەبەست لە پیادەو شاو سوارەی ناو یاری شەترەنجە.

مَنْ كَانَ بَيْنَ يَدَيْهِ مَا اشْتَهىٰ رُطَبٌ　　يُغْنِيهِ ذٰلِكَ عَنْ رَجْمِ الْعَناقِيدِ

اغلبِ تهی‌دستان دامنِ عصمت به معصیت آلایند و گرسنگان نان ربایند.

چون سگِ درّنده گوشت یافت، نپرسد　　کاین شترِ صالح است یا خرِ دجّال

چه مایه مستوران به علّتِ درویشی در عینِ فساد افتاده‌اند و عِرضِ گرامی به بادِ زشت‌نامی برداده.

با گرسنگی قوّتِ پرهیز نماند　　اِفلاس عنان از کفِ تقوا بستاند

و آن چه گفتی در به روی مسکینان ببندند حاتمِ طایی که بیابان‌نشین بود اگر شهری بودی از جوشِ گدایان بی‌چاره شدی و جامه بر او پاره کردندی چنان که در طیّبات آمده است:

در من منگر تا دگران چشم ندارند　　کز دستِ گدایان نتوان کرد ثوابی

گفتا: نه، که من بر حالِ ایشان رحمت می‌برم. گفتم: نه، که بر مالِ ایشان حسرت می‌خوری. ما در این گفتار و هردو به هم گرفتار؛ هر بیدقی که براندی به دفعِ آن بکوشیدمی و هر شاهی که بخواندی به فرزین بپوشیدمی تا نقدِ کیسه‌ی همّت درباخت و تیرِ جعبه‌ی حجّت همه بینداخت.

| | |
|---|---|
| لە عـاست هـێرش ئـەو دەم هـەراشـە | ئاگات لە خۆت بێ قەڵغان تـوورِ نـەدەی |
| جگـــە لە فـیشال، لە هـووشەو هـاشە | چـیکە شك‌نـابا، هـیچ گـومان نـەبەی |
| ئـــەم قســـەزانـــی قســـە رێ خـەرە | ئـــەم دزی عـــیلمو فـــامو زانســـتە |
| وەســـتاوە دەســـتی لەســـەر خـەنجەرە | دەرگایش بێ‌سەبەب قوفڵو دەربـەستە[1] |

هەتا دواکات دەلیلی نەما زەلیلم کرد، دەستی ستەمی درێژکردو بێ‌سوود وتنی دەس پێ‌کرد لەگەڵ ڕەوشتی نەفامانە کە بۆ بەرابەری لە دەلیـل دامـان زنجیری دوژمـنایەتی ئەجوڵێنن وەکوو ئازەری بوت تاش کە لەگەڵ کوڕیا بە دەلیل نەیتوانی بەشەڕ بۆی هەڵسا. وتی: ﴿لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ﴾. واتە: ئەگەر نەی بڕیتەوە بەرد بارانت ئەکەم. جا جنێوی پێ‌دام ناشیرینم وت. یەخەی گرتم، چەناکەیم گرت.

| | |
|---|---|
| ئەو لەمن من لەو کەوتینە یـەکـتر | وا پـێ‌ئـەکـنن لە دوامـان پـیاوان |
| لە وتەی ئێمە پەنجەی سەرسامی | هەموو بـە جـارێ نـایانە نـاو دان |

بەکورتی دادی ئەم وتارەمان بردە لای قازیو بـە داد ڕازی بـووین، هـەتا دادگـەری موسوڵمانان کارچاکێکی بوێت، و لە نێوانی دەوڵەمەندانو هەژارانا جیاوازییەك بڵێ. قازی کە حاڵی ئێمەی دیو وتاری ئێمەی بیست سەری بردە یەخەی بیرکردنەوە و لە پـاش تێ‌ورد بـوونەوەیەکـی زۆر سـەری دەرهـانیو وتـی: ئـەی ئـەو کـەسەی کـە سـتایشی دەوڵەمەندانت وتو جەفاو خراپەی هەژارانت ڕەوا دی، بزانە لە هەرجێ‌یەك گوڵێ هـەیە دڕکە، شەراب مەستی هەیەو گەنج مار، دوڕڕی شاهوار[2] نەهەنگی پیاو خۆری لەگەڵە وە خۆشی ژیانی جیهانی پێوەدانی ئاکامی لە دوایە. نیعمەتو خۆشیی بەهەشت دیواری ئازارو ناڕەحەتی دەوری گرتووە.

---

(١) ئەم بەیتانە بەم جۆرەیش کراون بەکوردی:

| | |
|---|---|
| ها فڕێ نەدەی سوپەر بۆ فەسیح | موبالەغەیە خوازراو مـوستەعار |
| مــەعریفەت دزە قـافیەو وتـار | چەك لەبەر قاپیو بەتاڵە حەسار |

(٢) شاهوار: «Šahvar» بە زمانی پەهلەوی: هەر شتێکی چاکو بە بایەخ، بە جۆرێ کە شیاوی شا بێت، دوڕڕی شاهوار دوڕڕی شایانەو پەسەند کراوی شا. «ك».

**هان تا سپر نیفگنی از حمله‌ی فصیح**
**کو را جز این مبالغه‌ی مستعار نیست**
**دین ورز و معرفت که سخن‌دانِ سجع‌گوی**
**بر در سلاح دارد و کس در حصار نیست**

تا عاقبةالامر دلیلش نماند و ذلیلش کردم. دستِ تعدّی دراز کرد و بیهوده گفتن آغاز؛ و سنّتِ جاهلان است که چون به دلیل از خصم فرومانند سلسله‌ی خصومت بجنبانند، چون آزرِ بت‌تراش که به حجّت با پسر برنیامد به جنگ برخاست که: **لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ**. دشنامم داد سَقَطش گفتم، گریبانم درید زنخدانش گرفتم.

**او در من و من در او فتاده — خلق از پیِ ما دوان و خندان**
**انگشتِ تعجّبِ جهانی — از گفت و شنیدِ ما به دندان**

القصّه مرافعه‌ی این سخن پیشِ قاضی بردیم و به حکومتِ عدل راضی شدیم تا حاکمِ مسلمانان مصلحتی بجوید و میانِ توانگران و درویشان فرقی بگوید. قاضی چو حیلتِ ما بدید و منطقِ ما بشنید، سر به جیبِ تفکّر فرو برد و پس از تأمّلِ بسیار سر برآورد و گفت: ای که توانگران را ثنا گفتی و بر درویشان جفا روا داشتی بدان که هرجا که گُل است خارست و با خمر خمارست و بر سرِ گنج مارست و آن جا که دُرِّ شاهوارست نهنگِ مردم‌خوارست؛ لذّتِ عیشِ دنیا را لَدْغه‌ی اجل در پس است و نعیمِ بهشت را دیوارِ مکاره در پیش.

جەوری دوژمن گەر نەکێشێ چی بکا دڵخواهی دۆست

گەنجو مارو دڕكو گوڵ، خەم شادمانی پێکەوەن

تەماشا ناکەیت لە باغا داری بۆن خۆش‌و داری وشکی تیایە. دەوڵەمەندان سوپاس‌گوزارو نیعمەت ناشناسی‌یان هەیە؛ وە لە ڕیزی دەروێشانیشا بە تەواناو کوڕوزاوەی تیایە. (شیعر):

دڵۆپی ژاڵە بوایە بە دوڕ    وەك مووررووی کەران بازار ئەبوو پڕ

نزیکانی حەزرەتی باریی بەرزو بڵند، دەوڵەمەندانی دەروێش ڕەوشت‌و دەروێشانی دەوڵەمەند هیممەتن. چاکی دەوڵەمەندان ئەوانەن خەمی هەژاران ئەخۆن، وە چاکی دەروێشان ئەوانەن دەوڵەمەندانیان لا کەمە ﴿وَ مَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللّٰهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾ واتە: (کەسێ پشت بە خوا ببەستێ ئەوی بەسە).

لە پاشان ڕووی سەرزەنشتی کردە دەروێش: ئەی کەسێ کە وتووتە دەوڵەمەندان خەریکی مەستی‌و بێ‌دینی‌و خراپین، دەستەیەك دەوڵەمەندان هەن لەسەرئەم شێوەی تۆ بەیانت کرد کە هیممەت کورت‌و نیعمەت ناشناسن، وەرئەگرن دای‌ئەنێن‌و نایخۆن و بە کەسی نادەن بەمەسەل: ئەگەر باران نەبارێ یا تۆفان جیهان هەڵگرێت بە پشتیوانیی دەس‌ڕۆیشتنی خۆی لە سەغڵەتی هەژاران ناپرسێت‌و لە خوای گەروە ناترسێت. (هۆنراوە):

گەر لە نەبوونی عالەم بێ هیلاك    بەلەمم هەیە لە تۆفان چ باك

* * *

وَ رَاكِبَاتُ نِيَاقٍ فِى هَوَادِجِهَا    لَمْ يَلْتَفِتْنَ اِلىٰ مَنْ غاصَ فى الكُثُبِ

ژنانی حوشتر سواری کەژاوە    چ باکی کەسێ لە لم چەقاوە

* * *

دوونان گلێمی خۆیان بردە دەر    ئەڵێن چ غەممان ئەگەر عالەم مرد

**جورِ دشمن چه کند گر نکشد طالبِ دوست؟**
**گنج و مار و گُل و خار و غم و شادی به همند**

نظر نکنی در بُستان که بیدمشک است و چوبِ خشک؟ هم‌چنین در زمره‌ی توانگرانْ شاکرند و کفور و در حلقه‌ی درویشانْ صابرند و ضَجور.

**اگر ژاله هر قطره‌ای دُر شدی　　　چو خرمهره بازار از او پُر شدی**

مقرّبانِ حضرتِ حق، جَلَّ وَ عَلا، توانگرانند درویش سیرت و درویشانند توانگر همّت و مهین توانگران آن است که غمِ درویش خورَد و بهین درویشان آن است که کمِ توانگر گیرد، **وَ مَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللّٰهِ فَهُوَ حَسْبُهُ**. پس روی عتاب از من به جانبِ درویش کرد و گفت: ای که گفتی توانگران مُشتغلند و ساهی و مستِ مَلاهی، نَعَمْ، طایفه‌ای هستند بر این صفت که بیان کردی: قاصر همّت، کافر نعمت که ببرند و بنهند و نخورند و ندهند و اگر به مَثَل باران نبارد یا طوفان جهان بردارد، به اعتمادِ مُکنتِ خویش از محنتِ درویش نپرسند و از خدای، عَزَّ وَ جَلَّ، نترسند و گویند:

**گر از نیستی دیگری شد هلاک　　　مرا هست، بط را ز طوفان چه باک؟**

***

**وَ رَاكِباتُ نِياقاً فِي هَوادِجِها　　　لَمْ يَلْتَفِتْنَ إِلىٰ مَنْ غاصَ فِي ٱلْكُثُبِ**

***

**دونان چو گلیمِ خویش بیرون بردند　　　گویند: چه غم گر همه عالَم مُردند**

تیرەیەك ئەوانەن کەبیستت، وە تیرەیەکی‌تر خوانی نیعمەتیان داناوەو دەستی بەخششیان کردووەتەوە، هواخواهی ناوو لێ‌خۆش بوونن، خاوەنی دنیاو ئاخیرەتن وەکو کۆیلەکانی حەزرەتی پاشای عالەم، دادگەری بەهێز کراوی زاڵ کراو، خاوەنی جڵەوی خەڵکی، ئاگاداری کەلێنی ئیسلام، واریسی موڵکی سولەیمان، دادگەر ترینی پادشایانی زەمان، خاوەنی زەفەری دنیاو دین، ئەتابوك ئەبووبەکری کوڕی سەعدی زەنگی، خوا ڕۆژانی پایەدارتر کات‌و یاریدەی بەیداغی بدات. (پارچە):

هەرگیز چ باوکێ بە کوڕی وا نەکرد کەرەم

وەك دەستی جوودی تۆ کە بە ئەولادی ئادەمی کرد

ویستی خوا کە ببەخشێ بە عالەمێ نیعمەت

بۆیە بە ڕەحمەتی خۆی تۆی بە پادشاهی عالەم کرد

قازی کە وتاری بەم ئەندازەیە گەیاندو لە سنووری گومانی ئێمە ئەسپی موبالەغەی کردەدەر بەفەرمانی دادی قازی ڕازی بووین‌و وازمان لە ڕابردوو هێناو لە دوای سزادانی یەك ڕێگەی دڵ نەواییمان گرت بۆ دروست کردنەوەی دۆستی سەرمان لەبەر پێی یەکتری داناوە و سەرو ڕووی یەکمان ماچ کردو دواییمان بەم دوو شیعرە هێنا: (پارچە).

مەکە لە گەردشی گیتی شکات ئەی دەروێش

بەخت ڕەشیتە بڵێن بەو ڕەوشتەوە وا مرد

بە دەوڵەمەند بڵێ بۆ کامەرانی تۆ هەتە دەس‌و دڵ

بخۆو ببەخشە جیهان‌و قیامەتت پێ‌برد

قومی بر این نمط که شنیدی و طایفه‌ای خوانِ نعم نهاده و دستِ کرم گشاده، طالبِ نامند و مغفرت و صاحبِ دنیا و آخرت، چون بندگانِ حضرتِ پادشاهِ عالمِ عادل، مؤیَّد، مظفَّر، منصور، مالکِ ازمّه‌ی اَنام، حامیِ ثُغورِ اسلام، وارثِ مُلکِ سلیمان، اعدلِ ملوکِ زمان، مظفَّرالدّنیا و الدّین اتابک ابوبکر بن سعد بن زنگی، اَدامَ اَللّٰهُ اَیّامَهُ وَ نَصَرَ اَعْلامَهُ.

پدر به‌جای پسر هرگز این کرم نکند   که دستِ جودِ تو با خاندانِ آدم کرد
خدای خواست که بر عالَمی ببخشاید   تو را به رحمتِ خود پادشاهِ عالم کرد

قاضی چون سخن بدین غایت رسانید و از حدِّ قیاسِ ما اسبِ مبالغه درگذرانید به مقتضای حکمِ قضا رضا دادیم و از مَا مضیٰ درگذشتیم و بعد از مجارا طریقِ مدارا گرفتیم و سر به تدارک بر قدمِ یکدیگر نهادیم و بوسه بر سر و روی هم دادیم و ختمِ سخن بر این بود:

مکن ز گردشِ گیتی شکایت ای درویش
که تیره‌بختی اگر هم بر این نسق مُردی
توانگرا، چو دل و دستِ کامرانت هست
بخور، ببخش که دنیا و آخرت بردی

## بەندی هەشتەم:

# لە دەستوورو شێوەی هاوڕێیەتی

ماڵ بۆ ئاسایشی ژیانە نەك ژیان بۆ گرد کردنەوەی ماڵ. لە پیاوێکی عاقڵیان پرسی: چاك بەخت کێیەو بەد بەخت کێیە؟ وتی: عاقڵ کەسێکە خواردیو چاندی، وە بەد بەخت کەسێکە مردو بەجێی هێشت. (شیعر):[1]

مەکە تۆ نوێژ لەسەر پیاوێ لە ژین چی چاکە بوو نەی کرد

لە ماڵ کۆکردنا عومری بەسەر چوو، لێی نەخواردو مرد

* * *

مووسا -سەلامی خوای لەسەربێ- ئامۆژگاری قارونی ئەکرد کە ﴿اَحْسِنْ كَمَا اَحْسَنَ اللّٰهُ اِلَيْكَ﴾ واتە: چاکە بکە وەك خوا چاکەی لەگەڵ تۆ کردووە. نەیبیست دوارۆژیت بیست. (پارچە):

هەرکەس کە بە دینارو درەم فێرنەبوو خێری

دوا ڕۆژ سەری خەرج لە دینارو درەم کرد

---

(١) لە (ئەسرینی ئاڵ) داکە تەرجەمەی بابی هەشتەمی گوڵستانەو بە شێوەی نەزم نووسراوە، لەم شوێنەدا ئەڵێ:

بە مەتەڵ ئەڵێن: ماڵی خۆنەخۆر دوایی ئەبێتە، کەیفی چەکمە بۆر،-«ك».

## باب هشتم:

# در آدابِ صحبت

مال از بهرِ آسایشِ عمرست نه عمر از بهرِ گرد کردنِ مال. عاقلی را پرسیدند: نیک‌بخت کیست؟ و بدبخت چیست؟ گفت: نیک‌بخت آن که خورد و کِشت و بدبخت آن که مُرد و هِشت.

**مکن نماز بر آن هیچ‌کس که هیچ نکرد     که عمر در سرِ تحصیلِ مال کرد و نخورد**

***

موسی علیه‌السّلام قارون را نصیحت کرد که **أَحْسِنْ كَما أَحْسَنَ ٱللّٰهُ إِلَيْكَ**؛ نشنید و عاقبتش شنیدی.

**آن کس که به دینار و درم خیر نیندوخت**

**سر عاقبت اندر سرِ دینار و درم کرد**

خواهیشتە بەری خۆشیی دوو دنیا، دە ببەخشە

بەم خەڵکە، بزانە کە خوا چۆنی کەرەم کرد

عەرەب ئەڵێ (**جُدْ وَ لا تَمْنُنْ لِاَنَّ الْفائِدةَ عائدةٌ اِلَيْك**). واتە: ببەخشەو شانازی مەکە، چونکە کەڵکەکەی بۆ خۆت ئەگەرێتەوە.[1] (پارچە):

| | |
|---|---|
| درەختی بەخشش کە دایکوتا ڕەگ | لقـی بـەرزتر ئـەبێ لە فـەلەك |
| گەر هیواداری تۆ لێی بخۆی بەر | لە مـنەت مـەنێ مشـاری لەسـەر |

(پارچە):

سوپاسێ کە لەبۆ یەزدان، کەوا تۆی خستە سەر ئیحسان

لەفـەزڵو نـیعمەتی ئـەو بـوو بـەتاڵی دانەنایت قوربان

مەکە شانازی تۆ خزمەت ئـەکـەی بـۆ حـەزرەتی سوڵتان

بـناسە نـیعمەتی ئـەو تـۆی کـە بـردە خـزمەتی وەستان

* * *

(پەند) دوو کەس ڕەنجی بێسوود ئەدەنو کۆششی بێکەڵك ئەکەن، یەکێ ئەوەی پێکەوەیناو نەی خوارد، ئەویتر ئەوەی فێربوو کردەوەی پێنەکرد. (مەسنەوی):

| | |
|---|---|
| هـەتاکـوو زۆرتـر دانش بـزانـی | ئیشی پێنەکەی هەروا نادانی |
| نە پەی بۆ هیچ برد، نە دانشـمەندە | چوارپێ کتێبی لێنێیت هەرچەندە |
| جا ئەو بێمەغزە چوزانێ خـەبەر | داری لێنـراوە وەیـاخۆ دەفـتەر |

* * *

(پەند) زانیاریو دانش بۆ پەروەردەی ئایینە، نەوەك بۆ خواردنی جیهان.

کـەسێ فـرۆشتی دانشو پـارێزو زوهـد　　خەرمەنی کۆکـردەوەو سـووتا هـەمووی

* * *

(پەند) ئەو زانایەی ناپەرهێزگارە، کوێرێکی مەشخەڵدارە (**يُهْدَىٰ بِـهِ وَ لا يَـهْتَدِي**) ڕێگەی پێدەرئەکرێت، بەڵام خۆی ڕێکە دەر ناکات .(هۆنراوە):

---

(١) کاتێ کە بـەخشیت هـیچی لێ مـەڵێ　　نەکا خێرەکـەی لە دەسـتت هـەڵێ،ـ«ك».

**خواهی که ممتّع شوی از دنیی و عقبی**
**با خلق کرم کن چو خدا با تو کرم کرد**

عرب گوید: **جُدْ وَ لَا تَمْنُنْ لِاَنَّ اَلْفائِدَةَ إِلَيكَ عائِدَةٌ**، یعنی ببخش و منّت منه که نفعِ آن به تو بازگردد.

**درختِ کرم هر کجا بیخ کرد — گذشت از فلک شاخ و بالای او**
**گر امّیدواری کز او بر خوری — به منّت منه ارّه بر پای او**

***

**شکرِ خدای کن که موفّق شدی به خیر — ز انعام و فضلِ او نه معطّل گذاشتت**
**منّت منه که خدمتِ سلطان همی کنی — منّت شناس از او که به خدمت بداشتت**

***

دو کس رنجِ بیهوده بردند و سعی بی‌فایده کردند: یکی آن که اندوخت و نخورد، و دیگر آن که آموخت و نکرد.

**علم چندان که بیشتر خوانی — چون عمل در تو نیست نادانی**
**نه محقّق بوَد، نه دانشمند — چارپایی بر او کتابی چند**
**آن تهی مغز را چه علم و خبر — که بر او هیزم است یا دفتر**

***

علم از بهرِ دین پروردن است نه از بهرِ دنیا خوردن.

**هرکه پرهیز و زهد و علم فروخت — خرمنی گرد کرد و پاک بسوخت**

***

عالمِ ناپرهیزگار کورِ مشعله‌دارست، **يُهدىٰ بِهِ وَ هُوَ لاَ يَهْتَدي**.

بێسوودە کەسێ تـەمەڵی دەوران　　　زەرکاری فێر بوو هیچی نـەکـڕی

* * *

(پەند) پادشا لە عاقڵان جەماڵ وەرئەگرێت‌و لە پارێزگاران ئایین‌و کـەماڵ. پـادشایان ئامۆژگاری عاقڵانیان پێویست‌ترە لە تێکەڵی پادشایان بۆ عاقڵان. (پارچە):

گەر هەیە پەندێ ببیسی ئەی پادشا　　　لە هــەموو نـامە لێی چـاتر نـییە

کـار بــە عـاقڵان نـەبێ مـەسپێرە　　　بـەڵام عـاقڵان کـاریان بـۆچـییە

* * *

(پەند) سێ شت پایەدار نامێنێ: ماڵ بێبازرگانی، زانیاری بێ‌گفتوگۆو لێکـۆڵـینەوە، موڵك بێ‌سیاسەت.

* * *

کــاتێ بــە لوتـف‌و نـەرمیی وتـارو بـە پـیاوەتی

دێنــــیتە ژێر کـــەمەندی قـــوبوولت یـــەکـــێ

جارێ بە قین سەیرکە کـە سـەد گـۆزەی پـڕ نـەبات

جـێ‌نـاگـرێ لە بـۆت وەکـوو دەنکـە گـوژاڵکـێ

* * *

(پەند) بەزەیی هاتنەوە بە خراپانا ستەمکارییە بەسەر چاکانا. چاوپۆشی لە ستەمکاران ستەمکارییە بۆ هە ژاران. (تاك):

ئەگەر پیسێ بکەی پەردوەردە بیلاوێنی وەك چاکان

بە مـاڵ‌و دەوڵەتـی تـووە ئـەکـا تـاوانـی بـێ‌پـایان[1]

* * *

(پەند) پشت بە دۆستی پادشایان‌و دەنگ خۆشی منالان نابەسرێت، ئەو بە خـەیاڵی ئەگۆڕێت‌و ئەم بە خەوێك. (شیعر):

---

(١) (نوسخە):

ڕەحمەت بە پڵنگ کە تیژە دانی　　　ستەمە بۆ مەڕ ئـەگـەر بـیزایـنی

بی‌فایده هرکه عمر درباخت　　　　چیزی نخرید و زر بینداخت

***

مُلک از خردمندان جمال گیرد و دین از پرهیزگاران کمال یابد. پادشاهان به نصیحتِ خردمندان ازان محتاج‌ترند که خردمندان به قربتِ پادشاهان.

پندی اگر بشنوی، ای پادشاه　　　　در همه عالَم به از این پند نیست

جز به خردمند مفرما عمل　　　　گر چه عمل کارِ خردمند نیست

***

سه چیز پایدار نمانَد: مال بی‌تجارت و علم بی‌بحث و مُلک بی‌سیاست.

***

وقتی به لطف گوی و مدارا و مردمی

باشد که در کمندِ قبول آوری دلی

وقتی به قهر گوی که صد کوزه‌ی نبات

گه گه چنان به کار نیاید که حنظلی

***

رحم آوردن بر بدان ستم است بر نیکان و عفو کردن از ظالمان جورست بر درویشان.

خبیث را چو تعهّد کنی و بنوازی　　　　به دولتِ تو گنه می‌کند به انبازی

***

بر دوستیِ پادشاهان اعتماد نتوان کردن و بر آوازِ خوشِ کودکان که آن به خیالی مبدّل شود و این به خوابی متغیّر گردد.

دڵ بـــە دڵدارێ مــەدە بـیبێ هــەزار یــاری‌تر

گەر دڵت دایە لە ئەووەڵ ڕۆژەوە بۆ جیایی‌یە[١]

* * *

(پەند) ئەو نهێنی‌یەی هەتە لای دۆست مەیهێنەرە ناو، هەرچەند دۆستێکی ڕاستیش بێ چونکە ئەویش دۆستانی هەیەو هەروەها بە زەنجیرە. (پارچە):

بـێ‌دەنگ لە ڕازی دڵت چـاکـترە بیڵێیت بە کەسی‌و بڵێی مەیکەباس

ئەی ساغ ببستە ئـاو لەسـەر چـاوە جۆگەکە پڕ بوو نابەسرێت کەساس

(تاك):

* * *

نـاشێ بـۆ وتـن وتـار بـە پـەنهان کە نەشێ بکرێ بۆکۆمەڵ بەیان[٢]

(پەند) دوژمنی لاواز دێتە ژێر فەرمانەوەو دۆستی ئەنوێنێ. مەبەستی هەر ئەوەیە هەتا ئەبێ بە دوژمنێکـی بـەهێز [وتـوویانە:] بـەدۆستیی دۆسـتان پشت نـابەسترێ هـەتا بـە دەڵەچەیی[٣] دوژمنان دڵنیایی بێ. هەر کەسە دوژمنی بچووکی لا سووك بێ وەکوو ئەوە وایە واز لە ئاگری کەم بێنێ. (پارچە):

ئیمڕۆ ئەتوانی کپی کـەی ئـاگـر کە ئەسووتێنێ بـەرزبێ جـیهان

ئەتوانی دوژمن بە تیر بـدوریت موڵەتی مـەدە ژێ خـاتە کـەوان

* * *

(١) لە نووسخە فارسییەکەی بەردەستی ئێمە دا، دوای ئەم شیعرە، پەندێکی‌تر هـەیە کـە بـەم جۆرە وەرگێڕایەوە: «هەر نهێنییەك کە هەتە، لای دۆست مەیڵێ نەوەك بێ بە دوژمـن و هـەر خراپەیەک کە لە دەستت دێ لەگەڵ دوژمنا مەیکە، شایەت بێ بە دۆست» ـ ع.

(٢) نووسخە:

تۆ نیهانی خۆت لەلای یارت مەڵێ بیزانە چـاك

یارەکەت یاری هەیەو ئەو یارە یـارێکـی هـەیە

وە لە نووسخەیەکدا: هیچ کەس بۆ ڕازی خۆت لە خۆت دڵسۆزتر نییە:

گیانێ گەیی‌یەسەر دوو لێوی جا وتی باوکی بە هۆش

پەندی من ببیسی بە دوو گوێ چاکە ئەی یاری عەزیز

دامــەدە ڕازت لە بـۆ یـاری عــەزیزت گـیانە کـەم

چـونکە ئـەو یـارەت هـەیەتی یـارو دڵداری عـەزیز

(٣) دڵەچەیی: نزمی‌و سووکی، وە مێچکە مێچکە کردن بۆ ئەم‌و ئەو. «ك».

معشوقِ هزاردوست را دل ندهی ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ ور می‌دهی آن دل به جدایی بنهی

***

هرآن سرّی که داری با دوست در میان منه چه دانی که وقتی دشمن گردد و هر بدی که توانی به دشمن مرسان که باشد که وقتی دوست گردد.

رازی که پنهان خواهی با کس در میان منه وگر چه دوستِ مخلص باشد که مرآن دوست را نیز دوستانِ مخلص باشند هم‌چنین مسلسل.

خامشی به که ضمیرِ دلِ خویش ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ با کسی گفتن و گفتن که مگوی

ای سلیم، آب ز سرچشمه ببند ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ که چو پُر شد نتوان بستن جوی

***

سخنی در نهان نباید گفت ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ که برِ انجمن نشاید گفت

***

دشمنی ضعیف که در طاعت آید و دوستی نماید مقصودِ وی جز این نیست که دشمنی قوی گردد و گفته‌اند که: بر دوستیِ دوستان اعتماد نیست تا به تملّقِ دشمنان چه رسد؛ و هرکه دشمنِ کوچک را حقیر می‌شمارد بدان ماند که آتشِ اندک را مُهمَل می‌گذارد.

امروز بکُش، چو می‌توان کُشت ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ کآتش چو بلند شد، جهان سوخت

مگذار که زه کند کمان را ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌ دشمن که به تیر می‌توان دوخت

***

(پەند) لە نێوانی دوو دوژمنا وا بدوێ کە ئەگەر بوون بە دۆست شەرمەسار نەبیت.

لە بەینی دوو کەس شەڕ وەك ئاگرە — وتە چنی بەدبەخت داریان بۆ دێنێ
ڕەنگە ئەم دوانە دڵخۆش‌بن بە یەك — لەو ناوە بەدبەخت ڕوو زەرد ئەمێنێ
لە بەینی دوو کەس ئاگر هەڵگیرسان — سزای تەنها بۆ فووکەر ئەنوێنێ

(پارچە):

لەگەڵ دۆستانا بە هێواش بدوێ — تا گوێی لێ‌نەبێ دوژمنی خوێن خوار
لەلای دیوارا ئاگای دەمت بێ — نەوەك گوێ بێ لەو دیوی دیوار[1]

* * *

(پەند) کە لە جێ‌بەجێ کردنی ئیشێکا دوو دڵ کەوتی ئەوەیان بکە کە بەبێ ئازارت پێك‌دی (تاك):

لەگەڵیا تۆ گران مەدوێ کەسێ ئەدوێ کەوا ئاسان

لە قاپیی ڕێکی‌دا هەر کەس بە شەڕ تۆ بۆی مەچۆ مەیدان

* * *

(پەند) ئیشێ هەتا بە پارە پێك بێت ناشێ گیانی بۆ بخەیتە ترسەوە. عەرەب ئەڵێ (آخرُ الحِيَلِ السَّيفُ) واتە: شیر لە پاش هەموو فێڵێکەوەیە.

کە دەست بەر بوو لە هەموو فێڵێ — ئەوسا دروستە دەست‌بەری بۆ شیر

* * *

(پەند) بەزەییت بەبێ دەسەڵاتیی دوژمنا نەیەتەوە، چونکە ئەگەر دەسەڵاتی بوو نات‌بەخشێت.

تۆ لێ‌مەدە لافی هێز دیت دوژمنی خۆت لاواز

پیاوێکە لە هەر بەرگێ، موخێکە لە هەر ئێسقان

* * *

---

(١) لە نووسخەکەی بەردەستی ئێمەدا دوای ئەم پارچە، پەندێك هەیە کە وەرگێڕاوەکەی ئەمەیە:

ئەوەی ئاشتی کرد لەگەڵ دوژمنا — ویستیە ئازاری دۆستەکان بدا
عاقڵ! دەس بشۆ لەو جۆرە دۆستە — کە هاونیشینی دوژمنت ئەکا.ع.

سخن در میانِ دو دشمن چنان گوی که اگر دوست گردند شرم‌زده نباشی.

میانِ دو کس جنگ چو آتش است　　سخن‌چینِ بدبخت هیزم‌کش است
کنند این و آن خوش دگرباره دل　　وی اندر میان کوربخت و خجل
میانِ دو تن آتش افروختن　　نه عقل است و خود در میان سوختن

***

در سخن با دوستان آهسته باش　　تا ندارد دشمنِ خون‌خوار گوش
پیشِ دیوار آن‌چه گویی هوش‌دار　　تا نباشد در پسِ دیوار گوش

***

هرکه با دشمنان صلح می‌کند، سرِ آزارِ دوستان دارد.

بشوی، ای خردمند، ازان دوست دست
که با دشمنانت بوَد هم‌نشست

***

چون در امضای کاری متردّد باشی، آن طرف اختیار کن که بی‌آزارتر برآید.

با مردمِ سهل‌خوی دشوار مگوی　　با آن که درِ صلح زند جنگ مجوی

تا کار به زر برمی‌آید، جان در خطر افگندن نشاید؛ عرب گوید: آخِرُ ٱلْحِیَلِ اَلسَّیْفُ.

چو دست از همه حیلتی درگسست　　حلال است بردن به شمشیر دست

***

بر عجزِ دشمن رحمت مکن که اگر قادر شود بر تو نبخشاید.

دشمن چو بینی ناتوان، لاف از بروتِ خود مزن
مغزی است در هر استخوان، مردی است در هر پیرهن

***

(پەند) هەرکەسێ بەدێ بکوژێ عالەمێ لە بەڵای ئەو ڕزگار ئەکاو ئەویش لە سزای خوای.

| | |
|---|---|
| پەسەند بینراوە بەخشایش لەلام | مەیدە بە مەردوم ئازاری مەڵحەم |
| نازانی ئەوەی ڕەحم ئەکا بە مار | ستەمە ئەیکا بە نەوەی ئادەم |

* * *

(پەند) ئامۆژگاری وەرگرتن لە دوژمن، خەتایە. بەڵام بیستنی ڕەوایە. کە بە پێچەوانەی ئەوە جۆڵایتەوە پێکاوتە. (مەسنەوی):

| | |
|---|---|
| پارێزکە! دوژمن چی ئەڵێت نەیکەی | بە دوو دەست ئەدەی لە ئەژنۆی زیان |
| تۆ لێی لابدەو ڕوو بکە دەستە چەپ | گەر وەك تیری ڕاست ڕێت بدا نیشان |

(پەند) قین لە سنوور دەرچوو سڵی لێ ئەکرێت، نەرمیی بێ کاتو بێ جێ سامی پیاو ناهێڵێت. نە ئەوەندە درشتی بکە کە لێت تێر ببن، نە ئەوەندە نەرمی بنوێنە کە بە سەرتا دلێر ببن. (چەند شیعرێ):

| | |
|---|---|
| درشتیو نەرمی چاکن جووت با هەم | خوێنگر دائەنێ برینو مەڵحەم |
| نایکا بە پیشە عاقڵ درشتی | هەروەك قەدری خۆی نابا بە دەستی[1] |
| لێ نادا لافی گەورەو ئاغایی | وەك لەشی نادا بە بێنەوایی |

* * *

(هۆنراوە):

گەنجێ بە باوکی وت: ئەی خیرەدمەند

ئادەی پیرانە تۆ بمدەرێ پەند

وتی: پیاو چاك بە نەك ئەوەند ئەی گیان

زاڵ بێ بەسەرتا گورگی تیژ ددان

* * *

(١) بە زبریو نەرمی، کار ئەبێ مەیسەر نە تاڵ چون کەکرە، نە شیرین وەك قەن حەکیم خاوەنی مەڵهەمەو نەشتەر نەك ساف وەك حەریر، نە تیژ وەك بڕوەن. «ئەسرینی ئاڵ»

هرکه بدی را بکشد خلق را از بلای او برهاند و وی را از عذاب خدای.

پسـندیده‌ست بـخشایش ولیکـن    مـنه بـر ریشِ خـلق‌آزار مـرهم
ندانست آن که رحمت کرد بـر مـار    کـه آن ظـلم است بـر فـرزندِ آدم

***

نصیحت از دشمن پذیرفتن خطاست ولیکن شنیدن رواست تا به خلافِ آن کار کنی که عینِ صواب است.

حذر کن زان چه دشمن گـوید آن کـن    کـه بـر زانـو زنـی دستِ تـغابن
گـرت راهـی نـماید راست چـون تـیر    از او بـرگرد و راهِ دستِ چپ گـیر

***

خشمِ بیش از حد گرفتن وحشت آرد و لطفِ بی‌وقت هیبت ببرد؛ نه چندان درشتی کن که از تو سیر گردند و نه چندان نرمی که بر تو دلیر شوند.

درشتی و نرمی به هـم در بِـه است    چو فاصِد که جرّاح و مَرهَم نِه است
درشـتی نگـیرد خـردمند پـیش    نه سستی که نازل کند قدرِ خـویش
نـه مـر خـویشتن را فـزونی نـهد    نـه یک بـاره تـن در مـذلّت دهـد

***

جوانی با پدر گـفت: ای خـردمند    مـرا تـعلیم ده پـیرانـه یک پـند
بگفتا نیک‌مردی کـن نـه چـندان    که گردد خیره گـرگِ تـیز دنـدان

***

(پەند) دوو کەس دوژمنی موڵك‌و ئایینن: پادشای بێ‌حیلم‌و خواپەرستی بێ‌علم.

(هۆنراوە):

لەسەر موڵك نەبێ پادشای فەرماندەر — کە خۆی بۆ خودا نەبێ فەرمان‌بەر

* * *

(پەند) پادشا ئەبێ تا سنووری بە سەر دوژمنا قین لێ‌بخورێ کە دۆستانی دڵنیایی‌یان پێ بمێنێ. ئاگری قین لە پێشا لە خاوەن‌قین بەر ئەبێ، جا یا ئەگاتە دوژمن یا نایگاتێ.

(مەسنەوی):

ناشێ ئادەم‌زاد! کە تۆ لە خاکی — لەسەر ڕاگری توندی بێ‌باکی

تۆ کە ئەوەندە توندو سەرکەشی — وابزانم خاك نیت تۆ لە ئاتەشی[1]

(پارچە):

گەیمە خواپەرستێ لە ناو شاری بیلەکان

پێم وت: بە تەربیەت لە جەهالەت دەبمکە پاك

فەرمووی بە چەشنی خاك تەحەممول کە ئەی فەقێ

یا هەرچێکت خوێندووە بینێرە ژێر خاك

* * *

(پەند) بەدخوو بە دەستی دوژمنی گرفتارە بۆ هەر جێ‌یەك ئەچێ لە چنگی سزای ئەو ڕزگار بوونی نییە.

ئەگەر لە چنگی بەڵا بەدخوو بگاتە سەما

لە چنگی خووی بەدی خۆی ئەمێنێ هەر لە سەما

* * *

(پەند) کە دیت لە سوپای دوژمنا پەرێشانی‌یەك هەیە، تۆ خۆت گرد کەرەوە. کە دیت گرد بووەتەوە تۆ لە پەرێشانی بترسە.

---

(١) کە گەردن کەش‌بوو ئاگر ترسناك — لەشی خۆی داخست بە بێچارە خاك

ئەو سەربەرزیی کرد، ئەم خوی گرت بەکەم — لەو دێو درووست بوو، لەمی تر ئادەم

دو کس دشمنِ مُلک و دینند: پادشاهِ بی‌حلم و زاهدِ بی‌علم.

بر سرِ مُلک مباد آن مَلِکِ فرمانده　　که خدا را نبود بندهٔ فرمان بردار

***

پادشاه باید که تا به حدّی خشم بر دشمنان نراند که دوستان را اعتماد نماند. آتشِ خشم اوّل در خداوندِ خشم افتد، پس آن‌گه زبانه به خصم رسد یا نرسد.

نشاید بنی‌آدمِ خاک‌زاد　　که در سر کند کبر و تندّی و باد

تو را با چنین تندی و سرکشی　　نپندارم از خاکی، از آتشی

***

در خاکِ بیلقان برسیدم به عابدی　　گفتم: مرا به تربیت از جهل پاک کن

گفتا: برو چو خاک تحمّل کن ای فقیه　　یا هرچه خوانده‌ای همه در زیرِ خاک کن

***

بدخوی به دستِ دشمنی گرفتارست که هرجا رود از چنگِ عقوبتِ وی خلاص نیابد.

اگر ز دستِ بلا بر فلک رود بدخوی　　ز دستِ خویِ بدِ خویش در بلا باشد

***

چو بینی که در سپاهِ دشمن تفرقه افتاد تو جمع باش، و اگر جمع شوند از پریشانی اندیشه کن.

| | |
|---|---|
| لە خزمەت دۆستان دانیشە بێ غەم | لە بەینی دوژمنانا دیت ئەگەر جەنگ |
| لەگەڵ یەکتر ئەگەر خۆ یەك زمان بوون | کەمان ژێی تێخە بۆ بن‌بەردو بن‌سەنگ |

* * *

(پەند) دوژمن کە لە هەموو فێڵێ داما، زنجیری دوستایەتی ڕائەوەشێنێ. ئەوسا بە دۆستی ئەو ئیشانە ئەکا کە هیچ دوژمنێ نەی توانیبێ بیکات.

سەری مار بە دەستی دوژمن بکوتەرەوە، لەوە بەدەر نییە کە یەکێك لەو دوو چاکەت دەسگیربێ: ئەم زاڵ بوو مارت کوشتووە، ئەو زاڵ بوو لە دوژمن ڕزگار بوویت. (تاك):

لە ڕۆژی شەڕ مەبە تۆ دڵنیا لە دوژمنی لەڕ

دەسی لە گیانی کە شت مێشکی شێر ئەکا دەر

* * *

(پەند) هەواڵێکی دڵئازاردەرت بیست لێی بێ‌دەنگ‌بە، با یەکێ‌کی‌تر بیگەیەنێ.

| | |
|---|---|
| بولبول تۆ موژدەی بەهار بدە زوو | باسی بەد بدە دەسی کوندەبوو |

(وردی) پادشا لە خەیانەتی کەس ئاگادار مەکە مەگەر بە تەواوی باوەڕت کردبێ، ئەگینا بە فەوتانی خۆت تەقەلا ئەدەی. (مەسنەوی):[1]

| | |
|---|---|
| وتەت بیژە جا وەرە گوفتار | ئەبینی وتەت ئەگیرێ لە کار |
| وتار نیشانەی کەماڵە بۆ پیاو | تۆ خۆت بە وتار بۆچ،ئەکەی بەدناو؟ |
| ئەتەوێ دادەی ئەگەر پەندی کەس | پەندی خۆت دادە ئیتر بۆ تۆ و بەس |

* * *

(پەند) کەسێ بە خۆپەسەندی ئامۆژاری خەڵکی ئەکات [یا ئامۆژگاری خۆ پەسند ئەکات] ئەوە خۆی پێویستی بە ئامۆژگاری دادەرێك هەیە.

* * *

---

(١) دەم بقونجێنە لەلای زۆرداران / تاوان بارمەکە گوروزی هەژاران
چونکە بەم کارە، تۆ یان تاوان کار / ئەبن بە قوربان، زاڵمی زۆردار،-«ك».

برو با دوستان آسوده بنشین      چو بینی در میانِ دشمنان جنگ
وگر بینی که با هم یک‌زبانند      کمان را زه کن و بر باره بر سنگ

***

دشمن چو از همه حیلتی فرو مانَد سلسله‌ی دوستی جنباند وان گه به دوستی کارهایی کند که هیچ دشمن نتواند.

***

سرِ مار به دستِ دشمن بکوب که از اِحْدَی اَلْحُسْنَیَیْن خالی نباشد؛ اگر این غالب آمد مار کُشتی و اگر آن، از دشمن رَستی.

به روزِ معرکه ایمن مشو ز خصمِ ضعیف
که مغزِ شیر برآرد چو دل ز جان برداشت

***

خبری که دانی که دلی بیازارد تو خاموش تا دیگری بیارد.

بلبلا، مژده‌ی بهار بیار      خبرِ بد به بوم بازگذار

***

پادشه را از خیانتِ کسی واقف مگردان مگر آن گه که بر قبولِ کلّی واثق باشی وگرنه در هلاکِ خود همی کوشی.

بسیچِ سخن گفتن آن گاه کن      که دانی در کار گیرد سخن

***

هرکه نصیحت خودرای می‌کند او خود به نصیحت‌گری محتاج است.

***

(پەند) بە دوژمن تەفرە مەخۆو سەرکەشی ستایشگۆ مەکڕە. ئەم داوی ڕزقی ناوەتەوەو ئەو داوێنی تەماعی گرتووەتەوە.[١]

* * *

(پەند) ئەحمەق ستایشی لاخۆشە، وەکوو لاك لە لاقەوە فووی تێ کەی قەڵەو ئەنوێنی.

(پارچە):

وریا! مەگرە گوێ ستایشی کەس    بە کەم سوودێکت ئەو هیواداره

ڕۆژێ مەبەستی نەهێنیتە جێ    دووسەد قات کەمیت ئەکا ژماره

* * *

(پەند) خاوەنی وتار هەتا کەسێ ڕەخنەی لێ نەگرێت وتاری ڕێك و پێك نابێ.

مەبە بایی بە جوانیی گوفتاری خۆت    بە چەپڵەی نادانو ئەفکاری خۆت

* * *

(پەند) هەموو کەس عەقڵی خۆی لا بە کەماڵە، وە منالّی خۆی لا بە جەماڵ.

جوو و موسوڵمانێ کەوتنە مشتو مڕ

کەوتمە پێکەنین لە مشتو مڕیان

موسوڵمان ئەیوت: ئەگەر وا نەبێ

بە جوولەکەیی دەرچم لە جیهان

جوو ئەیوت: سوێندم بە تەورات ئەخۆم

وا نەبی وەك تۆ ببمە موسوڵمان

گەر لە ڕووی زەمین عەقڵ نەمێنێ

کەس بە نەفامی خۆی نابا گومان

* * *

(١) خولّەی دوژمنت، چەشەی خەتەرە    وتەی تاریفکەر تەڵە زەرە
یکێکیان داوی فێڵی داناوە    ئەویان داوێنی تەماحی، داوە
«ئەسرینی ئاڵ».

فریبِ دشمن مخور و غرورِ مدّاح مخر که این دامِ زرق نهاده است و آن دامنِ طمع گشاده. احمق را ستایش خوش آید، چون لاشه که در کعبش دَمی فربه نماید.

اَلا تا نشنوی مـدحِ سـخن‌گوی　　　که اندک مایه نفعی از تـو دارد
که گر روزی مـرادش بـرنیاری　　　دو صد چندان عیوبت بـرشمارد

***

متکلّم را تا کسی عیب نگیرد سخنش صلاح نپذیرد.

مشو غرّه بر حُسنِ گـفتارِ خـویش　　　به تحسینِ نادان و پـندارِ خـویش

همه کس را عقلِ خود به کمال نماید و فرزندِ خود به جمال.

یکـی جـهود و مسـلمان مـناظرت کـردند
چنان که خـنده گـرفت از حـدیثِ ایشـانم
به طَیره گفت مسلمان گر این قـباله‌ی مـن
درست نـیست، خـدایـا، جـهود مـیرانـم
جهود گفت: بـه تـورات مـی‌خورم سـوگند
وگـر خـلاف کـنم هـم‌چو تـو مسـلمانم
گـر از بسـیطِ زمـین عـقل مـنعدم گـردد
به خود گـمان نـبرد هـیچ‌کس کـه نـادانـم

***

(پەند) دە ئادەمیزاد لەسەرخوانێك ئەخۆن، دوو سەگ لەسەر لاکێ پێك نایەن. چاوچنۆك بە جیهانێ برسی‌یەو [قانیع] بە نانێ تێر ئەبێ. دانشمەندان وتوویانە دەروێشی بە قەناعەت باشترە لە دەوڵەمەندی بە سامان. (تاك):

بە نانێ پڕ ئەبێ نانی بچووکێ پڕی ناکا جیهانێ چاوچنۆکێ

(مەسنەوی):

کە باوکم دەوری عومری خۆی بەسەر برد

منی بەم جۆرە ئامۆژگارییەك کرد

کە شەهوەت ئاگرە خۆت بگرە لێی دوور

لەسەر خۆت ئاگری دۆزەخ مەکە سوور

لە ناو ئەو ئاگرە نیتە تەوانا

دە ئیمڕۆ ئاوی پیاکە مەردی دانا

* * *

(پەند) هەرکەس لە حاڵی توانایی‌یا چاکە نەکات، لە کاتی نەتوانی‌یا سەختی ئەبینێ. (تاك):

بەدبەختتر کوا لە مەردوم ئازار کەس ڕۆژی بەڵا بۆی نابێ بە یار

* * *

(پەند) ئەوەی زوو بێت زۆر نامێنێتەوە. (پارچە):

بیستوومە کەواله ڕۆژهەلاتا

بە چل ساڵ ئەیکەن یەك کاسەی چینی

لە «مەردەشت» ئەکەن سەدی بە ڕۆژێ

بۆیە قیمەتی وایە ئەبینی[1]

(پارچە):

(١) لە نوسخەیەکدا نووسراوە: نزیك شیراز دێزە دروست ئەکەن.

ده آدمی بر سفره‌ای بخورند و دو سگ بر مُرداری به هم به سر نبرند. حریص با جهانی گرسنه است و قانع به نانی سیر. حکما گفته‌اند: توانگری به قناعت بِه از توانگری به بضاعت.

رودهٔ تنگ به یک نانِ تهی پر گردد    نعمتِ روی زمین پُر نکند دیدهٔ تنگ

***

پدر چون دورِ عمرش منقضی گشت    مرا این یک نصیحت کرد و بگذشت
که شهوت آتش است از وی بپرهیز    به خود بر، آتشِ دوزخ مکن تیز
در آن آتش نداری طاقتِ سوز    به صبر آبی بر این آتش زن امروز

***

هرکه در حالِ توانایی نکویی نکند در وقتِ ناتوانی سختی بیند.

بداختر تر از مردم‌آزار نیست    که روزِ مصیبت کسش یار نیست

***

هرچه زود برآید دیر نپاید.

خاکِ مشرق شنیده‌ام که کنند    به چهل سال کاسه‌ای چینی
صد به روزی کنند در مَردَشت    لاجرم قیمتش همی بینی

***

لە هێلکە جوجەڵە دەرچوو کتووپڕ ڕزقی پێویستە

سەیرکە ئادەمی ئاگای لە عەقڵو هۆشی خۆی نابێ

لە ناکاو پێگەیی هەرکەس بزانە تۆ بە هیچ ناگات

بە فەزڵو هیممەت پەیدا ئەکات هەرچی لە دنیا بێ

لە هەرجێ ئاوێنە هەیە بۆیە بێ قەدر نەنوێنێ

لەعل چونکە بە زەحمەت دێتە دەس ئازیزە تامابێ

* * *

(پەند) ئیش‌وکار بە پشوویەك پێك دێت‌و بە پەلە ئەچێتە سەر.

بە چاو دیم یەکێ کە لە بیابان

ئاهێستە پێش کەوت کە لە خۆش‌ڕەوان

زۆر ئەسپی ڕەسەن لە غار پەکی کەوت

حوشترەوانان هێواش ئەیان ڕان

* * *

(پەند) بۆ نادان هیچ شتێ لە بێ‌دەنگی چاکتر نییە. بەڵام ئەگەر ئەوەی بزانی‌یایە نادان نە ئەبوو. (پارچە):

فەزڵو کەماڵت نییە وا چاکە زمان لە دەمتا بکەی ئاگادار

زمانە ئینسان کە ڕسوا ئەکا گوێزی پووت سووکە لە دەست‌و لە بار

(چەند شیعرێ):

شێتێ ئەی ئاخاوت کەرێ هەمیشە کۆششی ئەکرد لێی بووبووە پیشە[1]

عاقڵێ پێی‌وت: نادانی نابووت بترسی چاکە لە لۆمەو تانووت

وتار فێر ئەبێ لە تۆ گیانلەبەر؟ بێدەنگی فێربە لێوەی، نەبی کەر[2]

(شیعر):

---

(١) ئاخاوت: فێری ئەکرد.

(٢) ئەشتوانین بڵێین:

کەر حاڵی نابێ مانای وتوو وێژ تۆ فێربە واتەی بێ‌دەنگی گوێدرێژ،-«ك».

مرغک از بیضه برون آید و روزی طلبد

و آدمی‌زاده ندارد خبر و عقل و تمیز

آن که ناگاه کسی گشت، به چیزی نرسید

وین به تمکین و فضیلت بگذشت از همه چیز

آبگینه همه جا یابی، ازان بی‌محل است

لعل دشخوار به دست آید، ازان است عزیز

***

کارها به صبر برآید و مُستعجِل به سر درآید.

به چشمِ خویش دیدم در بیابان     که آهسته سَبَق بُرد از شتابان

سمندِ بادپای از تگ فروماند     شتربان همچنان آهسته می‌راند

***

نادان را بِهْ از خاموشی نیست و اگر این مصلحت بدانستی نادان نبودی.

چون نداری کمال و فضل آن بِهْ     که زبان در دهان نگه داری

آدمی را زبان فضیحه کند     جوزِ بی‌مغز را سبک‌ساری

***

خری را ابلهی تعلیم می‌داد     بر او بر، صرف کرده سعیِ دایم

حکیمی گفتتش: ای نادان، چه کوشی؟     در این سودا بترس از لَومِ لایم

نیاموزد بهایم از تو گفتار     تو خاموشی بیاموز از بهایم

***

ورد نــــەبێتـــــەوە هـــــەرکەس لە وەڵام　　زووتـــــر وتـــــاری نـــــاگـــــاتە ئـــەنجام

وتارت جـوان کـە وەك پیاوی بـە هـۆش　　یـــا وەك بـــێزمـــان دانـیشە خـامۆش

* * *

(پەند) هەرکەسێ لەگەڵ لە خۆی داناتر بەربەرەکانێی کرد بۆ ئەوەی وابزانن کە دانایە، بزانن کە نادانە. (تاك):

لە خــۆت دانــاتر کـە هـاتە وتـار　　با قەی[1] بزانیی لێ مەخەرە کـار

* * *

(پەند) هەرکەس لەگەڵ بەدان دانیشێ چاکی نابینێ. (چەند شیعرێ):

گــەر لەگــەڵ دێوا فـریشتە دانیشت　　فێر ئەبێ فیڵو خـەیانەت وەحشـەت

فـێرنـابی بـەدی مـەگـەر لە بـەدان　　گورگ پێست دروون ناکاتە سەنعەت

(پارچە):

کـەم هـەمنشینی بـەدبەو هـاوڕێی بـەد　　زۆرپـاك بـیت پیست ئـەکـا بـراگـیان

سـەرچاوە ڕۆژی روون کـە ڕووناکـە　　تۆزێ هەور دێت چۆن ئـەیکا پـەنهان

* * *

(پەند) عەیبو کەمی نیهان پەیدا مەکە بۆ کەسان، هەتا ئەوان ڕیسوا نەکەیتو خۆت بێپشتیوان.

* * *

(پەند) هەرکەسێ فێری زانیاری بوو، وە ئیشی پێنەکرد وەکو ئەوەیە جووت بـە گـا بکاو توو دانەچێنێ.

لە لەشی بێدڵەوە خواپەرستی پێك نایەتو پێستی بێناوك بۆ ماڵی تیجارەت ناشێ.

نەوەکو هەرکەسێ لە بەربەرەکانێدا چوستە، لە مامەڵەدا دروستە.

زۆر بـاڵا جـوانـە لە ژێر چـارشێوا　　کــە ئـەیکەیتەوە دایکـی دایکـە وا

* * *

---

(١) قەی: اعتراض، «ع.م».

هرکه با داناتر از خود جدل کند تا بدانند که داناست بدانند که نادان است.

چون درآید مه از تویی به سخن　　گر چه بِهْ دانی، اعتراض مکن

***

هرکه با بدان نشیند نیکی نبیند.

گر نشیند فرشته‌ای با دیو　　وحشت آموزد و خیانت و ریو

از بدان جز بدی نیاموزی　　نکند گرگ پوستین‌دوزی

***

مردمان را عیبِ نهانی پیدا مکن که مر ایشان را رسوا کنی و خود را بی‌اعتماد.

***

هرکه علم خواند و عمل نکرد بدان مانَد که گاو رانَد و تخم نیفشانَد.

***

از تن بی‌دل طاعت نیاید و پوست بی‌مغز بضاعت را نشاید

***

نه هرکه در مجادله چُست، در معامله دُرُست.

بس قامتِ خوش که زیرِ چادَر باشد　　چون باز کنی مادرِ مادر باشد

***

(پەند) ئەگەر هەموو شەوێ شەوی قەدر بوایە، شەوی قەدر بێ‌قەدر ئەبوو.

هەموو بەرد لەعلی بەدەخشان بوایە ئەبوو قیمەتیان جا یەکسان بوایە

* * *

(پەند) نەوەك هەرکەسێ بە نیگار جوانو شیرینە، بە ڕەوشت دروستو ڕەنگینە. ئێش لە ناو دەروونە نەوەك لە پێستایە. (پارچە):

بە ڕۆژێ ڕەنگە بناسی ڕەوشتو شێوەی پیاو

هەتا چ پایەیێ توانیویە فێر ببێ لە عولووم

بەڵام نیهانی نیهانە ئەمین مەبەو سەرکەش

کە پیسیی نەفسی بە چەند ساڵێ نابێ بۆت مەعلووم

* * *

(پەند) هەرکەسێ چوو بەگژ گەورانا خوێنی خۆی ئەڕێژێ. (پارچە):

تۆ کە خۆت وەها گەورە ئەزانی ڕاستە یەك بە دوو ئەبینێ کە خێڵ

ناوچاوانت زوو ئەبینی ئەشکێ سەر لە دیوار دەی وەکوو پیاوی گێل

* * *

(پەند) لەگەڵ شێرا پەنجە لێدانو دەست بە شمشیرا کێشان ئیشی عاقڵان نییە. (هۆنراوە):

زۆرئاوەریو شەڕ مەکە لەگەڵ مەست پەنجە لە باخەڵ بنێی نەوەك دەست[١]

* * *

(پەند) بێ‌هێز لەگەڵ بەهێزا دلاوەری بکا، دوژمن دۆستێکە لە فەوتانی خۆیا. (پارچە):

سایە پەروەر لە کوێی هەیە توانا بێ هەمتا لە هاتو چۆیی جەنگا

سست بازوو نەزانە پەنجە بدا کە لەگەڵ مەردی ئاسنین چەنگا

* * *

(١) فارسییەکە: «پیش سرپنجه در بغل نِه دست» واتە: لەگەڵ زۆردار و بەهێزا شەڕ مەکە. سرپنجە: زۆردار ـع.

اگر شب‌ها همه قدر بودی شبِ قدر بی‌قدر بودی.

گر سنگ همه لعلِ بدخشان بودی    پس قیمتِ لعل و سنگ یکسان بودی

***

نه هرچه به صورت نکوست سیرتِ زیبا در اوست؛ کار اندرون دارد نه پوست.

توان شناخت به یک روز در شمایلِ مرد
که تا کجاش رسیده‌ست پایگاهِ علوم
ولی ز باطنش ایمن مباش و غرّه مشو
که خبثِ نفس نگردد به سال‌ها معلوم

***

هرکه با بزرگان ستیزد خونِ خود ریزد.

خویشتن را بزرگ پنداری    راست گفتند: یکْ دو بیند لوچ
زود بینی شکسته، پیشانی    تو که بازی کنی به سر با غوچ

***

پنجه با شیر انداختن و مشت با شمشیر زدن کارِ خردمندان نیست.

جنگ و زورآوری مکن با مست    پیشِ سرپنجه در بغل نِهْ دست

***

ضعیفی که با قوی دلاوری کند یارِ دشمن است در هلاکِ خویش.

سایه‌پرورده را چه طاقتِ آن    که رود با مبارزان به قتال
سست‌بازو به جهل می‌فگند    پنجه با مردِ آهنین چنگال

***

(پەند) هەرکسێ ئامۆژگاری لەگوێ نەگرێت هەوای بیستنی تانوتی هەیە. (تاك):

پەند لەگوێ نەگری تۆ کە بەم ڕەنگە　　لەکاتی تانووت چارە بێ‌دەنگە

* * *

(پەند) بێ‌عەقڵان توانای بینینی عاقڵانیان نییە، هەروەکو سەگی کۆڵانی بۆ سەگی ڕاوی. خەریکی بە ئیشەوە ئەکەن بە بیانوو ناچنە پێشەوە. یانی کاتێ سپڵە بە هونەر دەرەقەتی کەسێ نەهات، بە پیسی ئەچێتە پێستی‌یەوە خراپی ئەڵێ. (تاك):

غەیبەت دەر ئەخا حەسوودی دەس کوڵ　　زمانی وتەی کە لە ڕوو بوو کوڵ

(پەند) ئەگەر ستەمی سك نەبوایە هیچ باڵندەیەك نەئەکەوتە داوی ڕاوچی، وە ڕاوچیش داوی دانەئەنا. (تاك):

سکە زنجیری بەند بۆ قاچو دەست　　نایاب بەندی سك ئەبێ خواپەرست

هەر شین پۆشێ سۆفی نییەو هەر سۆفی‌یەك سافی نییە. لە هەموو پێستێکا دۆست نییە. (تاك):

مەزانە دیوی پەنهانیش وەکوو دیوی دەرێ وایە

گەلێ حەڵوایی سابوونی هەیە زەهری لەناوایە

* * *

(پەند) دانشمەندان درەنگ درەنگ ئەخۆن‌و خواپەرستان نیوە تێر، وە زاهیدان مەمرەو مەژی، سەدی ڕەمەق، گەنجان تا بگرێ تەبەق‌و، پیران هەتا ئەکەن عەرەق. بەڵام ڕەندان ئەوەندە ئەخۆن هەتا ڕێگەی هەناسەیان نەمێنێ، وە لەسەر خوان مووچە بۆ کەس. (هۆنراوە):

دیلی سك دوو شەو بێ‌خەوە ڕەنگە　　شەوێ مەعدە قوورس شەوێ دڵ تەنگە

* * *

(پەند) ڕاوێژ لەگەڵ ژنا بەربادەو، بەخشایش لەگەڵ خاوەن فەسادا گوناهە. (تاك):

[ڕەحمەت بە پڵنگ کە تیژە دانی　　ستەمە بۆ مەڕ ئەگەر بیزانی]

بی‌هنران هنرمند را نتوانند که بینند، هم‌چنان سگانِ بازاری سگِ صید را مشغله برآرند و پیش آمدن نیارند، یعنی سفله چون به هنر با کسی برنیاید به خبثش در پوستین افتد.

**کند هر آینه غیبت حسودِ کوته دست　　که در مقابله گنگش بوَد زبانِ مقال**

***

گر جورِ شکم نیستی هیچ مرغ در دامِ صیّاد نیفتادی بلکه صیّاد خود دام ننهادی. حکیمان دیر دیر خورند و عابدان نیم‌سیر و زاهدان سدِّ رمق و جوانان تا طبق برگیرند و پیران تا عرق بکنند امّا قلندریان چندان بخورند که در معده جای نفس نماند و بر سفره‌ی روزی کس.

**اسیرِ بندِ شکم را دو شب نگیرد خواب:**
**شبی ز معده‌ی سنگی، شبی ز دل‌تنگی**

***

مشورت با زنان تباه است و سخاوت با مفسدان گناه.

**ترحّم بر پلنگِ تیزدندان　　ستمگاری بوَد بر گوسفندان**

***

ئەگەر پیسێ بکەی پەروەردە بیلاوێنی وەك چاکان

بە ماڵو دەوڵەتی تۆوە ئەکا بێ‌دینی بێ‌پایان[١]

* * *

(پەند) هەرکەسێ دوژمن لەبەردەسیایەتی‌و نایکوژێ ئەوە دوژمنی خۆیەتی. (تاك):

بەرد لە دەستا بێ‌و لەسەر بەرد بێ مار     سستییە دوای خەی بیر بخیتە کار[٢]

دەستەیەك پێچەوانەی ئەمەیان بە ڕێك دیوە، وتوویانە لە کوشتنی بەندی‌یانا وردبوونەوە چاترە لەبەر ئەوە کە دەسەڵات لە دەستی خۆتایە، ئەتوانی بیکوژی‌و ئەتوانی نەیکوژی. ئەگەر بێ‌ورد بوونەوە بکوژرێت ڕەنگە کارێکی لە دەست بچێ، وە بەجێ‌هێنانەوەی شتی‌وا نایەتەوە. (مەسنەوی):

چاك‌و ئاسانە زیندوو کەی بێ‌گیان     کوشتوو ناتوانی زیندووکەیتەوە

خۆ مەرجی عەقڵە هێواش تیر باوی     لە کەوان دەرچوو ناگەڕێتەوە

* * *

(پەند) دانشمەندێ لەتەك نەفاما هەرای کرد ئەبێ بەتەمای عیززەت‌و حورمەت نەبێ. نەفام بێتە زبان بەسەر دانشمەندێکا زاڵ ئەبێ ئەوە هیچ سەیر نییە چونکە بەرد گەوهەر ئەشکێنێ. (تاك):

سەیر نییە ئەگەر بۆی نەدرێ نەفەس     بولبول لەتەك قەل بکرێ هاو قەفەس

(پارچە):

هونەرمەند کە دی لە خوێڕی جەفا     هەتا تێك نەچێ دڵ پڕ لە ئازار

بەردی بەد کاسەی زێڕین ئەشکێنێ     نرخی زیاد نابێ‌و زەڕ کەم پێی زار

* * *

(١) ئەم بەیتە لەمەوبەر وتراوە.

(٢) دوژمنێکی وا ماتڵی هەلە     دەرفەتی نەدەی قازانجی گەلە

سەری مار لە سەر بەردو دەس بە بەرد     دەرفەت پێدانی هۆی ئازارەو دەرد

«ئەسرینی ئاڵ».

هرکه را دشمن پیش است اگر نکُشد دشمنِ خویش است.

سنگ بر دست و مار سر بر سنگ          خیره‌رایی بوَد قیاس و درنگ

***

و گروهی به خلافِ این مصلحت دیده‌اند و گفته‌اند که در کشتنِ بندیان تأمّل اولی‌ترست به حکمِ آن که اختیار باقی است توان کُشت و توان بخشید امّا اگر بی‌تأمّل کشته شود محتمل است که مصلحتی فوت شود که تدارکِ مثلِ آن ممتنع باشد.

نیک سهل است زنده بی‌جان کرد          کُشته را باز زنده نتوان کرد

شرطِ عقل است صبرِ تیرانداز          که چو رفت از کمان، نیاید باز

***

حکیمی که با جُهّال در افتد باید که توقّعِ عزّت ندارد و اگر جاهلی به زبان‌آوری بر حکیمی غالب آید عجب نیست که سنگی است که گوهری همی شکند.

نه عجب گر فرو رود نَفَسش          عندلیبی غراب هم‌قفسش

***

گر هنرمندی از اوباش جفایی بیند

تا دلِ خویش نیازارد و درهم نشود

سنگِ بد گوهر اگر کاسه‌ی زرّین بشکست

قیمتِ سنگ نیفزاید و زر کم نشود

***

(پەند) دانشمەند ئەگەر لەناو هەرزەدا وتاری بەست سەرسام مەبە، چونکە ئاوازی بوربوت لەگەڵ دەنگی دەهۆڵ پێك نایەت، وە بۆنی عەبیر لە بۆگەنستانا پەکی ئەکەوێت (مەسنەوی):

گەردەنی قوت کرد دەنگ زلی نادان    کە بەبێ شەرمی دانای دانەوان
نازانێ کەوا سۆزی حیجازی    خۆ دوائەکەوێت لە تەپڵی غازی[1][2]

* * *

(پەند) گەوهەر ئەگەر بشکەوێتە ئاودەسخانەوە هەروا بەنرخە.تۆز ئەگەر بشگاتە ئاسمان هەروا سووكو بێنرخە. پەروەردە نەکردنی لێهاتوو جێگەی داخە وە پەروەردە کردنی لێنەهاتوو فەوتاوە. خۆڵەمێش بە شتێکی بەرزەوە پەیوەندی هەیە چونکە ئاگر جەوهەری باڵایە بەڵام خۆی چونکە هونەرێکی تیانییە لەگەڵ خاکا یەکسانەو نرخی شەکر لەبەر ئەوە نییە لە قامیشە، بەڵکە تایبەتی هی خۆیەتی[3]. سەگێ کاروانێ لێئەخورێتو گورگێك ئەرەوێنێ.

پیاوێ لە هونەر کە بوو بەهرەوەر    هونەر خۆی ئەیڵێت نەوەك هونەروەر

(مەسنەوی):

سروشتی بێهونەر بوو خۆ کەنعان    پەیامبەر زادەیی نەیکرد بە سەروەر
هونەر بنوێنە نەك گەوهەر براگیان    کە گوڵ هی دڕکە ئیبراهیم لە ئازەر

* * *

(پەند) میسك ئەوەیە کە خۆی بۆنی بێت، نەوەك عەتار بیڵێت. زانا وەکوو قوتووی عەتار بێدەنگەو هونەر دەرخەر. نەزان وەك تەپڵی غازی وایە دەنگی بەرزو ناو بەتاڵ. (پارچە):

---

(١) مەبەست دەهۆڵی شەڕە.
(٢) گۆرانی کوردیو نەزمو ئاهەنگی بێ دەنگە لەلای کەڕەنای جنگی،-«ك».
(٣) شەکەر ئەگەرچی کوڕی قامیشە چونکە شیرینە، بابە قامیشە بەڵێ خۆڵەمێش نەتەوەی گڕە خۆی بێ هونەرە خاکێکی سڕە «ئەسرین ئاڵ».

